وليام باينەم

# مێژووی پزیشکی

## پێشەکییەکی زۆر کورت



لە ئینگلیزییەوە: غازی محەمەد

59

زنجیرە کتێبی

ئۆکسفۆرد

سەرچاوەکانی ئەم وەرگێڕانە:
THE HISTORY OF MEDICINE
A Very Short Introduction
By: William Bynum
OXFORD UNIVERSITY PRESS
2008




بڵاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیریی
جەمال عیرفان ٢٠٢٢

زنجیرە: (١٣٣)

بەڕێوەبەری دەزگا:
سیروان حەمەسەعید حەمەخورشید

Tel: 0533202936 07701549509
email: jamalerfan99@gmail.com
jamal erfan cultural foundation
www. jamalerfan.com

ناونیشان: سلێمانی، شەقامی سالم، بەرامبەر ماکسی مۆڵ

# مێژووی پزیشکی

## پێشەکییەکی زۆر کورت

ولیام باینەم

لە ئینگلیزییەوە: غازی محەمەد

زنجیرە کتێبی ئۆکسفۆرد

٥٩



# مێژووی پزیشکی


نووسەر: ولیام باینەم

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: غازی محەمەد

دیزاینی ناوەوە: ئومێد محەمەد

دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم: ٢٠٢٢

تیراژ: ٥٠٠ دانە

نرخ: ٥٠٠٠ دینار

چاپ: چاپخانەی تاران

# پێڕست

## پرۆژەی وەرگێڕانی زنجیرە کتێبەکانی زانکۆی ئۆکسفۆرد

زیاتر لە ٢٥ ساڵ بەر لە ئێستا، ساڵی ١٩٩٥، زانکۆی ئۆکسفۆرد، کە دامەزراوەیەکی دیاری دنیای ئەکادیمی و جیهانە بە گشتی، دەستی بە پرۆژەیەکی گرنگ کرد. پرۆژەکە پێکهاتووە لە زنجیرە کتێبێکی کورت و پوخت و زانستی لە تەواوی بوارە جیاوازەکاندا: لە پرسی تیرۆرەوە بۆ کەشوهەوا، ئابووری کۆن و نوێ و پرسی جیهانگیری. لە فەلسەفەی پێش سوکراتەوە بۆ مۆدێرن و پۆستمۆدێرن. لە مێژووی کاتەوە بۆ مێژووی جیهان، لە فیزیکی کۆنەوە بۆ کوانتەم و دنیای دیجیتاڵ و ئایندەی مرۆڤ. لە بوونناسیەوە بۆ ئاییناسی و مێژووی ئایینەکان و پرسی ئیسلام و ئەندازیاری و ماتماتیک. لە ئەفسانەناسییەوە بۆ ئەدەبناسی و تیۆر و ڕەخنەی ئەدەبی... پرۆژەکە خۆی بە یەک بوارەوە نەبەستۆتەوە، بەڵکو دەستی بۆ تەواوی بوارە جیاوازەکان بردووە، ئەمەش لە بێ پلانی و هەڕەمەکییەوە نییە، چونکە بێ پلانی لە زانکۆیەکی پلانسازی وەک ئۆکسفۆرد ناوەشێتەوە.

سروشتی ئەم زنجیرە کتێبانە، بریتییە لە زانستیبوون، کورتی و پوختی و چڕی و ئێستاییبوون، کە هەموو کتێبەکان لەلایەن کەسانی پسپۆر و شارەزای بوارەکان لەسەر ئاستی جیهان نووسراون. خوێنەر کاتێک بەر هەر بەرهەمێک لەم پرۆژەیە دەکەوێت، دەزانێت چەند هارمۆنی و سادەقووڵ نووسراون. خاڵێکی درەوشاوەتر، بریتییە لە خوێندنەوە و شیکاری ڕووداوەکانی هەنوکە، واتە کتێبەکان تەنیا هۆنینەوەی چیرۆکی ڕابردوو نین، بەڵکو شیکاری دۆخی ئێستای جیهان و مرۆڤ دەکەن.

ئۆکسفۆرد لە ١٩٩٥ تا ٢٠١٨ زیاتر لە ٦٠٠ کتێبی لەم زنجیرەیە بڵاوکردۆتەوە؛ سەرەتای هەر مانگێک کتێبێکی نوێیان بڵاوکردۆتەوە. بەهۆی بایەخی نەبڕاوەی پرۆژەکەوە، زنجیرە کتێبەکان بۆ زیاتر لە ٢٥ زمانی دنیا وەرگێڕاون، وا ئێستا زمانی کوردیش دەیەوێت ببێتە یەکێک لەو زمانانەی ئەم پرۆژەیە لە ئامێز دەگرێت. دەستبردن بۆ وەرگێڕان و لە ئەستۆگرتنی ئەم کارە، بەرپرسیارێتییەکی مێژوویی و ئەکادیمی گرنگە، کە دەزگای جەمال عیرفان بە سپۆنسەری (د. تەها ڕەسوڵ) ئەنجامی دەدەن. وابڕیارە هەر سێ مانگ جارێک ١٠ بۆ ١٥ کتێب لە زمانی یەکەمەوە لە ڕێگەی وەرگێڕی شارەزاوە بڵاوبکاتەوە. ئەمە پرۆژەیە و پرۆژەش بە دڵنیاییەوە قۆناخێکی مێژوویی لە بزاڤی ڕۆشنبیری و کتێبخانەی کوردیدا بۆ خۆی دروستدەکات، بەهیواین ببێتە داینەمۆی دروستکردنی نەوەیەکی نوێی بەرپرسیار و هۆشیار.

**سەرپەرشتیاری پرۆژە**
**هەرێم عوسمان**

## پێشەکی: جۆرەکانی پزیشکی

ئەمە کتێبێکی بچووکە سەبارەت بە بابەتێکی زۆر گەورە، سەرەتا هەوڵمدا لەو سەردەمەوە دەستپێبکەم، کە گریکەکان بناغەی نەریتە پزیشکییە ڕۆژئاواییەکانیان دامەزراندووە. لەو پێودانگەوە ویستم چوارچێوەیەکی گشتی بۆ تێگەیشتن لە مێژووی پزیشکی دابڕێژم. بۆ ئەو مەبەستەش بەپێی ئەم خشتەیەی خوارەوە جۆرەکانی پزیشکیم پۆلێن کردووە، کە خۆی لە پێنج بەشدا دەبینێتەوە، بە تێرو تەسەلی باسی هەریەکەیان بەجیا دەکەم.

پێنج جۆرەکەی پزیشکی کە لەخشتەی ١ دا هاتووە بەم شێوەیەیە: پزیشکیی سەرجێگە، پزیشکیی کتێبخانە، پزیشکیی نەخۆشخانە، پزیشکیی کۆمەڵگە، و پزیشکیی تاقیگە- لێرەدا ئامانجە پزیشکییەکان، هەروەها شوێنی کارکردنی ئەو پزیشکانە دەستنیشانکراوە. هەرچەندە دەرکەوتنی ئەمجۆرە پزیشکییانە بەشێوەی نووسراو، گێڕانەوەی زەمەنییە لە قۆناغە جیاوازەکاندا، بەڵام ئەمجۆرە پزیشکییانە، بەشێوازی ئەزموون و زانیاری کەڵەکەبوو گەشەیان کردووە. **پزیشکیی کلینیکی** یان دیدەنگەی پزیشکی لەسەر جێگا، کە لە هیپۆکراتەوە دەستی پێکردووە، تا ئێستاش شوێنەواری لە چاودێریی پزیشکیی سەرەتایی سەردەمدا هەرماوە، **کتێبخانەی پزیشکی** لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە تا ئێستاش پەیوەندیی پتەوی بە تەقینەوەی ئەو زانیارییانەوە هەیە، کە جیهانی پزیشکیی سەردەمی ئێمەی پێ دەناسرێتەوە (نەک جیهانی پزیشکی بە مانا سادەکەی). لە سەدەی نۆزدەیەمدا **پزیشکیی نەخۆشخانەکان**

بەجۆرێک لە جۆرەکان لەسەر جیگای نەخۆش خۆی نمایش دەکرد، لە ڕێگەی ئامرازەکانی دەستنیشان کردنی نەخۆشی و چارەسەری نوێ و شارەزایی پزیشکییەوە، ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی نەخۆشی دەکرد؛ وەکو ئەوەی لە نەخۆشخانەکانی سەردەمدا بەدیی دەکەین. بەڵام **ژێرخانی پزیشکی لە کۆمەڵگەدا**، ژینگەی ئاوی سازگار، پرۆسەی فڕێدانی خاشاک، پرۆگرامی کوتان بە ڤاکسینەکان، پێوەرەکانی تەندروستی و سەلامەتی پیشەییە لەو شوێنەی کاری تێدا دەکرێت، هاوشانی شیکردنەوەی جۆری نەخۆشییەکان و پەیوەندی ئەو نەخۆشییانە بە سیستەمی خۆراکەوە یان پەیوەندی بە نەریتەوە یان بە بەرکەوتەی فاکتەرە ژینگەییەکانەوە. **پزیشکیی تاقیگەش** ڕەنگە بەرچڤەی زمانحاڵی وێنەی ئەو دەرمانانە بێت کە بەکاریان دێنین، تێگەیشتنە لە میکانیزمەکانی جەستە بەشێوەیەکی وردتر، هەروەها یارمەتی دۆزینەوە و ئاشکراکردنی نەخۆشییەکان دەدات، هەرچۆن ڕۆڵی لەدۆزینەوەی چارەسەری نەخۆشییەکانیشدا هەیە.

| | | تایبەتمەندییەکان | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| | | بابەتی لێکۆڵینەوە | فۆرم و شوێنی لێکۆڵینەوەکە | ئامانج | نموونە |
| جۆرەکان | پزیشکی سەرجێگە | تەواوی نەخۆش | ڕاهێنانی پیشەیی | چارەسەرکردن | هیپۆکرات (٤٦٠- ٣٧٠ پ.ز) |
| | پزیشکی کتێبخانە | دەق | خوێندنی زانستی، زمانەوانیی زانکۆیی | خۆپاراستن، چاکبوونەوە، ڕوونکردنەوە | کۆنستاتینی ئەفەریقی (پێش ١٠٩٨ مردووە) |
| | پزیشکی نەخۆشخانە | نەخۆش و ئەندامی جەستە | نەخۆشخانە | دەستنیشانکردن | ر. تی. ئێچ لاینک (١٧٨١ – ١٨٢٦) |
| | پزیشکی کۆمەڵگە | دانیشتوان و ئامار | کۆمەڵگە | خۆپاراستن | جۆن سیمۆن (١٨١٦- ١٩٠٤) |
| | پزیشکی تاقیگەکان | نموونەی گیانەوەران | تاقیگە | تێگەیشتن | کلۆد بێرنارد (١٨١٣- ١٨٧٨) |

**شێوەی ١: جۆرەکانی پزیشکی: هێڵکارییەکی نموونەیی 'جۆرە جیاوازەکانی' پزیشکی ڕووندەکاتەوە، یەکە جیاوازە شیکارییەکان و شوێنی کارو ئەو ئامانجانە دەخاتە ڕوو کە پزیشکەکان لەو چوارچێوانەدا کاردەکەن. هەر پێنج بەشەکەی سەرەتا، جۆرەکانی پزیشکی لە چوارچێوەیەکی مێژووییدا بۆهەر یەکەیان دەگرێتەخۆی.**

کاتێک بیر لە مێژووی پزیشکی دەکرێتەوە، هێشتا دەروازە مێژووییەکان کاریگەرییان لەسەر نەوەکانی ئەمڕۆ ماوەو لە گوێیاندا دەزرنگێتەوە، تەنانەت ئەوانەی باج دەدەن، ئەوانەی لە چاودێری تەندروستی کەڵک وەردەگرن، تا دەگاتە ئەوانەی لە ستراتیژەکانی تەندروستی گشتی سوودمەندن.

ئەو "جۆر"ە پزیشکییانە دەمانبەنەوە سەر ئامانجە سەرەکییە گشتییەکان کە ئەویش بودجەی تەندروستی هاوچەرخە، لەگەڵ ناسنامەی گروپە بەرژەوەندیخوازەکان، بە تایبەتی لەسەر گۆڕەپانی ئەمەریکا؛ کاتێک خاوەنی بەرژەوەندییە تایبەتەکان کاریگەرییان لەسەر تەواوی جومگەکانی کەرتی تەندروستی هەیە وەکو- چاودێری تەندروستی، خزمەتگوزاریی نەخۆشخانەکان، تەندروستی گشتی، توێژینەوەی بایۆپزیشکی، و بنیادنانی زانیاری و دابینکردنی زانیاری: لەم نێوەدا ڕۆڵی وەزیری تەندروستی زۆر سنووردارە، بەڵام کێشەکە لەوەدایە ئەم توێژە هەڵتۆقیوانە لەنێوخۆیاندا کێبڕکێی یەکتری دەکەن، لەبەرئەوە بودجەی تەندروستی هەمیشە سنووردارە و لە کورتی دەدا، هەرچەندە خەرجی توێژینەوە زانستییەکان زیاد بکرێت، ئەوا خەرجی فەرمانبەرانی نەخۆشخانەکان و تەندروستی گشتی کەمدەکات و بە پێچەوانەشەوە ڕاستە.

ئەم توێژانە بەدرێژایی مێژوو ئاوێتەی یەکتری بوون. گریک و ڕۆمانەکان  بە شێوازی خۆیان داهێنانیان کرد لە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ کێشەکانی پەیوەست بە تەندروستییەوە، هەوڵیان دا لە ناو کۆمەڵدا خۆیان لە نەخۆشییەکان بپارێزن، دامەزراوەی سادەیان دامەزراند بۆ چاودێری کردنی سەربازو کۆیلەکان، پێویستیان بەشوێن بوو بۆ کۆکردنەوەی دەقە پزیشکییەکان، هەوڵیاندا لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەوە خزمەت بە مەعریفەی پزیشکی بکەن، لەسەر

جێگاکانیـــان چـــاودێری نەخۆشـــیان دەکـــرد. بەڵام جـــۆرە نوێیەکانی پزیشکیی نەخۆشـخانەکان و پزیشکیی کۆمەڵگەو پزیشـــکیی تاقیگەکـــان، بەم شـــێوەیەی ئێســـتای لەســـەدەی بیســـتەوە ســـەری هەڵـــداوە، کە بە ســـەردەمی "نـــوێگەری" ناســراوە. لە بەشــی کۆتاییشــدا، شــێوازی پـۆلێن کـردن بـۆ دارشـــتنی گێـڕانەوەی کـــورت بـــۆ گەشـــەکردنە مەزنەکـــان لەســەدەی بیســت و بیســتویەکدا بەکارهێنرا، کاتێک "جۆر"ە پزیشکییەکان ئاوێتەی یەکتری بوون.

ئەم گێـڕانەوە پـووختەم بەشــێوەیەک بنیادنــاوە، نەریتــی پزیشـــکیی ڕۆژئـــاوایی، لە هەردوو بـــواری بەکـــاربردن و خەرجەوە، کە بنەمـای بەهێـزی هەمـوو بوارەکـانە بەسـەریدا زاڵە. شــێوازی تـر زۆرە مێـژوو نووســان بەســەرهاتەکانیان لەســـەر بنیادنـــاوە، بەڵام مـــن ئەم شـــێوازەم هەڵبـــژاردووە چونکە باوەڕم وایە خۆی لە فۆرمێکی مێژوویی ڕێکخـراودا دەبینێتەوە. کە خوێنەری فزولی سوودی لێ دەبینێ.

ئەگەر ئەم دەستنووسەم پێشکەش بە گۆڤارێکی پزیشکی بکردایە، ئەوا ناچار دەبووم باسی هەموو ئەو کێشمەکێشەیە بـکەم کە کـاریگەریی لەســەر لێکـدانەوەی داتاکـان هەیە. بـۆ مـاوەی چـل سـاڵ وەکـو مێـژوو نووسـێکی پزیشـکی کـارم کــردووە، بەڵام لە "ســـەردەمی زێـــڕین" دا منـــیش لە کـــاری پزیشـــکییەوە ئەوە فێربـــووم کە لە "بەشـــی شەشـــەمدا" لێـــی دواوم. بێگومان لێکۆڵینەوە پزیشـکییەکەم کـاریگەریی لەسـەر لێکدانەوەکانم بۆ ڕابردووی پزیشکی هەبووە. بەڵام هەوڵمـدا لە "کێشـە ڕزگـاریخواز wiggism "ە سـوواوەکان خـۆم بە

دوور بگرم- كه بەو چاوە سەیری هەموو مێژوو دەكات گوایە پرۆسەیەكی گەشەكردوو و زنجیرەیەك هەنگاوی حەتمییە بەرەو ساتی ئێستا. یان وێنەیەكی نوێتری ئەوتۆیە كە بەهای فیكری بە بەهای ئەخلاقیی هاوچەرخ دەگۆڕێتەوە. ئینجا دوای ئەوە سەركۆنەی سێكسیزم، ڕاسیزم و هەموو ئەو كێشانە دەكات كە بەسەر باوباپیرانماندا زاڵبووە. بۆم دەركەوت لە ڕابردوودا ئەوانەی توانیویانە بگەنە دامەزراوەی چاودێری تەندروستی، هەمیشە باوەڕیان وابووە كە دوكتۆری چاك هەیە وە دوكتۆری خراپیش هەیە. ئەوان ویستوویانە دوكتۆرێكی چاك چاودێرییان بكات، ئی خۆ ئێمەش تا ئێستا هەر بە دوای دوكتۆری باشەوەین، هیچ شتێك نەگۆڕاوە، ئەوەی گۆڕاوە پێناسەی دوكتۆری "باش"ە.

# بەشی یەکەم

# کاری پزیشکی لەسەر جێگا

هیپـــــــۆکرات، ئەو بـــــاوکە دڵســـــــۆزەیە هەمـــــــوو چارەسەرکارەکان ؛ پسپۆرانی چارەسەری نموونەیی، بەیەک چاو سەیر کردووە، نووسینەکانی هیپۆکرات وەکو بنەمایەک بۆ بیروباوەڕەکانیان چاولێدەکەن، هەربەوجۆرە پسپۆرانی چارەسەری سروشتی و چارەسەری دەستی و چارەسەری گیـــایی و چارەســـــەری ڕاســـــتکردنەوەی ئێســـــک وەکـــــو دامەزرێنەرێکـــــی نمـــــوونەیی دەیبیـــــنن، ڕێبازەکانیـــــان لە هەڵسوکەوت لەگەڵ تەندروستی و نەخۆشی و چارەسەر پشتی پێ دەبەستن. هەروەها ڕاوێژکارانی نەخۆشخانەکانی سەردەم کاتێک بڕوانامەی پزیشکی وەردەگرن تا ئێستاش زۆربەیان سوێندەکەی هیپۆکرات یان شتێکی لەو بابەتە دەڵێنەوە.

دەتوانین هۆکاری ئەم پایە گرنگە بۆ مێژوو بگەڕێنینەوە؛ لەلایەک کەسێتیی مێژوویی هیپۆکرات تەواو تەمومژاوییە کە لێکدانەوەی زۆر هەڵدەگرێ، لەلایەکیشەوە هەرچەندە کەسێتییەکی تەمومژاوی هەیە، بەڵام کەسێتییەکی ڕاستەقینەیە؛ لەسەر دورگەی کۆس- بەرامبەر کەناراوەکانی تورکیای ئێستا لە ماوەی نێوان ٤٦٠ پ.ز تا ٣٧٠ پ.ز ژیاوە؛ واتە کەمێک لە ئەفلاتوون و ئەرەستۆ و هاوتەمەنەکانیان، کە کۆڵەکەی کولتووری کلاسیکیی گریکیان لە ئەسینا قایم کردووە، گەورەترە. کاتێک سەرنج دەدەینە کردەوە زۆروزەبەندەکانی هیپۆکرات کە بۆمان ماونەتەوە، هەرچەندە کۆنن، بەڵام گومانی تێدا نییە هەست بە گرنگیی ئەو کارانە دەکەین؛ خەڵک پارێزگاری لە شتە زۆر بەنرخەکان دەکەن.

ئێمە زۆرشت سەبارەت بە هیپۆکرات نازانین، جگە لەو شوێنەی تێیدا نیشتەجێ بووە، لەگەڵ ئەو زەمەنەی بە نزیکی تێیدا ژیاوە. ئەو پیشەی پزیشکیی پێڕەو کردووە، بە کرێ وانەی بە قوتابییەکانی وتۆتەوە، کوڕێکی هەبووە بڕێکی زۆر ناوبانگی دەرکردووە؛ وەکو ئەفلاتون باسی دەکات. تەواو ڕوون نییە ئایا هەر بەڕاستی ئەو دانراوانەی بە ناوی ئەفلاتوونەوە تۆمار کراون بۆ خۆی دەگەڕێنەوە یان نا، بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەو کتێبانە هەمووی خۆی نەینووسیونەتەوە؛ لە ماوەی دوو سەدەی زەمەنیدا، ژمارەیەک قەڵەمی نادیار تۆماری کردوون، ئەمەش بەو واتایە دێت ژمارەی نووسراوەکانی هیپۆکرات- ٥٠ بۆ ٦٠ نووسراوی تەواوکراوو تەواو نەکراون لە دوای خۆی بەجێ ماوون- کە بڕێکی زۆر نارێکن و فرەبۆچوونی لەخۆ

گرتووە. ئەم بەرهەمانەی هیپۆکرات چەند لایەنێکی پزیشکی و کـاری نەشـتەرگەری لەخۆگرتـووە، هەروەهـا شـێوازی دەستنیشان کردن و چارەسـەر و خۆپاراستن لە نەخۆشیی باســـکردووە. لەو وتـــارانەدا ئامۆژگـــاری زۆری تێـــدایە سـەبارەت بە سیسـتەمی خـۆراک و لایەنەکانی تـری ژیـانی تەندروسـت، جـگە لە بـابەتی گرنگـی تـایبەت سـەبارەت بە ڕۆڵـــی ژیـــنگە لە تەندروســـتی و نەخۆشـــیدا؛ هەروەهـــا ژمارەیەک هەڵوێستی "هیپۆکراتی" و " پزیشکیی هیپۆکراتی" هەن وەکو بابەتی تیۆری مێژوویی لەسـەریان دەدوێین، لە ڕێـگەی هەڵبژاردنـی هەنـدێ بـابەت و کـاری تیـۆرییەوە بە چنگمان هێناون، لەکۆی سەدان وتارو بابەتی تۆمـار کراو و بـابەتی نەناسـراو، لەچوارچێـوەیەکی دیـاریکراودا ڕێکمـان خستوون.

بەهـۆی ئەم نووسـراوانەوە، ئاراسـتەیەک دروسـتبوو، لە پزیشک و چارەسەرکارانی نوێ سەرسامی هیپۆکرات بوون. پزیشکی هیپۆکراتی شێوازێکی گشتگیری هەیە؛ واتە ڕێبازی هیپۆکرات هەمیشـە بە تەواوی ئاراسـتەی نەخـۆش دەکرێت؛ بۆیە سـەردەمی نوێ پزیشکیی هەمەکی پێباشـە چونکە لەو پزیشـــکییەدا پەنـــاگەیەکی سروشـــتی دەدۆزێـــتەوە. لەگەڵ ئەوەی ئەو گشـــتگیرییە تایبەتمەنـــدییەکی ئەرێنـــی هەبـــوو، بەهـایەکی کولتووری بـاو لەکۆمەڵگەی کۆنی گریکیدا تێیدا ڕەگـی داکوتـــابوو؛ بەڵام گـــریکە کۆنەکـــان ئارەزوویـــان لە توێکاری جەسـتەی مـرۆڤ نەبـوو. توێکـاریی مردووەکەیـان نەدەکـرد تـاکو لە هۆکـاری مردنـی نەخۆشـەکەیان تێبگەن، پزیشکەکان قوتابییەکانی خۆیان فێرنەدەکرد تـاکو توێکاریی قـووڵ ئەنجـام بـدەن، هەروەکـو خوێنـدنگای پزیشـکی بەو

شـــێوەیەی ئەمـــڕۆ نەبـــوو. خوێنـــدکارەکان تەنهـــا لە مامۆسـتاکانیانەوە فێردەبـوون، ئەوەی دەربـارەی توێکـاری دەیـانزانی شـتێکی ڕووکەش بـوو، ئەوان بە وردی سـەنجی ئەو نیشـــانانەیان دەدا کە لەســـەر جەســـتەی نەخۆشـــەکە ئامـاژەی بە ڕەوتـــی ڕاسـتەقینەی نەخۆشـــییەکە دەدا، واتە پێشـبینی ڕەوتـی نەخۆشـییەکەیان دەکـرد تـاکو بـگەنە ئەو دەرەنجـامەی ئایـا نەخۆشـەکە چاکـدەبێتەوە یـان نـا. بەو شێوەیەی ئێستا نەخۆشخانە بوونی نەبوو، جێگای نەخۆش وەکـو لە ناونیشـانی ئەم بەشـەدا هـاتووە، سـەر جێگـای نەخـــۆش بـــووە، ســـەرجێگا بە مانـــای وشـــە لە مـــاڵی نەخۆشـەکەدا بووە.

ئەم بونیـــادەی پزیشـــکیی گریکـــی کـــۆن لەســـەری دامەزرابوو، نموونەیەکی سـەرەتایی چاودێریی تەندروسـتی بوو، پزیشـکی هیپۆکراتی پێویسـتی بەوە بـوو نەخۆشـەکەی بە تەواوی بناســـێت: لە ڕووی کـــۆمەڵایەتییەوە، لە ڕووی ئـــابوورییەوە، لەڕووی خێـــزانییەوە، شـــێوازی ژیـــانی، چـــی دەخوات و چی دەخواتەوە، پێشتر گەشتی کردووە یان نا، کـۆیلەیە یـان ئـازاد هەروەهـا مەودای ئامـادەیی بـۆئەوەی جارێکی تر نەخۆش بکەوێتەوە. لە نووسینەکانی هیپۆکرات هۆکـارە تیۆرییەکـان پێویســتیان بەو هەمـــوو زانیـــارییە تۆمارکراوانە هەبوو، وا لەخوارەوە زیاتر لێی دەدوێین.

ئەگەر مۆدێلی گشـتگیری مـۆدێلێکی سـەرنجڕاکێش بێت، چارەسـەرکارەکانی سـەردەمی نـوێ بگەڕێنێتەوە سـەردەمی گریـک، ئەوا چەنـد سـیمایەکی تـر لە پزیشـکی هیپۆکراتیـدا بەدیـدەکرێ، ســـەدایەکی گەورەی لە زانســـتی پزیشـــکیی هاوچەرخـــدا هەیە. گرنگترینـــی ئەو ســـیمایانەش مەیلـــی

بنەڕەتییە بەرەو ڕێبازی سروشتی، لەو ڕێبازەدا سیستەمی پزیشکی کە لە ڕۆژهەڵاتی نزیکی کۆن پیادەکراوە، وەکو میسر وسوریا وبابل و میزۆپۆتامیا - سیستەمەکە تێکەڵەیەک بووە لە نێوان ئاین و چارەسەری پزیشکی، شێوازی سرووتی ئاینی لەلایەن پزیشکی قەشەوە بەسەریدا زاڵبووە، لە چوارچێوەیەکی بەرفراواندا وەکو تووڕەیی خواوەند، گوناهی جۆراوجۆر، یان هێزی جادوویی، چاو لە نەخۆشی دەکرا، لە ڕێگەی نوێژەوە دەستنیشانی نەخۆشی دەکرا، یان لە ڕێگەی لێکدانەوەی هەناوی ئاژەڵانەوە، یان لە ڕێگەی دیاریکردنی ئەو گوناهانەی نەخۆشەکە کردوویەتی. ئەو تێکەڵەیەی کاری پزیشکی کە پشتی بە جادوو و ئاین بەستووە، بەشێکە لەو دیمەنە گریکییەی لەسەردەمی هیپۆکراتیشدا پێڕەو کراوە؛ پەرستگاکان بۆ خواوەندی پزیشکی گریکی ئەسکلیپیۆس تەرخان کرابوو، کە لەتەواوی قەڵەمڕەوی گریکەکاندا تەشەنەی کردبوو، بۆنموونە پەرستگەیەکی بەناوبانگ لەنزیک هیپۆکرات خۆی هەبوو؛ واتە لە دورگەی "کۆس". مەزنترین پەرستگاش لەدەشتایی پانوپۆڕی ئیپیدارۆسدا هەبوو، ئەو پەرستگایە هێشتا شوێنەوارە مەزنەکەی بوونی ماوە. ئەم پەرستگایانە لە ژێر دەسەڵاتی ئەو قەشە نیشتەجێیانەدا بوون کە پێشوازییان لە نەخۆش دەکرد، لێکدانەوەی نەخۆشییەکان لەسەر بنەمای ئەو خەونانە بوون کە نەخۆش بۆ قەشەکەی دەگێڕایەوە. لەڕێگەی مارە پیرۆزەکانەوە خەونەکان کاریگەرییان لەسەر دەستیشانکردنی نەخۆشییەکە زیاتر دەبوو، بێگومان ئەو مارانە دەبوونە هۆی ئەوەی شێوازی خەونی نەخۆشەکان تێک بچێت.

مارەکان بە کاژ فڕێدان نموونەیەک بوون بۆ نوێبوونەوە؛ بەشێکی زیندووی گۆچانی هیرمس[1] (کادۆسیۆس)، هێمای خواوەندی چاکبوونەوەی گریکی بوو (بڕوانە شێوەی ٤). سەیر لەوەدایە ئەسکلیبیۆس و گۆچانی هیرمس – هەردووکیان دووکەڵی ئاین و ئەفسوون بە گوێماندا دەدەن– بەڵام بوونەتە دروشمی پزیشکیی نوێ.

پەرستاگاکانی چاکبوونەوە بەشێکی گرنگن لە چاودێریی پزیشکی لای گریکەکان، بەڵام ئەو بەهایەی پەرستگاکان بەرجەستەیان کردووە لە نووسینەکانی هیپۆکراتدا کاریگەرییەکی بەهێزی نەبووە؛ ئەو وتارەی لە کۆمەڵە نووسینەکانی هیپۆکراتدا هاتووە، ئەوە دەگەیەنێ، نەخۆشی هۆکارێکی سروشتی لە پشتەوەیە، بەڵام تەنها جارێک نووسەرێکی هیپۆکریتی بە ئاشکرا هێرشی کردۆتە سەر لێکدانەوەی نەخۆشییە نادیارەکان کە لە سەرووی سروشتەوە سەری هەڵدابێت. ئەویش لەسەرەتای ئەو بابەتەدایە کە دەربارەی پەرکەمە، کە پێی دەوترێت

---

١ کادوسیۆس caduceus یان کادۆس یان گۆچانی هیرمس، ماری پەلک زێڕین، گۆچانێک دوو ماری لێ ئالاوە، لەسەرەوەیان جووتێ باڵ ڕواوە، لە ئایکۆنۆگرافیای ڕۆمانیدا وێنەی هیرمس کێشراوە گۆچانێک بەدەستی چەپییەوەیە، لە ئەمەریکای باکور وەکو هێمای پزیشکی ناسراوە لە گۆچانی ئەسکلیبیۆس جیاوازە، کادۆس یان گۆچانی هیرمس بۆ هەزاران ساڵ دەگەڕێتەوە، تا ئێستاش لەگەڵ زانستی نوێدا وەکو مەتەڵێک ماوەتەوە، ئەم هێمایە لە وڵاتی میزۆپۆتامیا بوونی هەیە، گۆچانی هیرمس بەشێکی دانەبڕاوە لە وێنەی خواوەندی نیئۆرتا، خاوەنەکەی بەم گۆچانی سۆفییە، توانای چاککردنەوەی نەخۆش و زیندووکردنەوەی مردووی هەبوو. (وەرگێڕ)

"نەخۆشیی پیرۆز"، لەزمانی گریکیی باودا، پەرکەم بەپیرۆز دانراوە چونکە نۆرەی پەرکەم بە دراماتیکی بەوەناسراوە کاریگەرییەکی گەورەی هەیە، دەبێتەهۆی بوورانەوە، کەفچڕین بە دەم و لالغاوەدا، خاوبوونەوەی ماسوولکەکانی میزلدان، لەدەستدانی کۆنترۆڵی ماسولکە گوشەرەکان، هەروەها کاریگەریی دەرونی لێ بەدیاردەکەوێ، ئەو کەسانەی دووچاری دەبن زۆرجار توانیویانە لەبەرژەوەندیی خۆیان بیگۆڕن. ئەسکەندەری گەورەو 'دواتر' یۆلیۆس قەیسەر، زۆر بە قورسی لە کاتی خۆیاندا تووشی نەخۆشی پەرکەم بوون. لە دەسپێکی وتەکانی کتێبی "نەخۆشیی پیرۆز" دا ئەم نەخۆشییەی بەوە لێکداوەتەوە کە بانگێکی ئاشکرای تەواوە بۆ ڕێبازی سروشتی کاری پزیشکی، هێشتا دەنگدانەوەی ئەو وتانە لە گوێماندا دەزرنگێتەوە، هەرچەندە دوو هەزار ساڵ پێش ئێستا نووسراوەتەوە، تێیدا هاتووە:

"ئەوەی پەیوەندی بەو نەخۆشییەوە هەیە کە بە پیرۆز ناسراوە، مەسەلەکە بەم شێوەیەیە: بۆم دەرکەوتووە بەهیچ شێوەیەک، هیچ نەخۆشییەک زیاتر خوایی نییە یان لە نەخۆشییەکی تر پیرۆزتر نییە، بەڵکو هۆکارێکی سروشتی هەیە وەکو هەر دەردێکی تر، ئەو نەخۆشییە دروست دەکات. دانەپاڵی هەر سیفەتێکی خوایی بۆ سروشتی نەخۆشییەکەو هۆکاری نەخۆشییەکە دەگەڕێتەوە، ئەویش سەرسامبوون و نەزانییە؛ چونکە نەخۆشییەکە بە هیچ شێوەیەک لە نەخۆشییەکانی تر ناچێ. بیرۆکەی خودایی پشت بەوە دەبەستێ، ئەوان ناتوانن لە نەخۆشییەکە تێبگەن، بەشێوازێکی ئاسان چارەسەری بکەن؛ ئەوان بە نووشتەو

پاکبوونەوەو تۆبەکاری لەو نەخۆشییە ڕزگار دەبن. بەڵام ئەگەر نەخۆشییەکە لەلایەن خوداوە سەرچاوەی گرتبێ، لەبەرئەوەی سەرسامکەرە، ئەوا نەک هەر نەخۆشییەک، بەڵکو زۆر نەخۆشی تر هەن، ڕەنگە بە پیرۆز دابنرێن".

ئەوەی مایەی تێڕامانە، نووسەر هیچ دژبەرییەکی لە گەڵ ئایندا نییە (وەکو لە وتەیەکدا دەریدەخات: «بۆم دەرکەوتووە بەهیچ شێوەیەک، هیچ نەخۆشییەک بەدەر نییە لە نەخۆشیی خودایی یان لە نەخۆشییەکی تر پیرۆزتر نییە»، بەڵکو لە سنووری تێرمە سروشتییەکاندا مەسەلەکەی داڕشتووە، لێکدانەوە بۆ هۆکاری سەرهەڵدانی ئەو نەخۆشییە پیرۆزە دەکات، ئەو نووسەرە هیپۆکراتییە وتەکەی بەشێوەیەک دەخاتەڕوو دەڵێ: پەرکەم لە ئەنجامی گیرانی دەماری مێشکەوە دروست دەبێت، بەدوایدا فڕێدانی بەڵغەم بە ڕێکوپێکی دەوەستێ، لە ئەنجامدا مێشک تووشی کێشە دەبێت، نیشانە دراماتیکییە کاریگەرەکانی پەرکەم دەردەکەون. لێرەدا دوو چەمکی شاراوە شایانی باسکردنە:

یەکەم، ئەم نووسەرە هیپۆکراتییە مێشکی سنووردار کردووە بەوەی شوێنی هۆشمەندی و فرمانە ئەقڵییەکانی ترە، وتی:

پێویستە خەڵک ئەوە بزانن هەستەکانی شادی، دڵخۆشی، پێکەنین، خەمباری، دڵتەنگی، خەمۆکی و کارەسات، جگە لە مێشک سەرچاوەیەکی تری نییە. بەمجۆرە پەندو زانیاری بە ڕێگەیەکی دیاریکراو وەردەگرین؛ دەبیستین و دەبینین، پیس لە پاک، خراپ لە چاک، شیرین لە بۆگەن، جیادەکەینەوە. هەندێ لەو شتانە بە حوکمی نەریت جیادەکەینەوە، ئەوانیدی لە ڕێگەی بەکارهێنانەوە هەستی پێدەکەین.

بێگومـــان ســـێنترالّییەتی مێشــک لە ئێســـتادا بـــووەتە مەسەلەگەلێک لە بازنەکانی بیرکردنەوەی زانستیدا لەسـەری کۆکن، بەڵام لەسەردەمی کۆنی گریکدا بەو شێوەیە نەبووە؛ ئەفلاتون لەسـەر ڕێبازی هیپۆکرات ڕۆیشـتووە، بەو پێیەی مێشــک ناوەنــدی چــالاکی دەرونیــیە، بەڵام شــاگردەکەی ئەفلاتـــوون، ئەرســـتۆ، بـــاوەڕی وایە دڵ ناوەنـــدی کـــۆی هەڵچوونەکـان و ئەرکە ئەقڵییەکـانی تـرە. هەرچۆنێـک بێـت، کاتێـک هەسـت بە دوودڵـی دەکەیـن یـان دەکەویـنە داوی خۆشەویسـتییەوە، ئەو هەسـتانە داماندەگرن کە لە سـینەدا ئارام دەگرێ و لە دڵدا هەوار هەڵدەدا- نەک لە مێشـکدا. دڵ ئەو ئەنـدامەی ترپەکـانی خێـرا دەبـن و لێـدانەکانی بەهێـز، کاتێـک لەوپەڕی چالاکیـدا دەبـین. جـگە لەوەش ئەرســتۆ، تـــوێژەری بە ئەزمـــوون لە پرۆســـەی گەشـــەی کـــۆرپەلەدا، ئامـاژەی بەوە کـردووە کە یەکەم نیشـانەی ژیـان لەســەر کـۆرپەلەی باڵنـدە لە سـووڕی دروسـتبووندا دەرکەوتـووە، جـــووڵە لە نێـــو دڵە ســـەرەتاییە بچکـــۆلەکەدا بـــووە. دوای نـــزیکەی دوو هەزار ســـاڵ، شەکسـپیر بە دێـرە شـیعرێک ئامادەی ئەو گفتوگۆ کۆنە دەبێت:

شوێنی ئەوین و باڵگرتنی لە کوێدایە
لە ئەقڵە یان لە دڵی کۆرپەکەی دایە؟

هەرچەنـدە زمانەکەمـان تـا ئێسـتاش زۆر شـت بـۆ"دڵ" دەگەڕێنێـتەوە، بەڵام هیپـۆکرات و ئەفلاتـوون گفتوگۆکەیـان بردەوە.

دووەم خاڵی گرنگ، دەکرێ لەم نووسینانەدا بەدەستی بێنین، پەیوەندی بە هۆکارەکەی هیپۆکراتەوە هەیە سەبارەت بە پەرکەم: ئەویش گلدانەوەی بەڵغەمە، وەکو دیارە بەڵغەم نیشانەی ئینفلەوەنزای ئاساییە، بەڵام یەکێکە لەو چوار تێکەڵەیەی[2] لای هیپۆکراتەکان نەخۆشی و تەندروستی پێکدێنێ؛ هەروەها لەنێو جەرگەی زانستی فسیۆلۆجی و زانستی نەخۆشیی هیپۆکراتدایە. هەرچەندە ڕێبازی تێکەڵە لە هەموو نووسینەکانی هیپۆکراتدا نەهاتووە، بەڵام دەتوانرێ کۆ بکرێتەوە، گالینۆس (١٢٩- ٢١٠ ز) بلیمەت لە پزیشکیی گریکی کۆندا، ڕێبازی تێکەڵە بە کۆڵەکەی تیۆری پزیشکی وێنا دەکات. گالینۆس پێگەیەکی بالا دەبەخشێتە پزیشکیی تێکەڵە کە تاکو سەدەی هەژدە بەسەر بیرکردنەوەی پزیشکیدا زاڵبووە.

---

٢پزیشکیی تێکەڵە Humoral، ڕێبازی ئاوێتەکان، سیستەمێکی پزیشکیی وردە، بۆ پێکهاتەو کاری لەشی مرۆڤ کە قوتابخانەی یۆنانیی کۆن و پزیشکە ڕۆمانییەکان و فەیلەسوفە یۆنانییەکان پشتیان پێبەستووە، هیپۆکرات بە دۆزەرەوەی ئەم ڕێبازە پزیشکییە دادەنرێت، و گالینۆس گەشەی پێداوە. ئەم سیستەمە پەیوەستە بە شلەمەنییەکانی لەشەوە، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندی بە کاردانەوەی بەرگری لەشەوە هەیە، کە لەنێو شلەمەنییەکانی لەشدا ئەو دژە تەنانە دەگرێتەوە کە جیاوازن لە خانە. کەمبوون یان زیادبوونی هەر توخمێک لەم چوار توخمە، کاریگەریی ڕاستەوخۆی لەسەر هەست و سۆزو تەندروستیی مرۆڤ هەیە. چوار ئاوێتەکەی جەستە پێکدێت لە خوێن، تاڵاوی زەردی زراو، تاڵاوی ڕەشی سپڵ و بەڵغەم. وەکو وتمان تێکچوونی هاوسەنگیی ئەو شلەمەنیيانەی نێو لەش پەیوەندی بە مێژووی نەخۆشییەکەوە هەیە، بەهۆی کەمبوونەوە یان زیادبوون لە بڕی شلەکان. (وەرگێڕ)

## ئاوێتەکانی جەستە: سیستەمی تەواو

چوار ئاوێتەکە ئەمانەن: خوێن، تالاوی زراو، تالاوی سپڵ، و بەڵغەم، وەکو لەشێوەی (٢) دا دەیبینین. سیستەمی ئەم چوار تێکەڵەیە، چوارچێوەیەکی تایبەتمان پێدەبەخشێت بەمەبەستی تێگەیشتن لە تەندروستی و نەخۆشی و شتی تر، لە کۆتاییدا تیۆرییەک بەرجەستە دەبێت، ڕێنماییمان دەکات بەرەو کەسێتیی مرۆڤ و توانای ئامادەیی بۆ توشبوون بە نەخۆشی. لە تایبەتمەندییەکانی ئەم تێکەڵەیە- گەرمی، ساردی، وشکی و تەڕی- پێوەرێکی هاوسەنگ بۆ ڕەوتی نەخۆشییەکان و قۆناغەکانی سووڕی ژیان پێشکەش دەکات. هەر تێکەڵەیەکیش بە یەکێک لەم چوار توخمەوە گرێدراوە- هەوا، ئاگر، زەوی و ئاو - فەلسەفەی سروشتی یۆنانی باوەڕی وایە هەر شتێک لەژێر مانگدا بێت لەم توخمانە پێکهاتووە؛ لەبەرئەوە ئەو جیهانەی دەکەوێتە ژێر ڕەحمەتی مانگەوە، هەموو شتەکانی گۆڕانکارییان بەسەردادێ، پیر دەبن و دەمرن. بەڵام لە سەرووی مانگ جووڵەیەکی بازنەیی هەیە وەکو یاسایەکی بنەڕەتی بەردەوامە بۆیە ئەستێرەکان وەکو توخمێکی نەمر دەبێننەوە.

بەشێوەیەکی گشتی ڕێبازی ئاوێتە یا تێکەڵەکان humoralism بەهێزترین پرۆگرام بوو بە دەستی پزیشک و تەنانەت پیاوانی ئاسایی شەقامەوە بۆ لێکدانەوەی تەندروستی و نەخۆشی، بەڵام لەسەدەی نۆزدەوە هێواش هێواش پزیشکیی زانستی شوێنی ئەم ڕێبازەی گرتەوە.

ئەو کەسەی چاودێری نەخۆش دەکات دەتوانێت بەهۆی شلەکانی جەستەوە کە کاریگەری لەسەر جەستە هەیە، نیشانەکان دەستنیشان بکات، بۆ نموونە پێست سوور

دادەگەڕێ کاتێ نەخۆشەکە تای لێدێ، دەکۆکێ و بەڵغەم یان خوێن فڕێدەدات، چاوی فرمێسک دەڕێژێ، لووتی ئاوی پیا دێتە خوارێ، لە کاتی وشکبوونی پێست یان زەردوویبدا ڕەنگی میزەکەی تۆخ دەنوێنێ، ڕەنگە پێستی بە ئارەقکردن تەڕ بێ یان ڕەنگی پێستی پەڕیبێ. هەروەها ڕەنگە ڕشانەوەو سکچوون دوو نیشانەی دیاری نەخۆشی بن. لەبەر ئەوەی کولتوری گریکیی کۆن ڕێگر بووە لە توێکاری بۆ لەشی مرۆڤ بۆیە مەعریفەی هیپۆکراتییەکان بە توێکاریی قووڵی جەستە، زۆر سنووردار بووە، یان زانیارییەکانیان لەڕێگەی توێکاری گیانەوەرو کەوڵ کردنی گیانەوەرەوە بووە ئەو کاتەی بۆ ژەمەکانی خۆراک ئامادەیان کردووە. هیپۆکرات بەوە بێزار نەبووە، ئەگەر گالینۆس هەوڵیدا هەندێ زانیاری توێکاری لەسەر لەشی مرۆڤ پێشکەش بکات، لە بنچینەوە لە ڕێگەی کەوڵ کردن و توێکاری ئاژەڵانەوە ئەو زانیارییانەی دەستکەوتووە.

هیومۆرالیزم پێویستی بە بڕێکی زۆر لە مەعریفە نییە سەبارەت بە توێکاری، چونکە توخمە کاریگەرەکانی جەستە مادە ڕەقەکان نین بەڵکو وەکو وتمان شلەمەنییەکانی جەستەن ئەوانیش بە ئاسانی دێنە بەردەست، هەریەکە لەو شلانە پەیوەستن بە ئەندامێک لە ئەندامەکانی جەستەوە، بەڵغەم بە مێشکەوە بەستراوە، خوێن بە دڵەوە، زەرداوی زراو بە جگەرەوە، تاڵاوی ڕەش بە سپڵەوە. لەگەڵ ئەوەشدا لە نوسینەکانی هیپۆکراتدا سەبارەت بە نەشتەرگەری، لەگەڵ پزیشکەکانی تردا دوواوە وباسی گرتنەوەی شکاوی و ڕاستکردنەوەی ئێسک و جومگەکان، تیماری برینەکان و نەشتەرگەری بچووک بۆ کەیسە تایبەتەکانی کردووە. کاری

نەشتەرگەری بە ئێستاشەوە، پێویستی بە تەرکیزکردنێکی چڕە بۆ سەر بەشێکی دیاریکراوی جەستە، بەڵام "پزیشکی" هیپۆکراتی ، لە ڕێگەی لێکدانەوەی ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەر شلەی تێکەڵەکاندا دێن بە گشتگیر مایەوە ونەخۆشەکەی لەژێر چاودێریدا دەهێشتەوە.

هیومۆرالیزم لە ناوەندی پزیشکیی ڕۆژئاوایدا، پشتی بە دوو بیرۆکەی نەگۆڕ بەستووە، هەردووکیان پەیوەندییان بە یەکترییەوە هەیە، ئەو دوو بیرۆکەیەش هاوسەنگی و میانڕەوییە؛ هیپۆکراتەکان پێیانوایە تەندروستی دەرەنجامی هاوسەنگی نێوان چوار تێکەڵەکەیە، تێکچوونی هاوسەنگی نێوان ئەم چوار تێکەڵەیە- هەر زیادڕەوییەک یان کەمبوونێک لە هەر یەکێک لەو شلانە، دەبێتە هۆی نەخۆشی.

جەستە بە شێوەیەک چاوی لێدەکرێ کە شێوەیەکە لە شێوەی فڕن ولێنانی خواردن میتافۆرەیەکی ئاشکرایە شێوازی لێنان هاوشێوەی وەسفی نەخۆشییە لای هیپۆکراتەکان، بۆ نموونە ئەو دەردراوانەی بە نەخۆشی بەراورد دەکرێن – کێم و زوخاو، ئارەق کردنەوە، فڕێدانی بەڵغەم، میزی خەست، سکچوون و ڕشانەوە- بەو شێوەیە لێکدەدرێتەوە کە ئەم گۆڕانکارییانە لە شلەکاندا، بەرەنجامی میکانیزمی بەرگرییە سروشتییەکانی جەستەن؛ جەستە زۆرجار شلەمەنییە خراپبووەکان یان زیادەکان دەکوڵێنێ – لێدەنێ- بۆ ئەوەی جەستە لە تێکەڵە زیاد و خراپبووەکان بەرەو باشتر پاک بکاتەوە یان تێر بکات، بە ئامانجی گێڕانەوەی دۆخی هاوسەنگی بۆ لەش (تەندروستی).

ئەم لێکدانەوە هیپۆکراتییە بۆ نەخۆشی سەر جێگا، بە مەبەستی ڕزگاربوونی لەش لە تێکەڵە خراپەکان، بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە لەسەر هێزی شیفابەخشی سروشت. ئەم پرەنسیپە بۆ ماوەیەکی زۆر لە ناوەندە پزیشکییەکاندا بابەتی گفتوگۆ بوو، لەسەدەی نۆزدەیەمدا لە قاڵبێکی یاساییدا بە " نەخۆشی سنووررداری خودی" تۆمارکرا، هەر دەرمانێکی نوێی بەهێز دەتوانێ بە ئاسانی هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکات. هەر نەخۆشییەک چارەسەری هەبوو یان نەیبوو- لە ڕووی خودییەوە سنووردارە. بۆ نموونە چارەسەرکردنی نیشانەکانی ئینفلوەنزا، ڕەنگە نەخۆشەکە هەست بە باشتربوون بکات، بەڵام بە هیچ جۆرێک ناتوانێ هۆکارەکە بنبڕ بکات، هەموو پزیشکەکان ئەوە دەزانن، بەڵکو ئەوەش دەزانن کە ڕەچەتەی پزیشکی وا لە نەخۆش دەکات زۆر هەست بە باشی بکات، تەنانەت وا هەست دەکات چاکبۆتەوە، بەڵام کاریگەری ئەو ڕەچەتەیە چاکبونەوەیەکی لاوەکییە نەک ڕیشەیی ڕیشەیی، زۆر جار کلینیکی پزیشکی پشتی بەو هەڵە لۆجیکییە بەستووە کە دەڵێ: "هۆکاری ڕوودانی ئەمە، ئەوەی پێش خۆیەتی".

هیپۆکراتەکان لە کاری پزیشکیدا زۆر بێفیزبوون، هێزی شیفابەخشی سروشت لای ئەوان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو وتەیان کە دەڵێن: "هێزی سروشت هێزی شیفابەخشی نەخۆشییە" و "ئەوەی پەیوەندی بە نەخۆشییەوە هەیە بۆ دوو شت دەیگەڕێننەوە : یارمەتی بدە، یان بەلای کەمەوە ئازاری مەدە".

**ڕاهێنانی پزیشکی لەسەر جێگای نەخۆش**




شێوەی (٢) تێکەڵە humours : ئاسانکارییەکی سەرسوڕهێنەر لە سیستەمی هیپۆکراتدا هەیە، تایبەتمەندیی گرنگ و هاوسەنگی هەیە، لە نێوان (گەرمی ، ساردی، وشکی و تەڕی).

بەمجۆرە ئامانجی یەکەمی چارەسەرکردن یارمەتیدانی جەستەی نەخۆشە، تا کاری "سروشتی" ی خۆی بکات. هەندێ لە کارەکانیان کە ئەنجامی دەدا لە گەڵ پزیشکیی نوێدا ناکۆک بوو. بۆ نموونە خوێنگرتن (کەڵەشاخ) بنەمایەکی ئەقڵانی هەبوو؛ بۆ شوێنی هەوکردنەکان- یان سووربوونەوەی پێست لە ئەنجامی تا لێهاتندا، چونکە وا لێکدەدرایەوە ئەم نیشانانە بەڵگەن لەسەر خوێنی زیادە لە لەشدا، بۆیە وا پێویست دەکات لە ڕێگەی خوێنگرتنەوە فریای جەستە بکەویت و یارمەتی بدەیت تا لەو خوێنە زیادەیە ڕزگاری بکەیت. کەڵەشاخ کۆنترین شێوازی چارەسەرکردنە لە هەمووشیان زیاتر بەردەوامی هەبووە، جگە لەوەش زۆرجار وا دەبینرێت ئەم شێوازە چارەسەرکردنە بەڵگە بێت لەسەر وەحشیگەری و بەربەرییەتی پزیشکی سەرەتایی. کەڵەشاخ تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەم یەکێک بوو لە کۆڵەکەکانی چارەسەرکردن، بەڵام بەرە بەرە لەلایەن پێڕەوکەرانییەوە کاڵبووەوە؛ زۆرجار نەخۆشەکان خۆیان داوایان دەکرد کەڵەشاخیان بۆ بکرێت چونکە سوودی زۆریان لێوەرگرتووە. زۆرجار پزیشکەکە بڕێکی زۆر خوێنی لە نەخۆشەکە گرتووە، وازی لێنەهێناوە تا ڕادەی بوورانەوە. بەپێی وتە کاریگەرەکانی یەکێک لە پزیشکە هیپۆکراتییەکان «لە دۆخی نەخۆشییە سەختەکاندا، چارەسەرە بەهێز و کاریگەرەکان سەرکەوتووترن» هەندێجار ئەو وتەیە دەخرێتە قاڵبێکی کاریگەرترەوە وەکو «نەخۆشییە ترسناکەکان پێویستیان بە چارەسەری ترسناکە».

بەشـێوەیەکی گشـتی چارەسـەرە ئـاوێتە هیومۆراڵەکـان تـێکەڵ بە شـتی تـر کـران لە چەشـنی سیسـتەمی خـۆراک، وەرزش، مەسـاج، و ئەو پێداویسـتییانەی هەر تـاکێکی نەخـۆش پێویسـتی پێیەتـی. ئەو تایبەتمەنـدییە گشـتگیرەی نەخـۆش، کرۆکـی کـاری پزیشـکی بـوو لە دیدی سیسـتەمی تێکەڵەکـانەوە. هەرچەنـدە نووسـراوەکانی هیپـۆکرات نـاوی زۆر نەخۆشی دێنێ دەتوانین نـاوی نوێی بۆ دابنێین، بەڵام نەخۆشـییەکە تەنهـا تـایبەت بـووە بەو کەسـەی کە ئـازاری بەدەسـتەوە چەشـتووە. هەرچەنـدە دەتـوانین نـاو بـۆ نەخۆشییەکە بدۆزینەوەو ناوی بنێین سیل، جەڵدەی مێشک، مەلاریـا، پەرکەم، هیسـتریا و دیزانتـری، بەڵام وا پیشـان دەدرێـت ئەو ڕوداوانە لە تاکەکـان قەومـاون، دواتـر ئەو شـارەزایی و ئەزمـونەی لەو نەخۆشـییانە پەیدایان کـردووە، گشـتێنراوە بە مەبەسـتی چـۆنێتی مـامەڵەکردن لەگەڵ ئەو نەخۆشییانەدا، ئەگەر هەمـوو لایەکی گرتەوە. ئەزمونەکەیـان لە شـێوەی وتەی بەنرخـدا بەرجەسـتە کـردووە، دەتـوانین نـاوی بنێـین "مرواربییەکـانی سـەرجێگای نەخـۆش". ئەو ڕونکـردنەوەیەی لە سیسـتەمی تـێکەڵەی شـلەمەنییەکاندا بەکاریـان هێنـاوە، هانـدەر بـووە بـۆ ئامـادەکردنی چارەسـەرەکان، بەشـێوەیەک لەگەڵ دۆخە تایبەتییەکانـدا بگونجێن.

هیپۆکراتییەکـان تەواو درکیـان بەوە کـردووە، زۆر نەخۆشـی هەیە کۆمەڵگەکـان بە پیـر وگەنـجەوە، بە هەژار ودەوڵەمەنـدەوە، بە قەڵەو ولاوازەوە، بە نێـر ومێـیەوە ڕادەمـاڵێ، ئەمە ئەو تایبەتمەنـدییانەیە کە هیپۆکراتەکـان لە دەستنیشـان کردنـی نەخۆشـی سـەرجێگا و ئامۆژگـاری بـۆ

چارەسەرکردن بە هەند وەریان گرتووە. لە دوو کتێبدا کە کاریگەرییەکی تایبەتیان هەیە- ئەویش کتێبێکە سەبارەت بە "پەتا" و کتێبێکیش بەناونیشانی "شوێن و ئاو وهەوا"، نووسەرە هیپۆکراتییەکان چەند بیروڕایەکیان سەبارەت بە لایەنە زۆر تایبەتەکان بە نەخۆشی خستۆتە پێشچاو. کتێبی " شوێن و ئاوو هەوا" لە کرۆکدا خۆی لە مانیفێستی دامەزراندنی بزوتنەوەی پاراستنی ژینگە کە لە جیهانی ڕۆژئاوادا سەریهەڵداوە دەبینێتەوە، بە تایبەتی ئەو بەشەی پەیوەندی بە تەندروستی و نەخۆشییەوە هەیە. کتێبەکە ئامۆژگاری سەبارەت بە شوێنی گونجاو بۆ نیشتەجێبوون پێشکەشکردووە (خۆڵی پوخت و باش، بەرگەی سەرماو سۆڵی بەهێز بگرێت). ئەم کتێبە تەندروستی کۆمەڵگەی لەسەر بنەمای فاکتەرە ژینگەییە کاریگەرەکان لەسەر دانیشتوان شیکردۆتەوە. وەکو هەموو بیروباوەڕە پزیشکی وبایۆلۆجییەکان تاکۆتایی سەدەی نۆزدە، ئەو نووسەرانە لایەنگری ئەوەی ئێستا پێیدەڵێن"لامارکیزم"[٣] (کەمێژووی

---

٣لامارکیزم، بە لامارکیی نوێ یان بە لامارکی بۆماوەیی ناسراوە، لەسەر ئەو بیرۆکەیە دامەزراوە کە دەڵێ گیانەوەری زیندوو تایبەتمەندییەکانی خۆی بۆ وەچەکەی دەگوێزێتەوە لەڕێگەی بەکارهێنانەوە یان بەکار نەهێنانی ئەم تایبەتمەندییانەوە لە تەواوی ژیانیدا، هەروەها پێشی دەوترێت تایبەتمەندییە بەدەست هێنراوە بۆماوەییەکان، یان بۆماوەییە نەرمەکان soft inheritance ئەم ناوە بە هەڵە لە زانای زیندەورزانی فەرەنسی جان باتیست لامارک (١٧٤٤- ١٨٢٩) ەوە وەرگیراوە. لامارک تیۆری بۆماوەی نەرمی ئاوێتەی تیۆرەکانی پەرەسەندنی خۆی کرد وەکو تەواوکەری تێگەیشتنی سەبارەت بەڕاستکردنەوەی تیۆری پەرەسەندن. لەم دیدەوە لامارک وا دەبینرێت کەدژی داروینیزمە، بەڵام ئەم خستنەڕووە لەمێژووی بایۆلۆژیادا هەڵەیە، چونکە لامارک هەر لەبنەڕەتەوە خاوەنی بیرۆکەی بۆماوەی نەرم نەبووە، کە لەسەردەمی کلاسیک و دوای ئەویش پێی

بەسەرچووە). واتە هیپۆکراتییەکان پێیانوابوو فاکتەرە ژینگەییەکان لەوانەیە تایبەتمەندییە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ بگۆڕن ( ڕەنگی پێست و شێوەی بالاو ئەوانیدی)، ئەم گۆڕانکارییانەش بۆ وەچەکانیان دەگوێزرێنەوە. ئەمە فەلسەفەیەکی گەشبینانەیە بۆ نەرمونیانی مرۆڤ و لەگەڵ متمانەی هیپۆکراتەکان بەگشتی گونجاوە بەوەی سیستەمی چارەسەرکردن لای ئەوان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو نەخۆشانەی سوودیان لە چارەسەرەکانیان وەرگرتووە. لە هەمان کاتدا نووسینەکانیشیان پڕە لەو کەیسانەی لە ڕێگەی ئەزموونەوە فێری بوون، بەوەی نەخۆشی لە قۆناغی گەشەکردنی تەواودا، یان زۆر ترسناکدا، ناتوانرێت هیچی لەگەڵدا بکرێت.

## دەنگدانەوە گەورەکەی پزیشکی هیپۆکراتی

تێکەڵەی شلەمەنییەکانی جەستە وەکو چوارچێوەیەکی تیۆری ماوەیەکی زۆر بەردەوامبوو، هێشتا بیرۆکەی شلەمەنیی تێکەڵەکان لە گفتوگۆی ئاساییدا بەکاردێنین "بە سروشت کەسێک دەبینین گەشبینە، بەڵام لەڕاستیدا خۆی کەسێکی ڕەشبین"ە، هەروەها لە تەوەری گەرم- سارد، تەڕ- وشک لە ڕێکخستنی تێکەڵەکاندا گازندەی خراپ دەکەین، وەکو ئەوەی ئەگەر بە بێ کڵاو دەرچووین ئەگەر قاچەکانمان تەڕبن، سەرمامان دەبێت. پزیشکەکان سەبارەت بە سروشت و چارەسەری ئینفلوەنزا لەهەموو کەس باشتر

---

ناسراوە "لامارکیزم". هەروەها داروین لە کتێبی ئەسڵی جۆرەکان ئەو بیرۆکەیەی پەسەند کردووە کەناوی " بۆماوەی تایبەتمەندییە بەکارهێنراوەکان و تایبەتمەندییە پشتگوێ خراوەکان"ە. (وەرگێڕ)

ئەوە دەزانن- کەوتنە نێو چەمکە باوەکانی نەخۆشییەوە، بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە نەخۆش چاوەڕوانی دەکات، بەشێکی دەگەڕێتەوە بۆ چاوپێکەوتنی نێوان نەخۆش و پزیشک، بەشێکی تری ئەوەیە پزیشکەکانیش مرۆڤن. لەقۆناغی دواتردا، پزیشکی داروینی "هێزی شیفابەخشی سروشت"ی هیپۆکراتی بەکارهێنا لە گومانکردن لە شێوازی چارەسەری نیشانەکان، ئایا هێورکردنەوەی کۆکە، یان وشککردنی ئاوی لووت چارەسەری ڕیشەییە، لە کاتێکدا ئەم نیشانانە نموونەی بەشێکن لە سووڕی بەرگریی لەش دەبێت بەشێوەیەکی سروشتی کۆتاییان پێ بهێنرێت نەک بەزۆر یان بە پێدانی چارەسەر.

لەڕاستیدا زۆرێک لە کولتووری هیپۆکراتی لەڕێگەی نووسینەکانی گالینۆسەوە بۆ ڕۆژاوا گواستراوەتەوە، کە زیاتر لە هەزار ساڵ بەسەر بیرکردنەوەی پزیشکیدا زاڵبوو. گالینۆس هەستی دەکرد تەواوکەری چوارچێوەی هیپۆکراتییەو ئیزافەی نوێی دەخاتەسەر. لەسەردەمە کۆنەکاندا ئەوەی دەربارەی ئەو دەیزانین دەربارەی هیچ پزیشکێکی تر نایزانین، وتەکانی ئەو زیاتر لە وتەی هەر نووسەرێکی تر ماونەتەوە (چ لەبارەی بواری پزیشکییەوە یان بابەتی تر)ەوە، گالینۆس کارەکانی تێکەڵ بەژیاننامەی خۆی کردبوو. دەربارەی هەموو لایەنە پزیشکییەکان نووسیویەتی: دەستنیشانکردنی نەخۆشی، چارەسەری نەخۆشی، سیستەمی خۆراک و فەلسەفەی پزیشکی، ڕێبازی تێکەڵە هیپۆکراتییەکانی خستە چوارچێوەی یاساییەوە، بەڵام ڕەهەندە ئەزموونییە پزیشکییەکانی خۆی پشتگوێ نەخست و بەهێزی کردن، لەکاتێکدا هیپۆکراتییەکان ڕازیبوون بەوەی

تەنها بەچاو لە نەخۆشەکان وردبنەوە، بەڵام گالینۆس ئەوانی تێپەڕاند و وردەکارییە جەستەیی و توێکارییەکانی لەبواری تەندروستی و نەخۆشیدا وەکو بابەتی زانستی باسکردووە. زۆر متمانەی بەخۆی هەبووە، لەهەموو شتێکدا یەکلابووەوە، نەدەبوووایە ڕەخنەی لێ بگیرێت، زۆربەی پزیشکەکان زیاتر لە هەزار ساڵ هاوڕای بۆچوونەکەی ئەوبوون.گالینۆس لە پێڕەوی پزیشکی بۆ نەخۆشی سەرجێگا، زۆر سوودی لە ڕێبازی تێکەڵەکان بینی، بەڵام بۆ زانستی جەستە سیستەمێکی ئاڵۆزی داهێنا لەو سیستەمەدا فرمانە سروشتییەکانی جەستەی وەکو بەشێک لە ڕۆحی "پیرۆز" لێکدەدایەوە نەک پشتبەستن بە تێکەڵەکان. لەو نموونەیەدا خۆراک دەچێ بۆ گەدە، دوایی دەگۆڕێت بۆ کایل (کایل شلەیەکی شیرییە چەند دڵۆپێک چەوری تیایە، دەچێتە ڕیخۆڵە باریکەوەو لەهەرسکردندا دەچێت بۆ سیستەمی لیمفاوی. وەرگێر)، ئەم کایلە لە ڕێگەی دەروازەی خوێن هێنەرەوە دەڕوات بۆ جگەر، ئینجا دەگۆڕێت بەخوێنێک ئاوێتە بە ڕۆحی سروشت، بەشێک لەم خوێنە دەڕوات بۆ دڵ، دواتر بۆ سییەکان بۆ تێر کردنی ئەو بەشە زیندووە، بەشەکانی تری خوێنەکە لە ڕێگەی زمانەیەکی نەبینراوەوە لە سکۆڵەی ڕاستی دڵەوە دەڕوات بۆ سکۆڵەی چەپ، لەوێ تێکەڵ بەو ڕۆحە زیندووە دەبێت کە لەڕێگەی وەرگرتنی هەناسەوە لە سییەکانەوە وەردەگیرێت. دوای ئەوە ئەم خوێنە زیندووە لە شادەماری دڵ aorta و شادەماری لاملەوە دەڕوات بۆ مێشک، لەوێش بۆ دواجار بەهۆی "ڕۆحی گیانەوەرییەوە" پاکدەبێتەوە، ئینجا بەدەمارەکاندا گوزەر دەکات، تا جووڵەو هەستەکان دەست پێدەکەن.




شێوەی ٣: سیستەمی فسیۆلۆجی گالینۆس: گالینۆس ژمارەیەک دیاردەی بنەڕەتی بۆ زانستی جەستە لێکدایەوە، بە بەشداری جگەر ودل ومێشک لە ڕێگەی کرداری ئامادەکردنی سێ ڕوحەکە، ڕۆحی سروشتی ورۆحی زیندەگی ورۆحی گیانەوەری.

ئەم شـــێوازە لە جەســـتەو فســـیۆلۆجییای مرۆیـــی، بەدرێژایـی هەزار سـاڵ بـاوەڕێکی پیـرۆزی نەگـۆڕ بـوو، بە هەمان شێوە لێکدانەوەکانی گالینۆس لە توێکاریدا کە لەسـەر مەیمون و بەراز و گیانەوەرانی تر، بەشـێوەیەکی هەڕەمەکی ئەنجـامی دەدا، بەهـاداربوون. حەرام کردنـی توێکـاری بـۆ جەستەی مرۆڤ لە دەرەوەی دەسەڵاتی گالینۆس بوو، تـاکە هەڵەی ئەو ئەوەبـــوو خوێنەرەکـــانی لەو ســـەرچاوەیەی وەریـــدەگرت ســـەبارەت بە زانیـــاری توێکـــاری ئاگـــادار نەدەکـردەوە، ئەمەش موریـدەکانی گالینۆسـی وا ڕاهێنـا کە بڵـێن، جەسـتەی مـرۆڤ دوای شـرۆڤە کردنـی مامۆسـتای گەورە، گۆڕانکـــاری بەســـەردا هـــاتووە، بەڵام لە کۆتاییـــدا ڕاسـتییەکان ئاشـکرابوون و گـالینۆس بـووە ئامـانجی ئەو ڕەخنەگرە پێشکەوتووخوازانەی هەر شتێک بە چاوی خۆیان نەبینن باوەڕ نەکەن.

نێوانی هیپۆکرات و گـالینۆس زیـاتر لە ٥٠٠ سـاڵ بـووە، بێگومـــان لەو مـــاوەیەدا ژمـــارەیەکی زۆری پزیشـــک و سیســـتەمی چارەســـەرکردنیش دەکەوێـــتە ئەو نێـــوانەوە. کۆمەڵێک پزیشـک لە ڕۆمـا سـووربوون لە گرنگیـی مەسـاج، گەرمـاوی گەرم و حەمـامی سـارد وهەنـدێ چارەسـەری تـر کە کاریـان لەسـەر کـردنەوەی کونەکـانی لەش و داخسـتنی دەکرد، گریمـانەی ئەوەیـان دەکرد هەر گرژی و ئاڵۆزییەک بەدەر لەسروشـــت دەبێـــتە هـــۆی نەخۆشـــی. هەنـــدێ لە پزیشـــکەکان ڕێبـــازێکی تایبەتیـــان لە دەستنیشـــانکردن وچارەسـەری نەخۆشـیدا گـرتەبەرو هەنـدێ لەو سیسـتەمە ئەلتەرنەتیڤانە لەکاتی دەسەڵاتی گالینۆسدا هەر بە زیندوێتی مانەوە، بەڵام ئەگەر بەراوردی هیپۆکرات بە گالینۆس بکەین

ئەوا گالینۆس هەزار ساڵ بەسەر مردنیدا تێپەڕیبوو کەچی هێشتا بەشێوەیەکی بەرفرەوان گرنگی پێدەدرا زۆر زیاتر لە هیپۆکرات کە هێشتا چەند سەدەیەک بەسەر مردنیدا تێنەپەڕیبوو موریدەکانی وازیان لە نووسین هێنا. بەهەرحاڵ ئەو ڕەهەندە پزیشکییانە شایانی لێکۆڵینەوەن، بەڵام پزیشکیی گریکی کۆن بە تەواوی سێ پرەنسیپی بنەڕەتی لەدوای خۆی بەجێ هێشتووە کە تا ئێستاش پیشەی پزیشکی لەسەر ئەو سێ پرەنسیپە بنیاد نراوە؛ پرەنسیپی یەکەم وەکو بینیمان هیمۆرالیزم بوو- ڕێبازی تێکەڵەی شلەمەنییەکانی جەستە. پرەنسیپی دووەم ڕووەک و گژوگیا بنەمای زۆربەی دەرمانەکان بوون وپزیشکەکان لەکاری پزیشکیدا پشتیان پێبەستبوو، تا شەڕی نەخۆشییەکانی پێبکەن. پزیشکێک هەر بەخۆی سیستەمێکی بۆ دەستوری دەرمانسازیی کۆن دانا بەجۆرێک بۆ چەند سەدەیەک پزیشکەکانی تر سوودیان لێبینی. دیسکۆریدۆس Dioscorides (ماوەی ٤٠- ٨٠ ز) بابەتێکی نووسی دەربارەی "دەرمانی ڕووەکی" کتێبی نووسەرەکانی پێشووی سەبارەت بە ڕووەکە پزیشکییەکان بەکارهێنا، بەڵام بەشێکی زۆری کتێبەکە دۆزینەوەکانی خۆی تێدابوو دەربارەی ڕووەک و تایبەتمەندییە دەرمانییەکان، هەرچەندە هەندێ بەرهەمی گیانەوەری باسکردبوو، بەڵام زۆرینە بۆ دەرمانە ڕووەکییەکان بوو، هاوشێوەی زۆربەی پزیشکەکانی تر لە سەردەمی کۆن و دواتردا. دەتوانرێ لە ڕووەکەکانەوە ئەو مادانە وەربگیرێن کە ئارەق دەردەرن، یان دەبنە هۆی ڕشانەوە، یان بەتاڵکردنەوەی ڕیخۆڵە، یان خەوهێنەرە یان ئازارشکێنە. زۆربەی ئامادەکراوە

ڕووەکییەکان وەکو ئەفیون و خەرپونگ[٤] کاریگەرییەکی مەزن ودرێژخایەنیان هەیە بەڵام پێچەوانەی ناوەڕۆکە بنچینەییەکەی تیۆری پزیشکیی کۆن، ڕووەکەکان دابەشبوونێکی جوگرافی دیاریکراویان هەیە، گەڕان بە دوایاندا پزیشکەکانی ناچار کرد خۆیان دەرچن و لە بێشە و دارستان و پەرژینە بە دەوەن دروستکراوەکانی دەوری کێڵگەکان بە دوایدا بگەڕێن. هەروەها پێیان وابوو ئەگەر ڕووەکێکی دیاریکراو لە دەوروبەرت شین بوو ئەوا بیدە بەو کەسانەی ئەو ڕووەکە لە ناوچەی ئەوان شین نابێت، بەوە هاوردەکردنی ڕووەکەکان و ناردنی بۆ شوێنەکانی تر لە سەدەکانی دواتردا ڕەواجی پەیداکرد.

گالینۆس سوودی لە بەشێکی زۆری کارەکانی دیسکۆردیس لە نووسینە مەزنەکانیدا وەرگرت، کتێبی "دەرمانی ڕووەکی" ی دیسکۆردێس لە سەردەمی ڕینیسانسدا جێگەی ڕێزبوو. پرەنسیپی سێیەم- ڕێبازێکی سیکۆلار بوو لە لێکدانەوەی نەخۆشیدا- ئەم ڕێبازە زۆر ڕوون نەبوو بەڵام گرنگی تەواوی هەبوو، کاریگەریی سیحرو ئاین بەسەر پزیشکان و خەڵکەوە، لەوەی پەیوەندیی بە تەندروستی و نەخۆشییەوە هەیە، تا ئەم ساتەش بەردەوامی هەیە. بەڵام چارەسەرکارە کۆنەکان کە هێشتا کارەکانیان ماوەتەوەو بەهای خۆیان هەیە، پێیان وایە

---

٤خەرپونگ hellebore یان خەربەنگ، خەربەند، ڕووەکێکی کێوی دەگمەنە، گوڵەکەی سەوزە، قەراغی پەڕەکانی سوورە، مادەیەکی ژەهراوی تیدایە پێی دەوترێت "هیلیبۆرین"دووکەڵی تۆوە سووتێنراوەکەی بۆ قلیشاویی پێست باشە، خەرپونگی ڕەش لە زستاندا گوڵ دەکات بۆ چارەسەری نەخۆشییە ئاژەڵییەکان سوودبەخشە.

دەکرێ نەخۆشـی لە دیـدێکی سروشـتییەوە لێـی بڕوانرێـت، ئەمەش مانـای ئەوە نیـیە پزیشـکە کۆنەکـان ئـاین پەروەر نەبـوون، گـالینۆس بـاوەڕی بە یەکتاپەرسـتی هەبـوو، لێکـۆڵەران دواجـار دەیـبەنەوە سـەر ئەوەی بەجۆرێـک لە جۆرەکـان دانـی بەو بـزووتنەوە ئـایینییەدا نـاوە کە لەسەردەمی خۆی گەورەو مەزن دەبوو، ئەویش بزوتنەوەی مەسیحییەت بوو. بەڵام کاتێک هیپۆکرات و گالینۆس بەرەو ڕووی نەخۆشـێک دەبنەوە، لە هەوڵدان بۆ چارەسـەرکردنی نەخۆشەکە لە جێگەکەیدا، پشت بەو شـارەزایی و زانیاریانە دەبەسـتن کە لایـان کەڵەکە بـووە. لەگەڵ ئەوەشـدا زۆرجـار نەخۆشـی، بە ئێستاشـەوە لە چوارچێـوەیەکی ئـایینی یـان ئەخلاقیـیەوە لێـی دەڕوانرێـت، وا دەبینرێـت دەرەنجـامی گوناهەکـانە، یـان سـزایەکی خـوداییە، یـان تـاقیکردنەوەی سەبری ئەیوبە: خودایە چیت لێم دەوێ؟

ئەم لێکـدانەوە هەڵەیە ئەو ڕاسـتییە ناشـارێتەوە کە پزیشکیی کۆن لەسـەر ڕێبازی "سروشت" بەڕێوەچووبێت. زاراوەی پزیشـک physician و فیزیـک physic، یەک سەرچاوەیان هەیە ، ئەو سەرچاوەیەش لەسـەردەمی گریکی کۆندا ڕەگی داکوتاوە، بە مانای "سروشـت"، هەر هەوڵدانێک بـۆ تێگەیشـتن لە کـاری جەسـتە لەڕووی تەندروسـتی و نەخۆشییەوە، پزیشک هاندەدا شـەیدای زانیـاری زیـاتر بێت، نەخۆشیش هاندەدا لە نیگەرانیدا بمێنێتەوە.

# بەشی دووەم
# پزیشکی لە کتێبخانەدا

## موجیزەی زیندوو مانەوە

کاتێک مرۆڤ لەم مەسەلەیە ڕادەمێنێ، دەبینێ مانەوەی هەر شتێک لەسەردەمی کۆندا بۆ ئێستا لەشێوەی موجیزەدا بووە، گەر وانەبوایە چۆن بە قەسیدە درێژەکانی هۆمیرۆس شاد دەبووینەوە، یان بە کارەکانی ئەفلاتوون و ئەرەستۆ، یان ئەو ٢٠ بەرگەی (بەنیوە چڵی لە چاپە نوێیەکەیدا) نووسراوەکانی گالینۆسی لەخۆگرتووە؟ دوای ڕەنجێکی زۆر دەستنووسەکان کۆپی کراون (لەسەر کاغەزی تەنک یان ناوەندەکانی تر)، ئەو دەستنووسانە کاڵای گرانباو دەگمەن بوون، کەوتبوونە بەر کەڵپەی ڕۆژگارو کاولکارییەکانی جەنگ، یان شێبوونەوەو داڕزانی سروشتی یان کەمتەرخەمی و لەناوچوونی ئاسایی. ئەوەی تا ئێستا ماوەتەوە، کۆپیی دواترە، دوای دەقە ئەسڵییەکە بەچەند

سەدەیەک ماوەتەوە، کەسێک کۆپی کردووە ویستویەتی وێنەیەک بۆخۆی بنووسێتەوە تا پارێزگاری لێبکات، بەشێوەیەکی گشتی، تا بەهای دەقەکە بەنرخ بوو بێت، هەلی مانەوەی زیاتر بووە، بۆیە دوای ئەوە ئاسانتر کۆپی تری لەبەرگیراوەتەوە، بەڵام ئەوەی بەدەستی ئێمە گەیشتووە بەداخەوە زۆر کەمترە لەوەی لەکۆندا لەناوچووە.
گەورەترین کتێبخانەو موزەخانەی کۆن لەجیهاندا لە ئەسکەندەرییەی میسر بووە، ئەو کتێبخانەیە دەیان هەزار نووسراوی لە بابۆڵەی کاغەز و کاغەزی تەنک لەخۆگرتبوو، بەڵام کەوتەبەردەم زنجیرەیەک لە وێرانکاری و داڕزانی بەردەوام لە سەدەی دووەمی زاینەوە تا سەدەی حەوتەمی زاین هیچ شوێنەوارێکی نەمایەوە.
ئێستا لەوەی ماوەتەوە ئێمە قەرزاری ئەو کەسە نەناسراوانەین لە خێزانە خانەدانەکان، لە دامەزراوە ئایینییەکان و لە کۆشکی پاشاکاندا بە کۆپی لەبەریان گرتۆتەوەو پاراستوویانن، زیاتر لەوەی ئەم کارانە بیرۆکەی ئەو کەسانە بن کە پێش دوو هەزار ساڵ یان زیاتر ژیاون.
کتێبەکانی هیپۆکرات و گالینۆس و پزیشکە کۆنەکانی تر، بنەمای پرۆگرامی خوێندنی پزیشکی بوون لە سەدەی هەژدەی زاینی، دەرەنجام، ماوەی نرخاندن و پاراستن و لێکدانەوەی کارەکانیان کە هەزارەی نێوان ڕووخانی ڕۆما (٤٥٥ ز) و بزووتنەوەی ڕینیسانس بوو، شایانی ئەوەیە شوێنی تایبەت لە مێژووی پزیشکیدا بگرێت. ئەم ماوەیە پێی دەوترا ماوەی "پزیشکیی کتێبخانەکان" لەم بەشەدا هیچ جیاوازییەک ناکەم لە نێوان ڕۆژئاوای لاتینی و ڕۆژهەڵاتی

فره زمان که دەوڵەتی بیزەنتی و دەوڵەتی ئیسلامی به بەشداریی یەهودی و کریستیانەکان له مێژووی پزیشکیدا لەو ناوچانەی ئیسلام تێیدا باڵادەست بووە، پزیشکەکان لەم دوو بازنەیەدا که پانتاییەکی گەورەی جوگرافی و کولتووریکی بەرفرەوان کەوتوتە نێوانیانەوە، هەموو پێکەوە بەیەک تایبەتمەندی کاریان کردووە: ئەویش پیرۆزکردن و سەرخستنی پیشەی پزیشکی بووە، لای گریکەکانیشەوە، لەرێگەی بنیادنانی تیۆرو پیشەی پزیشکی لەسەر بنەمای چەمکە کۆنەکان، گومانی تیانییە کاری باشیان بۆی کردووە.

هاوبەشی و بەشداری کردن که خۆی لەپاراستن و ئیزافەکردن بۆسەر کولتووری پزیشکی گریکی دەبینییەوە، ئەم سەردەمە لەسەدەی پێنجەمی زایینییەوە دەست پێدەکات تاکو داهێنانی ئامێری چاپکردن. ئەم داهێنانە گۆڕانێکی بنەڕەتی له سروشتی هەیکەلی پزیشکی هێنایە کایەوە، لەو ماوەیەدا سێ کاری گرنگمان به میرات بۆ مایەوە: نەخۆشخانەکان، دابەشکردنی پلەوپایەی ئەرکی پزیشکی، و زانکۆکان که دەستەبژێری پزیشکی، تێیدا فێر دەکران.

## پاراستن وگواستنەوە وڕاستکردنەوە

له کۆتاییەکانی سەردەمی کۆندا له ئەوروپا، بەرپرسیارێتی زۆربەی چاودێرییە پزیشکییەکان دەکەوتە سەرشانی ئەو کەسانەی که هیچ نووسراوێکی کلاسیکی کۆنیان لەبەردەستتا نەبوو. نەریتە خۆماڵییەکان بەشێوەی نافەرمی وەکو تێکەڵەیەک له جادووگەری وئاینی وخورافە، کاریان لەسەر چارەسەری پزیشکی دەکرد. تێڕوانینی

بەربڵاوی جیهان لە سەردەمی مەسیحییەتدا مرۆڤی هاندەدا چاوەڕوانی کۆتایی جیهان بن، یان بەجۆرێک لە نەخۆشی بڕوانن بەوەی بەشێکە لە قەدەرێکی باڵاتر کە لەسەرووی توانای مرۆڤەوەیە، وایان لەخەڵک دەگەیاند نەخۆشی شتێکی زۆر بێمانایە بەبەراورد لەگەڵ ئەو چێژ وخۆشییەی لەودونیا بەدەستی دەهێنین. تەنها کەمینەیەک ئەویش زیاتر پزیشکەکان خوێندەوارییان هەبوو ودەیاننووسی، لەچوارچێوەیەکی کلاسیکیانەدا کتێبەکانی چەرخی چوار وپێنجی زاینییان دەخوێندەوە.

لەسەدەی چوارەم یان سەرەتای سەدەی پێنجەم، کایلیۆس ئۆرلیانۆس[5] کۆمەڵێک دانراوی سەبارەت بە نەخۆشییە درێژخان وکتوپڕەکان نووسی، لە بنەڕەتدا پشتی بە پزیشکێکی ڕابردوو بەستبوو ئەویش سۆرانۆس[6] بوو، کارەکانی کایلۆس تا بڵێی ئەقڵانی و پڕ لەتێڕوانینی بەرزی پزیشکی بوو. بەدرێژایی چەرخەکانی ناوەڕاست پێگەیەکی باڵای هەبوو لە نەخۆشی وچارەسەری نەخۆشیدا کورت کرابووەوە، بۆ نموونە نەخۆشی سەراسیێ یان (شەقیقە-migraine) و بائیش (عرق النسا-sciatica) و هەندێ نەخۆشیی تر، شێوازی چارەسەرکردنەکانی زۆربەیان نەرمبوون، بۆ سەرئێشەکە هەندێ پێشنیاری وەکو شێلان، پشوودان لەسەر جێگە، دانانی پەڕۆی گەرم، بۆ بائێشەکەش پێشنیاری هەندێ ڕاهێنانی وەرزشی ئاسانی دەکرد.

---

5 Caelius Aurelianus (fl. 4th or earley 5th century).

6 Soranus.

لە ڕۆژئاوای لاتیندا، هەندێ نووسراوی پزیشکی ڕەواجی پەیداکرد، لەوانە هەندێکیان هەندێ کاری کرچوکاڵ بوو بە ناوی گالینۆسەوە (نووسراوی ساختە بوون) لەگەڵ وتەکانی هیپۆکرات، جگە لە هەندێ کتێبی نووسەرە کۆنەکانی تر؛ بەڵام دواتر سەنتەری قورساییەکە گواسترایەوە بۆ ڕۆژهەڵات، بۆ ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی کە پایتەختەکەی قوستەنتینییە بوو (ئیستانبولی ئێستا). زۆربەی دەستنووسە کۆنەکان بەکردەوە گەیشتنە ڕۆژهەڵات، پزیشکەکان لە ڕۆژهەڵاتی مەسیحییەتدا ئەو دەستنووسانەیان پاراست و وەریانگێڕا و لێکدانەوەیان بۆکرد. دواتر ئیسلام دەسەڵاتی پەیداکرد و دەسەڵاتی بیزەنتییەکان پاشەکشەی پێکرا وپانتاییە جوگرافییەکەی لەدەستدا، بەڵام لەسەر هەمان خاک کە بووە بەشێک لە دەوڵەتی ئیسلامی- ئەو دەوڵەتە ڕۆڵێکی گرنگی گێڕا لە گواستنەوەی جەستەی پزیشکیی سەدە کۆنەکانی ئەورووپای لاتین بۆ ئەوێ.

کولتووری ئیسلامی بەوەناسرابوو فرە ڕەنگییەکی جوانی هەبوو لە زمانەکاندا، هەندێ لە دەستنووسە گریکییە کۆنەکان هیچی لێنەمابووەوە جگە لەو شێوازە وەرگێڕانەی بۆ زمانەکانی ئەو ناوچانە وەرگێڕابوون کە کەوتبوونە ژێر سایەی فتوحاتی ئیسلامییەوە، بەتایبەتی زمانەکانی عەرەبی، فارسی وسریانی. لە کۆتایی سەدەی هەشتەمی زایینیدا، ناوچەکە جووڵەیەکی وەرگێڕانی گەورەی بەخۆیەوە بینی کە سێ سەدەی خایاند. زۆرجار وا لە نەریتی پیشەی پزیشکی ئیسلامی لەسەدەکانی ناوەڕاست دەڕوانرێت، کە کەناڵێکە بۆ پاراستنی دەقە گریکییە کۆنەکان لە ڕێگەی وەرگێڕانەوە، لە

راستیدا هەر ئەو تێکستانەی کە وەرگێڕران بۆ زمانەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، لەکۆتاییدا وەرگێڕرانەوە بۆ زمانە ئەوروپییە نوێیەکان.

نەریتی پزیشکی ئیسلامی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا زۆر زیاتر بوو لەوەی تەنها قۆناغێکی دابڕاوبێت؛ بەڵکو خاوەنی کولتوورێکی پزیشکی فێرکاریی چالاک بوو، تەنها ملکەچی ئایدیای پزیشکی گریکی کۆن نەبوو تا لەگەڵ چوارچێوە خۆماڵییەکە بیگونجێنێ، بەڵکو سەرنج و تێبینی خۆی و چارەسەری پزیشکیی خۆیشی هەبوو، کرداری نوێی ئەنجامدەدا. سێ کەس لەو کەسایەتییە سەرەکییە دیارانەی پزیشکی ئیسلامی – ئەبوبەکری ڕازی (٨٦٥- ٩٢٥ ز)، ئیبن سینا (٩٨٠- ١٠٣٧ ز)، ئیبن ڕوشد (١١٢٥- ١١٩٨ز) – کاریگەرییەکی درێژخایەنیان هەبوو نزیکەی چوار سەدە درێژەی کێشا، بەهەرسێکیانەوە کۆمەڵێک کتێبیان دانا تەواوی ئایدیای پزیشکی گریکی دەگرتەخۆ، بەڵام دوای ئەوەی هەندێ گۆڕانکاری گونجاویان لەو کتێبانەدا ئەنجامدا، جارێکی تر بۆ ڕۆژئاوایان گەڕاندەوە، هەرسێکیان لە بواری جیاجیای تردا کاریان دەکرد، ڕازی- لە ئێراندا نوسینەکانی لە بواری کیمیا ومۆسیقا وفەلسەفەدا بوو، بەڵام لە بواری پزیشکیدا تەواو قاڵبووبووەوە، لە دەستنیشان کردنی نەخۆشیدا مایەی سەرنجی خەڵکێکی زۆر بوو لە ژیانیدا. ئەو یەکەم کەسبوو ئاوڵەی لە سوورێژە جیاکردەوە (سوورێژەی بە ترسناکتر لە قەڵەمدا) کۆمەڵێک ئامۆژگاری بە سوودی پێشکەش بە گەشتیاران کرد.

هاوشێوەی ڕازی، ئیبن سینا لەچەند بوارێکدا کاری دەکرد کە لەدەرەوەی پیشەی پزیشکی بوو. فەلسەفەی ئەرەستۆ کاریگەری لەسەرداناو بەسەریدا زاڵبوو، بەهرەی لە داهێنانە پزیشکییەکانی ئەرەستۆ وەرگرت. ئیبن سینا هەر لە تافی لاوییەوە زیاتر لە ٢٥٠ تایتڵی لە چوارچێوەی ژیانی پڕ لەسەرکێشیی خۆیدا نووسی.

کتێبی "یاسای پزیشکی" نووسراوێکی پزیشکی بوو بەدرێژایی چەند سەدەیەک گەورەترین شانسی خوێندنەوەی هەبوو، لە پێنج کتێبدا کێومالّی تەواوی ئەو بابەتانەی کرد کە تیۆری پزیشکی و چارەسەری پزیشکی و تەواوی لایەنە تەندروستییەکانی لەخۆگرتبوو. ئەمە جگە لە بوارەکانی نەشتەرگەری و بابەتە دەرمانییەکان، کە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بە کاری پزیشکییەوە هەبوو. ئیبن سیناش هەروەکو گالینۆس پیاوێکی زیرەک بوو، دوودڵ نەبوو لەوەی بەهرەکانی بە خوێنەرەکانی بگەیەنێت. لەکتێبی "یاسا"دا، پەندی پزیشکیی گریکی کۆن و سەلیقەی پزیشکیی ئیسلامی تێکەڵ کرد و لەچوارچێوەیەکی نایابدا کۆی کردنەوە، بەشێوەیەکی ڕێکوپێک و لۆجیکیانە وەکو کتێبێکی نموونەیی بۆ خوێندنی تەواوی بوارە پزیشکییەکان پێشکەشی خوێنەرانی کرد. لەبەر ئەو هۆکارە بوو بۆ ماوەیەکی زۆر لە ئەوروپا وەرگێڕرایە سەر زمانی لاتینی- تاکو ئێستاش خوێندکارانی پزیشکی لە یۆناندا وەکو وانەیەک لەسەر (پزیشکیی ئیسلامیی کۆن) دەیخوێنن.

ئیبن ڕوشدیش هەروەکو ئیبن سینا فەلسەفەی ئەرەستۆ کاریگەری زۆری لەسەردانا، لە ئیسپانیای ئیسلامی و

مەراکش. گەورەترین کردەوەکانی ئیبن ڕوشد لە بواری پزیشکیدا دانانی ئینسکلۆپیدیایەک بوو هاوشێوەی کتێبی یاسای ئیبن سینا (هەروەها بابەتی زۆری لەسەر فەلسەفە وئەستێرەناسی و فیقهی ئیسلامی) نووسی. کتێبە جیهانییەکەی بە ناوی "گشتێتیی پزیشکی" لە ژێر ناوی جۆربەجۆردا وەرگێڕرایە سەر زمانی ئینگلیزی کە پێکهاتبوو لە حەوت بەش، لە تویکارییەوە بگرە تا چارەسەرکردن، وەرگێڕانە لاتینییەکەی لە کۆتاییەکانی سەدەکانی ناوەڕاستدا، تێکەڵەیەک بوو لە کردەوەکانی گالینۆس و ئەرەستۆ، پێشکەش بە چەند نەوەیەک لە پزیشکە ئەوروپییەکانی کرد.

هەرچۆن پزیشکە ئیسلامییەکان پرۆگرامێکیان دانا بۆ وەرگێڕانی تێکستە کۆنە ئەوروپییەکان بۆ زمانەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بە هەمان شێوە پرۆسەی وەرگێڕانەوەی ئەم تێکستانە بۆ لاتینی لەلایەن کۆنستانتینی ئەفەریقییەوە پێش (١٠٩٨) دەستی پێکرد و لەلایەن چەند زانایەکی سیکۆلارەوە بەردەوام بوو. ئەو تێکستە لاتینیانە کە تازە گەیشتبوون، بوونە بنەمای ئەو پرۆگرامەی لە قوتابخانە پزیشکییە ئەوروپییەکاندا بۆ یەکەمجار خوێندرا، خوێندنەکە لەو قوتابخانەوە دەستی پێکرد کە لە شاری سالیرنۆ لە خوارووی ئیتاڵیا لە دەوروبەری ١٠٨٠ ، ناوی دەرکردبوو. دوای چەند سەدەیەک کۆلێجە پزیشکییەکان لە زانکۆکانی سەدەکانی ناوەڕاست  پشتیان بەو سەرچاوانە بەست.

## نەخۆشخانەکان، زانکۆکان، پزیشکەکان

بەپێی پێناسەی ئێمە بۆ چەمکی "نەخۆشخانە"، ئەو ناوەندە مۆدێرنە گرنگەی نێو دامەزراوەکانە کە چەند بنەمایەکی گرنگی هەیە، ڕۆمانەکان جۆرێک لە بینای تایبەتیان بەکار دەهێنا پێیان دەگوت *Valitudinaria* (لە زمانی ئینگلیزیدا ڕەگی ئەم وشە لاتینییە دەگەڕێتەوە بۆ *valitudinarian* بۆ وەسفی ئەو کەسە بەکاردێت کە زیاد لە ڕادە گرنگی بە تەندروستیی خۆی دەدات) ئەم خانەیە بۆ حەوانەوەی ئەو سەربازە نەخۆش و بریندارانە بوو کە لەوێ چاودێری دەکران، لێرەدا خانەیەکی چاودێری کۆن ماوەتەوە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی نۆیەمی زایینی. پێش ئەو مێژووە بە ماوەیەکی کەم، کۆیلەکانیش کاتێ نەخۆش دەکەوتن پێکەوە نیشتەجێ دەکران، ئەم ڕەنگدانەوەیە بۆ ئەو سەردەمە بەهادار بوو. ئەو جۆرە بینایانە بە کردەوە دیزاینێکی تایبەتیان هەبوو، جێگەی ژمارەیەک قەرەوێڵەیان لە شوێنە پێویستەکان هەبوو، بەڵام ئەم شوێنانە کاتی بوون، تەنها کاتی ئەنجامدانی هەڵمەتێکی کتوپڕ بۆ دیاردەیەکی پێویست، یان کاتی بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەک دەکرانەوە، بەو مانایەی ئێستا دامەزراوەی فەرمی نەبوون.

وشەی Hospital "نەخۆشخانە" ڕەگاژۆی هەمان وشەی hospitality یە بەمانای (میواندۆستی)، hostel بەمانای (ڕێبواران)، hotel بەمانای سەردەم میوانخانەیە. لە دەوڵەتی کریستیانیدا، نەخۆشخانە hospital بە واتای ئەو سەردەمە، دامەزراوەیەکی ئاینییە، کە قەشە چاودێری و

سەرپەرشتی دەکات، شوێنی حەوانەوەی ئەو حاجی یان دیدەنیار یان میوانانەیە، بۆ زیارەت هاتوون، یان ئەو هەژار ولێقەوماوانەیە کە پەنایان بۆی بردووە. لە ڕاستیدا ئەرکی ئەم دامەزراوەیە کاری پزیشکی نەبووە (هاوشێوەی خانەقا یان دێری گاورەکان یان دێری پەرستاری -ڕاهیبە- nunneries بووە)، جۆرێک لە چارەسەرکردنی سەرەتایی تیابووە (شوێنی نەخۆش و دەردەدار)، هەندێ پێداویستی پزیشکی لەخۆگرتووە. ئەمجۆرە دامەزراوانە لە ڕۆژهەڵاتی نزیک فراوانتر وباوتر بوون، لە ڕۆژئاوای لاتینی (ساڵی ٥٥٠ لە ئۆرشەلیم شوێنی ٢٠٠ قەرەوێڵە هەبووە)، بەرە بەرە بەرەو گۆڕەپانی ئەوروپای ئێستا گواستراوەتەوە. زۆربەی نەخۆشخانە ئەوروپییە بەناوبانگەکان کە لەسەردەمی ئێستادا ماون، سەردەمی دروستکردنیان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست، وە ناوەکانیشیان ناوی ئایینین وەکو نەخۆشخانەی ئۆتێل دیو (ئۆتێلی پەروەردگار) لە پاریس، نەخۆشخانەی سانت بارسۆلۆمیۆ لە لەندەن و نەخۆشخانەی سانتا ماریانۆڤا لە فلۆرەنسا.

لەخاکی وڵاتە ئیسلامییەکانیش بە هاتنی سەدەی یازدە، نەخۆشخانەکان قەبارە وگرنگییەکی بەرچاویان هەبوو. هەندێجار خۆی لەبەشی تایبەتدا دەبینییەوە، وەکو بەشی نەخۆشییەکانی چاو، یان نەخۆشییە دەرونییەکان، وەرگرتنی ئەو خوێندکارانەی ئارەزوویان لە فێربوونی پیشەی پزیشکی هەبوو. تایبەتمەندیی پزیشکی زۆر ڕوونتر بوو لەو دامەزراوانەدا بە بەراورد لەگەڵ کریستیانە هاوتاکانیان، بەڵام لەو لایەنەوە هاوبەشبوون، کە پەیوەندی

بەسەرچاوەی دارایی و خێرخوازییەوە هەبوو، لە کاتی بڵاوبوونەوەی پەتاکاندا، لە کاری مرۆیی و خێرخوازیدا هاوشان بوون، هەروەها لە دابڕین و جیاکردنەوەی نەخۆشیشدا هاوتابوون. سەرکردە ناوخۆییەکان بەدیاریکراوی نەخۆشخانەکانیان بۆ دوو نەخۆشی بەکاردەهێنا، ڕشانەوە لەگەڵ گەڕی. زۆرجار بە نەخۆشی گەڕی دەوترێ "لازاریتۆ" لە لازارۆس "لیعازر" ەوە هاتووە، ئەو پیاوە هەژارەی کە سەگ زامەکانی دەلیستەوە، وەکو لە ئینجیلی لۆقا لە زاری عیسای پێغەمبەرەوە ناوی هاتووە. نەخۆشخانەکان بۆ پەتای ڕشانەوە ئامادەکران کە بە مەرگی ڕەش ناودەبرا. پێشتریش بۆخزمەت و دابڕینی نەخۆشیی "گەڕی" بەکاردەهێنران. لە سەدەکانی ناوەڕاستی مەسیحییەتدا هیچ نەخۆشییەک بەقەدەر نەخۆشیی گەڕی، بەشێوەیەک گوزارشتی لێنەکراوە کە ئاوێتەبێت لە دڕندایەتی و لە هەمانکاتدا خۆشەویستی تێدا بەکارهێنرابێت. لە دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکەدا لە هەندێ دۆخدا پزیشکەکانی سەردەمی نوێ بڕیاری ئەوەیان دەدا نەخۆشەکە لە کۆمەڵگە دووربخرێتەوە ونەفی بکرێت، یان بەپێی یاسای کوشتنی ئاسان لە ناوببرێت، جیابوونەوەی هاوسەر لە هەڵگری گەڕی، ڕێگەپێدراوبوو. ئەو دەستنیشاکردنە بڕیاری ژیانی نەفیکردن وگەدایی بوونی بەسەر نێچیرەکەیدا دەدا، بە دیاریکراوی نەخۆشەکە فڕێ دەدرایە نەخۆشخانەی دابڕینەوە، لەکاتی دەرچوونیشیدا دەبوایە زەنگۆڵەیەک لە مل بکات کە بە زەنگۆڵەی گەڕ وگولەکان ناسرابوو، تاکو ڕێبواران سڵ بکەنەوە

ولەسەرچاوەی میکرۆبی نەخۆشییە جەستەییەکە خۆیان بەدوور بگرن. لەهەمان کاتدا هەندێ لە پەرستارە ڕاهیبەکان و ئەو کەسانەی تەرکی دونیایان کردووە، یان ئەوانەی نەزریان کردووە، لەنێو نەخۆشە نەفرەت لێکراوەکاندا، بە ئازادی دەسوورانەوە وژیانی خۆیان بۆ ئەوان تەرخان کردبوو وخۆشەویستییان پێدەبەخشین.

دەستنیشانکردنی نەخۆشی گەڕبوون لە نێوان سەدەی دوازدە وچواردەدا لە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپیدا بەربڵاوبوو. ئەوەی یارمەتی قەڵاچۆکردنی ئەم نەخۆشییەیدا ئەو فاکتە بوو، کە ئەو کەسانەی لە شوێنە تەواو داخراوەکاندا پێکەوە و لە نزیک یەکەوە دەژیان، زیاتر بەرەو مەترسیی مەرگی ڕەش و پەتای ڕشانەوە کە بەدوایدا دەهات، دەبوونەوە. بێگومان هەندێ لە نەخۆشخانەکانی گەڕبوون دواتر گۆڕان بە نەخۆشخانەی پەتای ڕشانەوە، لەبەر ئەو هۆیانەی باسکران، جگە لەوە پەتای ڕشانەوە ئەو نەخۆشییە کتوپڕە بوو هەندێ لە نەخۆشەکانی چاکدەبوونەوە، بەڵام نەخۆشی گەڕی نەخۆشییەکی درێژخایەن بوو، هەندێجار نەخۆش تاکو مردن پێیەوە دەبوو. نەخۆشخانەکانی ڕشانەوە بەتایبەتی لە خوارووی ئەوروپا کاتێک ڕشانەوە لە سەدەی حەڤدەی زایینیدا شوێنەواری نەما، بە مەبەستی بەکارهێنانی بۆ نەخۆشیی تر گۆڕدران. بەڵام لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە پەتاکە بەردەوام بوو، نەخۆشخانەکان مانەوە بۆ کەرنتینەکردنی گەشتیاران و ئەوانیدی کە گەشت دەکەن و پەتاکەش لەبەر دەرگایە.




(٤) کاراکتەرە پزیشکییە کلاسیکییەکان. سەرنج بدە ئەم وێنەیە، ستایلێکی کلاسیکییە، بۆ سەرەتای سەردەمی نوێ دەگەڕێتەوە، ئەسکلیپیۆس لای چەپی وێنەکەیە وگۆچانی هیرمیسی هەلگرتووە. گالینۆسیش ئێسکە پەیکەرێک دەپشکنێت.

زانکۆکانیش لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە دامەزراوە پزیشکییە گرنگەکان بوون. کۆلێژی پزیشکیی سالیرنۆ کە مێژووی دروستبوونی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی یازدە، هەر بە ناوەکەیەوە دیارە کۆلێژی ڕاهێنانی پزیشکان بووە. دوای

دوو سـەدە زانكـۆیەكی تـر كـرایەوە. لە هەمـان كاتـدا لە تەواوی ئەوروپا زۆر زانكۆی تر دامەزرا، دەسپێك زانكۆی پۆلۆنیـا (سـاڵی ١١٨٠ دامەزرا)، بە دوایـدا چەنـد زانكـۆیەك دامەزران، وەكـو زانكـۆی پـاریس (سـاڵی ١٢٠٠) وزانكـۆی ئۆكسـفۆرد (سـاڵی ١٢٠٠) ، زانكـۆی سـەلامنكا دەوروبەری (سـاڵی ١٢١٨ ز). تـاكو سـەدەی پـازدەی زایینـی، ٥٠ زانكـۆ دامەزرا، بە باكور و باشور ورۆژهەڵات ورۆژئاوای ئەوروپا دا دابەش بووبـــوون. زانكۆكـــان چەنـــد فـــاكەڵتییەكی جۆربەجۆریان لەخۆگرتبوو، زۆربەیان لەسـەرەتاوە كۆلێژی پزیشـكییان تێدابوو یـان لەفراوانكردنـی زانكـۆكەدا كـۆلێژی پزیشكییان تێدا دەكرایەوە، ئینجـا كۆلێژی هـونەر وفەلسـەفە (دەتوانین بڵێین بەشـێوەی زانسـتی دەخوێندران) وتیۆلـۆژی وكۆلێژی یاسا كرایەوە. هەرچەندە كۆلێژەكانی پزیشكی زۆر بچـووك بـوون، وە ژمـارەی دەرچووەكـانیش كەم بـوون، بەڵام كـاری پزیشـكی لە رێـگەی فێركـارییەوە لە دایكبـوو وپزیشـــكی پێدەگەیانـــد، گەوهەر و بنەمـــای ئەم زانســـتە " پزیشكیی كتێبخانەكان" بوو، چونكە لەسـەرەتاوە وانەوتنەوە پشـتی بە نووسـەرە كلاسـیكی و ئیسـلامییەكان دەبەسـت، گفتوگۆكـــانیش ڕووبەڕوو ئەنجـــام دەدران، نەك لەســـەر بنەمای ئەزمون وراهێنانی پراكتیكی.

یەكـــێ لە دەرەنجـــامە رێكخراوەكـــان بـــۆ دەرچـــووە نوێیەكـانی زانكـۆ، بە فەرمـی كردنـی پلەبەنـدیی پیشـەی پزیشكی بوو لە ناوەندە پزیشكییەكاندا تـا سـەدەی نۆزدەی زایینی پێڕەو دەكرا. خەرجی قورس و درێژخـایەنی زانكۆ كە بەخشندانە پیشكەش بە فێركار دەكرا، پێگەیەكی باڵای ئەوتـۆ بـوو كە پزیشـكەكان شـانازییان پێـوە دەكـرد. (تـا دەیەی

رابــردوو، ئەوانەی دەبــوونە هــاوەڵی کــۆلێژی پزیشــکی پاشایەتیی بەریتانی نەیاندەتوانی پەنا بەرنە بەر دادگا تاکو پــارەی مانــدووبوونەکەیان وەربگــرنەوە) لەبەر پێگەکەیــان لایـان نەنگ بـوو کـاری دەسـتی ئەنجـام بـدەن، ئەوە کـاری برینکـار و عەتـارە دەرمانســازەکان بـوو، ئەو دوو پیشــەیە وەکو پیشـە بوونیان هەبوو، بەڵام لەگەڵ هـاتنی زانکۆکانـدا، ئەو برینکــار ودەرمانســازانە لە ڕێــگەی ڕاهێنــانی پیشــەیی زانســتییەوە، یــان لە ڕێــگەی نــافەرمییەوە لەژێردەســتی پیاوێکی بەتەمەنی شـارەزا وکارامە بە پیشـەکە فێردەکران، ئەمەش پێڕەوێکی هیپۆکراتی بوو، پێگەیەکی کۆمەڵایەتی و ئــابوریی هەبــوو، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ توانــای پزیشــکە گەورەکــان کە توانــای خوێنــدنەوەیان هەبــوو بە لاتینــی و گفتوگــۆی چڕوپڕیــان ڕووبەڕوو ئەنجـام دەدا ســەبارەت بە کتێبەکـــانی گـــالینۆس و ئیـــبن ســـینا، ئەم پیشـــەوەرە کۆمەڵایەتییــانە بەراورد بەو پزیشــکانە لە ئاســتێکی نزمــدا بــوون. بێگومــان هەنــدێ لە نەشــتەرگەرەکان باکگراونــدێکی زانکۆییــان هەبــوو، لەنێــو ئەو دەرمانســـاز و برینســـازانە هەنــدێکیان خــاوەنی ســامان و زانیــاری بــوون. هێڵێکــی جیــاکەرەوەی نەگــۆڕ لەنێــوان پزیشــک و نەشــتەرگەرو دەرمانســازەکاندا نەبـوو. لەلادیکانـدا زۆرێـک لە پزیشـکەکان خۆیــان دەرمانیــان دەگـرتەوە ونەشتەرگەریشــیان دەکــرد، ئەمــانە شــوێنی پزیشـکە گشـتییە کارامەکانیـان گرتبـووەوە، بەڵام لە شــوێنە شارســتانییەکاندا کۆلێژەکــان و پەیوەنــدی پزیشــکان و دەســتەی خوێنــدنی بــاڵا، پارێزگارییــان لەو جیاوازییـــانە دەکـــرد و ڕێکیاندەخســـتنەوە. زۆر جـــار نەشـتەرگەرەکانی شارنشـین دەسـتەی تایبەتیـان بەیەکسـانی

لەگەڵ پیشەوەرانی تردا بۆ پیشەی دەستی دروست دەکرد، وەکو قەسابەکان، نانەواکان یان مۆم دروستکەران. پرۆسەی ڕێکخستنی پزیشکی ڕێکوپێک نەبوو، بەڵام وێنەی سێ پلەبەندییەکە وەکو بەشێک لە تێڕوانینی کۆمەڵایەتی مایەوە، تاکو گۆڕانکارییەکانی دواتر لە مەعریفەی پزیشکی وایکرد پزیشکەکانیش بتوانن پێشکەشی بکەن.

## دۆزینەوەی توێکاری

گالینۆس و نووسەرە کۆنەکانی تر ونووسەرە عەرەبەکان، زۆریان دەربارەی ئێسکە پەیکەر وفرمانە ناوەکییەکانی لەشی مرۆڤ نووسیوە. لەو کاتەوە کرداری توێکاری بەیناوبەین ئەنجام دراوە- بەزۆری لە کاتی مردنی کەسایەتییەکی ناودار لە پڕێکدا یان لە هەلومەجێکی گوماناویدا. بەکردنەوەی ئەو جەستەیە وردەکاری زۆریان بۆ دەردەکەوێت. هەنگاوێکی بوێرانە بوو کاتێک کۆلێژەکانی پزیشکی هێواش هێواش بەشێوەی ئاشکرا لەسەدەی چواردەدا توێکاریی جەستەیان دەخستە بەرچاوی قوتابییەکانیان، ئەوەی بە هەڵدڕین و کەوڵکردنی لاشەکە هەڵدەستێ پزیشک نییە بەڵکو پێگەیەکی نزمتری هەیە (زۆرجار لاشەی تاوانبارێکە کە لە سێدارە دراوە) بەڵام پرۆفیسۆرەکە دێت ئەو برگانەی کە پەیوەندی بە کتێبەکانی گالینۆسەوە یان شارەزاکانی ترەوە هەیە لەم بوارەدا بۆ قوتابییەکانی باسدەکات. توێکارییەکان لە وەرزی زستاندا دەکران چونکە لاشەکە بە ئاسانی شیتاڵ نەدەبووەوەو بۆگەنی نەدەکرد. هەروەها ڕێکخستنی دەستنیشانکردنی بەشەکانی لەش بە پێی باسکردنەکان بەڕێوە دەچوو و

لەگەدەوە دەستی پێدەکرد، ئینجا پێکهاتەکانی سینگ وئینجا مێشک و دواتر بە پەلەکان کۆتایی دەهات.




(٥) گالینۆس لەکاتی کارکردنندا. ڕوونکردنەوەی ئەم نموونەیە بۆ سالّی ١٥٦٥ ز دەگەڕێتەوە، لەڕاستیدا بەشێک لەزانیارییەکانی گالینۆس لە توێکاریی بەرازەوەیە، هەرچەندە زۆربەی وێنەی کەسایەتییە کلاسیکییەکان بەشێوەیەکی ڕوون دەرنەکەوتوون، بەلاّم ئەم کارە گوزارشت لەکرداری توێکاری ئاشکرا دەکات لە سەردەمی ڕینیسانسدا.

یەکەم کاری توێکاریی ئاشکرا دەوروبەری سالّی ١٣١٥ ز لە پۆلۆنیا، بەڕێبەریی مۆندینۆ دی لیۆزی[7] (١٢٧٠-١٣٢٦ز) تۆمارکرا. هەروەها یەکەم کتێبی تایبەتی بە زانستی

7 Mondino de Liuzzi.

توێکاریی نوێ لە ساڵی ١٣١٦ز نووسی. نزیکەی سەدەیەکی خایاند تاکو کرداری توێکاری بەڕێژەیی بووە بابەتێکی باو؛ لەبەرئەوەی بەدەستهێنانی تەرمی مردوویەک کارێکی هێندە ئاسان نەبوو، زۆربەی بوارە فێرکارییە پزیشکییەکانیش لایەنی تیۆری بوون زیاتر لەوەی پراکتیکی بن. بەڵام لەسەدەی پازدەوە هەنگاوەکان خێراتر دەچوونەپێش، کاری توێکاری زۆربوو، نووسراوە تایبەتەکانیش سەبارەت بە زانستی توێکاری مرۆیی بەهەمانشێوە زیادیانکرد؛ هونەرمەندانی سەردەمی ڕینیسانسیش دەیانەویست شێوەی لەشی مرۆڤ لەناوەو دەرەوە لەکارەکانیاندا ڕەنگبداتەوە، هێڵکارییە توێکارییەکانی لیۆناردۆ دافینچی (١٤٥٢- ١٥١٩ز) دیارترین ئەو هێڵکارییانەی ئەو سەردەمەن، بەڵام زۆرناسراو نەبوون و شوێنەوارێکی ئەوتۆیان بەجێنەهێشت.

مەزنترین زانای توێکارناسییە کۆنەکان، ئەندریاس فیزالیۆس (١٥١٤- ١٥٦٤ز)[8] بوو، لە بەلجیکا لەدایکبووە وپایەی پرۆفیسۆری نەشتەرگەری وتوێکاری لە پادوا هەبوو، دانراوە مەزنەکەی (هەیکەلی لەشی مرۆڤ: ١٥٤٣) یەکەم کتێبی پزیشکیی گرنگ بوو، وێنەی ڕوونکردنەوەی بەشەکانی لەش تێیدا، لە ئەهمییەتی دەقەکە خۆی بەبەهاتر بوو. فیزالیۆس- نەک هەر خوێنەری دانراوەکانی گالینۆس بوو، بەڵکو خۆشی توێکارکارێکی بەجۆش وخرۆش بوو، گوتی، جەستەی مرۆڤ هەمیشە بەوشێوەیە نییە کە گالینۆس باسی دەکات. پێش ئەویش هەمان تێبینی هەبووە، سەرەتا فیزالیۆس بەشەرمەوە ئەوەی گوت، بەڵام کاتێ

8 Andreas Vesalius.

متمانەی تەواوی بەخۆی پەیداکرد، بەهێزیکی زیاترەوە هاتە گۆ ولەچەند لاپەڕەیەکدا لە کتێبە مەزنەکەی ئاشکرایکرد- دیواری ماسوولکەی دڵ لەنێوان سکۆڵەی ڕاست وسکۆڵەی چەپ ئەستوورە، بەجۆرێک خوێن ناتوانێ بیبڕێت، بەپێی فسیۆلۆجیای گالینۆس.

هەروەها جگەری مرۆڤ لەچوار یان پێنج بەش پێکنەهاتووە، هەر بەپێی بۆچوونەکەی گالینۆس(لەڕێگەی بەشبەشکردنی بەراز وگیانەوەرانی ترەوە). بۆیەکەمجار فیزالیۆس وەسفێکی وردی کۆڵەکەی سینگ، مناڵدان، وپێکهاتە توێکارییەکانی تر دەکات.




(٦) جگە لەوێنە بەناوبانگەکانی بازووی پیاوانی بەهێز، وێنەکانی کتێبی فیزالیۆس (پەیکەری لەشی مرۆڤ) لە ١٥٤٣- چەند بەشێکی تر لە جەستەی مرۆیی، بەشێوەیەکی کاریگەر نمایش دەکات.

ئێمە مێژووی توێکاری بۆ پێش فیزالیۆس و دوای ئەویش دابەش دەکەین، ڕاستە فیزالیۆس پایەیەکی گرنگی هەیە. بەڵام ڕەنگە وەسفی کاریگەری وگرنگیی ڕاستەوخۆی کتێبەکەی زیادڕەوی تێدابێت. لەبەرئەوەی پادوا و زانستی توێکاریی بەجێهێشت، لەپێناوی کارێکدا کە تەنها بەرژەوەندیی تایبەتی خۆی تێدا هەبوو، بۆ ئەو مەبەستە چووە کۆشکی پادشای ئیسپانیا. لەسەرەتای سەدەی شازدەی زایینییەوە، شۆڕشی توێکاریی لەشی مرۆڤ، چووە قۆناغێکی بالاترەوە، خەڵکەکە ویستیان خۆیان مەسەلەکە بەچاوی خۆیان ببینن، لەجیاتی ئەوەی متمانەی تەواویان بەوانەی پێش خۆیان هەبێت.

بۆماوەی سێ سەدە زانستی توێکاری لەسەر عەرشی زانستی پزیشکی مایەوە، بەڵام ئەوەندەی ئامێری چاپەمەنی کە هاندەری گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی وکولتووری بوو، بەسوود نەبوو. دەستپەنگینی ئەڵمانی یۆهان گۆتنبرگ (١٤٠٠- ١٤٦٨ز) ، ئامێری چاپەمەنی بەپیتی جولاو لە ١٤٣٩ هێنایە ئەوروپاوە (لەڕاستیدا چینییەکان پێشتر هەیانبوو). ئەم ئامێرە گۆڕانکارییەکی زۆر مەزنی بەسەر مرۆڤایەتیدا هێناو لە هەموو ڕوویەکەوە، مرۆڤ قەرزاری ئەو داهێنانەیە. لەسەرەتای داهێنانی هونەری چاپەمەنییەوە، بەشێکی بەرچاوی کتێبە پزیشکییەکان لە چاپکردندا (لە پێش ساڵی ١٥٠١)ەوە بەخت یاوەریان بوو. ئەگەر ئینجیل وئەو دانراوانەی پەیوەندییان بە زانستە ئاینییەکانەوە هەیە لەگەڵ چاپی نوێی نووسەرە کۆنەکان و وەرگێڕانە تایبەتەکان بەوان، لە پێشی پێشەوەبن. ئەوا ئەو سەردەمە ڕێخۆشکەربوو بۆئەوەی کتێب لە سنوورێکی بەرفراواندا

چاپ بکرێت، تەنانەت پزیشکە ئاساییەکانیش توانییان بەشێکی لێ بچننەوە.

لەپاڵ تێکستەکانەوە، نەخش و نیگاری لەدار هەڵکۆڵراو هاوشانی وێنەی ڕوونکردنەوەکان دادەنرا، واتە خوێنەر تەنها دەربارەی لەشی مرۆڤ شتی نەدەخوێندەوە بەڵکو بەشەکانی لەشیش بە وێنەوە لەسەر لاپەڕەکان خرابوونە پێشچاو. کتێبی پەیکەری لەشی مرۆڤ، لە دانانی ڤیزالیۆس، یەکەم کتێبی توێکاری نەبوو بەوێنەوە، بەڵام پێوەرێکی ستانداردی نواندنی هونەری درامیی گرنگ بوو، جگە لەوەی لە ڕووی توێکارییەوە وردەکاری زۆری تێدابوو. چەند سەدەیەک دوای ئەوە، لە سەرەتای چەرخی نوێی پزیشکیدا کتێبە توێکارییەکان پارادۆکسی قووڵیان خوڵقاند؛ توێکاری بووە لایەنێک لە چالاکی پزیشکیی ئەوتۆ، لەڕووی مۆراڵییەوە مایەی شەرمەزاریی زۆربەی بەشەکانی جەماوەری خەڵکبوو، سوکایەتیکردن بوو بەمرۆڤ، قێزەون و وەحشیگەرانەبوو، چونکە لەکۆتاییدا ئەوەش بووە هۆی سەرهەڵدانی بازرگانیی نهێنی، لەڕێگەی دابینکردنی تەرمەوە بەڕێگەی نایاسایی، هەڵکەندنی گۆڕەکان و دزینی مردووەکان بوونە دیاردە، تەنانەت جاری واهەبوو کوشتنی مرۆڤی ئاسایی لە پێناو دابینکردنی مردوو بۆ سەرتەختەی توێکاری بووە دیاردەیەکی قێزەون، مردووەکان لەپرۆسەی توێکاریدا، پێش گەشەکردنی شێوازی پاراستن بە مادەی کیمیاوی، تەرمەکان بۆنێکی ناخۆشیان هەبوو، یان بۆگەنیان کردبوو، بۆنە تیژەکەی فۆرماڵدیهاید کە مادەیەکە مرۆڤ ئێڵنجی پێدێت، لاشەکانی لە بۆگەنکردن دەپاراست. خوێندکارانی پزیشکی کاتێ بەشەقامدا ڕێیاندەکرد، بەئاسانی

بەوە دەناسرانەوە کە جلەکەیان تەنانەت پێستەکەشیان بۆنی فۆرمالینی لێدەهات.



(٧) ئەم نەخشە ڤیکتۆرییە، لەلایەن ستراداتۆسەوە لەسەر دار هەلکۆلراوە، مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دەوروبەری ١٥٨٠ز- باسی قۆناغە جیاجیاکانی بەرهەمهێنانی کتێب دەکات، بەدانانی پیتی تایپ، بە مەرەکەب و چاپکردن لەسەر پەڕەی کاغەز لەگەڵ کاری وردبینی لە کاتی چاپکردندا.

بەمجۆرە تویکاری بەشێوەیەکی گشتی لە کاری پزیشکیدا ناشیرین بوو، هەروەها بابەتی کتێبی قەبە وگرانبەهای قەشەنگ وکوالیتی بەرز بە وێنە وهێڵکاری و ڕوونکردنەوەی پێویستەوە، بازاڕی فرۆشگا گەورەو پیاوە شارەزاکانی بازاڕی گەرمتر کرد. بەلام خوێندکارانی پزیشکی کتێبی بچووکی کوالیتی خراپ و هەرزان بەهایان

دەدانی، هیچ پسپۆرییەکی تر نەبووە هونەروزانست، یان مەعریفەوە وێنەو هێلکاری بە ئەندازەی زانستی توێکاری، پێکەوە ببەستێتەوە. تەنانەت پزیشکەکانیش لە خولی خۆسازکردندا زیاتر پەنایان دەبردە بەر توێکاریی تەرمی مردوو، بەمەبەستی خۆهەڵقورتان تا ببنە قارەمان.
لەسەرەتای سەردەمی نوێدا ناوی درەوشاوە زۆرن لە بواری توێکاریدا کاریان کردووە لەوانە: گابریل فالۆپیۆ[9] (١٥٣٢-١٥٦٢ز)، فابریکیۆس ئاب ئەکواپێندێنت[10] (١٥٣٣-١٦١٩ز)، فریدریک رویچ[11] (١٦٣٨- ١٧٣١ز)، ویلیام چیسێلدن[12] (١٦٨٨- ١٧٥٢ز)، ویلیام هانتەر[13] (١٧١٨-١٧٨٣ز)- ئەمانە پەیوەندیین بە نەشتەرگەرییەوە یان پزیشکی مندالبوونەوە هەبوو. هەروەها هەندێ لە پزیشکەکان ئەوەدالێی مەعریفەبوون لە نموونەی ولیام هارڤی[14] (١٥٧٨- ١٦٥٧ز) ئەوانیش لە لێکۆڵینەوەکانیاندا دەستیان بەکاردەهێنا. نووسینە بەنرخەکانی هارڤی لە (١٦٢٨) لەژێر ناونیشانی "راهێنانی توێکاری) سووڕی خوێنی لە "جوڵەی دڵدا" ئاشکراکرد.
لەبەرئەوەی سروشتی کاری پزیشکی (تەنانەت نەشتەرگەری) لەو سەردەمەدا، سەبارەت بە توێکاری، زانیارییە تیۆرییەکانیان لە بواری پراکتیکدا زۆر لەسەرووی

---

9 Gabriele Fallopio.
10 Fabricius ab Acquapendente.
11 Frederik Ruysch.
12 William Cheselden.
13 William Hunter.
14 William Harvey.

تواناکانیانەوە بوو. بەڵام لە ڕاستیدا پێچەوانەکەی ڕاستە، بەشەکانی جەستە دیار وئاشکران، بۆیە ڕێککەوتن سەبارەت بە پەیکەری توێکاری ئاسانترە لەڕێکەوتن لەسەر وردەکاری تیۆری. زانستی توێکاری لەزۆر بواردا پێشکەوتنی بەرچاوی بەخۆیەوە بینیوە، کاتێ پزیشکەکان بە ڕێکوپێکی باسی بەشە نوێیەکانی جەستە دەکەن، وەکو بۆرییە شیربەرەکان، زمانەی خوێن هێنەرەکان، یان سووڕی ویلیس کە خاڵی پێکگەیشتنی خوێنبەرەکانە لە بنکەی مێشک، ئەم خوێنبەرانە خوێنی پاک بۆ مێشک دەبەن و بەناوی تۆماس ویلیس (١٦٢١- ١٦٧٥ز)ەوە ناونراوە. لەسەرەتاکانی سەدەی حەڤدەیەمدا، بەشێک لەو ئەنەتۆمییانەی لەگەڵ گالینۆسدا جیاوازییان هەبوو، لە "جەنگی کتێبدا" لەو گفتوگۆ بەرفراوانەی هەموو لایەنەکانی مەعریفەی سروشتیی گرتەوە، ئەو پرسیارەیان لا گەڵاڵە بوو سەبارەت بەوەی ئایا کۆنەکان یان تازەکان زیاتر هەستیان بەو جیهانە کردووە کە ئێمەی تێدا دەژین، دەرەنجام توێکاریزانی یەکێک بوو لەو بوارانەی تازەگەرەکان سەرکەوتنێکی ڕاستەقینەیان تێدا بەدەستهێنا.

## پزیشکیی سەرجێگا لەنێوان کیمیاگەر و فیزیاگەرەکاندا

ئەو ئازادییەی بۆ لێکۆڵەران ڕەخسا تا خودی خۆیان بەدواداچوون بۆ کەیسەکان بکەن، چەند لایەنێکی پزیشکیی گرتەوە، سەرەڕای فەلسەفەی سروشتی. ڕینیسانس هاوزەمان بوو لەگەڵ ئەو ماوەیەی مێژوونووسان لەم دواییانەدا ناویان لێنا سەردەمی "شۆڕشی زانستی" کە کاریگەریی لەسەر کاری پزیشکی و گەردونناسی و زانستی

فیزیک و زانستەکانی تر دانا. ئەو دوو زانستەی زۆر لە نیزیکەوە کاریگەریی بەهێزیان لەسەر زانستی پزیشکی هەبوو، کیمیا وفیزیا بوون.

بزووتنەوەی کیمیای پزیشکی لەسەردەستی بلیمەتێکی سویسری ڕەفتار نامۆ، پاراسیلسۆس (١٤٩٣- ١٥٤١ز) سەریهەڵدا، ئەو ناوە لای شوێنکەوتووانی ناوێکی ناسراوبووە، بەڵام ناوی ڕاستەقینەی سیۆفراستەس فیلیپوس ئۆریۆلەس بۆمباستۆس ڤۆن هۆهنهایمە، ناوەکە زۆر درێژە بەڵام هەندێ گێرانەوە دەڵێن بە ئەنقەست ئەو ناوەی داناوە، تابڵێن لە " لە سیلسۆس مەزنترە" (سیلسۆس نووسەرێکی ڕۆمانییە خاوەنی کتێبی، کورتە باسێکی گرنگ سەبارەت بە پزیشکی) یە، باوەڕوایە ڕۆمانێکی ئەفسانەییە، بەڵام دوو تایبەتمەندیی سەرنجڕاکێشی تیدایە، کاریگەرییان لەسەر بوارە پیشەییە ڕاڕاکەی داناوە، پەرۆش بووە سەبارەت بەو فاکتەی پیشەی پزیشکی و "زانست" دەبێ جارێکی تر سەر لەنوێ لەلایەن پیاوانی تازەگەر ومۆدێرنەکانەوە دابڕێژرێنەوە، پێیوایە پەند و نووسراوەکانی هیپۆکرات وگالینۆس ئیتر هیچ سوودێکیان نییە، کاتێک پلەی وەزیفی مامۆستای زانکۆبوو- زانکۆی بازل Basel، بەئاشکرا وەکو بەرهەڵستکارێکی دەستپێشخەر، یەکێک لە کتێبەکانی گالینۆسی سووتاند. هەرچەندە ڕەنگە پاراسیلسۆس بەدووربێت لەوەی لە هەر قۆناغێک لە قۆناغەکانی ژیانیدا چووبێتە سەر ڕێبازی نوێی پرۆتستانتی، بەڵام ئاشکرایە گڕی ئاگری ئەو شۆڕشە ئایدیایی و سۆزدارییەی کە جوڵانەوەی مارتن لۆسەر بە فەرمی لە سەردەمی سەرەتای ژیانی پاراسیلسۆسدا

هەڵیکرد، کاریگەریی لەسەر داناوە. پاراسیلسۆس زیاد لەجارێک وتوویەتی سەرچاوەی فێربوون سروشتە نەک کتێب، ئەم بۆچوونەی ڕێگر نەبوو لەوەی دەیان کتێب بە چاپ بگەیەنێ، زۆربەی کتێبەکانیش لە ژیانی خۆیدا بە چاپ گەیەندراون. ڕەنگە لە ڕاستیدا مەبەستی ئەوەبووبێت، سەرچاوەی فێربوون کتێبەکانی ئەوە، نەک ئەوانەی پێش خۆی.بەشداری دووەمی کە کاریگەرییەکەی هێشتا بەسەر کیمیاوە ماوە، ئەوەیە کە کیمیاگەری ڕێگەیەکە بۆ تێگەیشتن لە چۆنێتی کاری لەشی مرۆڤ، وسەرچاوەیەکە بۆ دەرمانی پێویست لە چارەسەری نەخۆشیدا، ئەو وتی کانزاکان وەکو جیوە وزەرنیخ بە ئەندازەی ئامادەکراوە ڕووەکییە ئاساییەکان لە چارەسەرکردندا بەکاردێن، شوێن کەوتووانیشی (پسپۆرانی پزیشکی کیمیایی) هەمان ڕێبازی ئەویان گرتەبەر. زۆرجار بیروباوەڕەکانی سەبارەت بە نەخۆشی باسدەکرا، بەوەی نەخۆشی لەدەرەوەی لەشەوە دێت، ئەم بیرۆکەیە لە ڕاستیدا لە بیرۆکە کیمیاییە نادیارەکانەوە وەری گرتبوو سەبارەت بە ڕەوتی سروشت، بەڵام هەڵەیە ئەگەر بڵێین ئەو پێشەنگی تیۆریزەکردنی میکرۆبی نەخۆشی بووە. سەبارەت بە بۆچوونی ئەو پیاوە ڕەفتار نامۆیە مەسەلەکە تەنها لەو سنوورەدا قەتیس نەبوو بوو کە جەدەلەکەی لە ژیانی خۆی و دوای ژیانی خۆیدا وروژاند؛ شوێنکەوتووانی کە زۆربوون هەوڵیاندا ( ماوەی نزیکەی سەدەیەک ) نووسینەوەی تیۆری پزیشکی و پراکتیکی پزیشکی بە زمانێکی کیمیایی بنووسنەوە.

دوای ماوەیەکی کەم گروپێکی تر لە کۆمەڵەی یەکەم دەرکەوتن، ئەمانیش پسپۆری پزیشکی فیزیکی بوون، لەژێر

سایەی ئەو سەرکەوتنانەی کە گەردونناسی و فیزیاناسی بەدەستی هێنا، پێیانوابوو، جەستە ئامێرێکی میکانیکیی سەرسوورهێنەری داهێنەرە. لە کاتێکدا پسپۆرانی کیمیای پزیشکی کرداری هەرس کردنیان بە پرۆسەیەکی کیمیایی دادەنا، پسپۆرانی فیزیکیش کرداری هاڕینی خۆراکیان بە پرۆسەیەکی میکانیکی دادەنا. دواتر لایەنگرانی فیزیکی بەوە مەسەلەی هەرسکردنیان بەجووڵەی ماسوولکە دەزانی ئەو جووڵەیە لەلایەن هێزی گرژبوونەوەی ماسولکەوە دروست دەبێت، تا توانییان هەوڵیاندا زانستی فیزیکیی جەستە بە بیرکارییەوە ببەستنەوە. لە زانایانی ئەو ڕێبازە گالیلۆ ونیوتن بوون، لەجیاتی تێڕوانینی ئەرستۆ بۆ گەردوون نموونەیەکی زۆر بەهێزتریان هێنایە بەرباس ئەویش ئەوە بوو مادە و هێز دوو فاکتەری کاریگەرن پێوەری خۆیان هەیە، لە ماوەی سەدەی هەژدەی زاینیدا بیرۆکەی نیوتن سەبارەت بە کێشی زەوی لەوەدا بوو ئەو هێزەیە لە سەرتاسەری گەردونندا لێکدانەوەی زۆری بۆکرا، ئەمەش پزیشکە توێژەرەکانی هاندا هەڵوێستی هاوشێوە لە کاری پزیشکیدا بگرنەبەر.

لەم سەردەمەدا پەیوەندییەکی نوێ لە پرسی توێژینەوە دەستی پێکرد و لە بواری پزیشکی و"زانست"دا پڕبوون لە چالاکیی مەزن؛ تیۆری زۆر سەریهەڵدا و ڕێگاکە زیاتر ڕوناک بووەوە، گۆڕانکاریی ڕیشەیی لە ڕێبازی تێگەیشتن لە نەخۆشی و تەندروستی ڕوویدا، بەڵام گۆڕانکاری لە شێوازی چارەسەری پراکتیکیی نەخۆش لەلایەن پزیشکەوە، کاریگەرییەکی کەمی هەبوو. گومانی تێدا نییە ئەو مادە کیمیاییانەی بارسیلسۆس و شوێنکەوتووانی هێنایانە ناوەوە،

تازە بوون. دوای بڵاوبوونەوەی سیفیلیس، جیوە شوێنێکی تـایبەت و بەرچـاوی هەبـوو. لە سـاڵی ١٤٩٠ لەڕێـگەی ڕەشـەباوە سیفیلیس هەموو ئەوروپای تەنییەوە، سـەرەتای دەرکەوتنـی لە نـاپۆلی بـوو، کـاتێ هەنـدێ بەکرێگیـراوی ئیسـپانیا بە هـاوڕێتیی کۆلـۆمبس چـوونە جیهـانی نوێـوە، دەرەنجـامی سروشـتی ئەو گەشـتە ئەو ئەگەرە بـوو، کە کۆلۆمبس و هاوڕێکانی لەگەشتەکەیاندا نەخۆشییەکی نوێیان لەگەڵ خۆیانـدا هێنـا. تـا ئێسـتا ئەم ئەگەرە لە نێـوان مێژوونوسـەکاندا مـایەی گفتوگـۆکردنە، بەڵام دڵنیـابوون لە ڕاسـتییەکان ئەوەیە، نەخۆشـی سـیفیلیس لە کۆتاییەکـانی سـەدەی چـوارده وسـەرەتای سـەدەی پـازدەدا، شـێوازی نەخۆشـیی نـوێی وەرگـرت لە ڕووی دژواری و خێرایـی بڵاوبـوونەوەیەوە. لەبەرئەوەی ڕووی پێسـت بەهـۆی نەخۆشـی سیفیلیسـەوە تووشـی پەڵە دەبـوو، جیوەیـان بـۆ چارەسـەری ئەو نەخۆشـییە بەکاردەهێنـا کە لە چارەسـەرە نەگۆڕەکـانی نەخۆشـی پێسـت بـوو و لە هێـور کـردنەوەی نیشـانەکاندا کـاریگەری زۆری هەبـوو، گەرچـی هەنـدێ کـاریگەریی لاوەکیی لەسـەر نەخۆشـەکان هەبوو لەشێوەی کاریگەریی ژاراوی بوون وەکو ڕژاندنی لیک، کەوتنی دان، هەناسـەی نەخۆشـەکە بـۆنی کـانزای لێدەهات بەجۆرێـک شـاردنەوەی سـەخت بـوو، لەگەڵ چەنـد نیشـانەیەکی تـر. هەرچەنـدە پاپاکـان و هونەرمەنـدان و پزیشـکەکان تووشـی ئەم نەخۆشییە بووبوون بەڵام سەرەتا گومان هەبوو لەوەی لەڕێگەی پەیوەندیی سێکسییەوە ئەم نەخۆشییە بگوێزرێتەوە (چونکە ئەو کێشـانەی تووشـی کۆئەنـدامی زاوزێ دەبـوون، یەکەم نیشـانەی نەخۆشـییەکە بـوون) و خێـرا تـوێکڵە داری

گوایاکام کە دارێکی پیرۆزە لە ئەمەریکای باشور بۆ ئەم نەخۆشییە بەکار دەهێنرا، باشترین چارەسەر بوو بۆ ئەوانەی دەیانتوانی بیکڕن، باوەڕ وابوو بیرۆکەی چارەسەری نەخۆشی سیفیلیس لە دونیای نوێوە هاتووە، بە پشتبەستن بەو گریمانەیەی دەیوت، خودا چارەسەری مرۆڤی لە نزیکترین سەرچاوە لەخۆیەوە داناوە، تا بە دوایدا بگەڕێین.




(٨) جیاوازی نێوان پێگەی کۆمەلایەتی وپیشەی پزیشکی بۆ هەریەکە لە نەشتەرگەر و پزیشک لە ساڵی ١٦٤٦ز دەردەخات. لەم دوو دیمەنەدا، پزیشک بە جلی فەرمییەوە لەلای چەپ دەرمان دەداتە ئەو نەخۆشەی لەسەر جێگەکە ڕاکشاوە، لای ڕاستیش نەشتەرگەرێک دەبینرێت کە قاچی پیاوێک دەبڕێتەوە.

لەگەڵ ئەوەی نەخۆشـییەکان تـازەن وچارەسـەرەکانیش تازەن، بەڵام زۆربەی شێوازەکان لە ڕێبازی هیپۆکرات لایان نەداوە، خوێنگرتن یان کەڵەشاخ، مـادەی ڕشـێنەرەوە، مـادەی دژە قەبـزی و کـۆمەڵەی چارەسـەری ڕێبـازی تێکەڵەکـان، ئەمـانە ئەو کـۆڵەکە بنەڕەتییـانەبوون پزیشـکەکان پشـتیان پێیـان دەبەسـت. لە ڕاسـتیدا لەگەڵ ئـاوابوونی ئەسـتێرەی گالینۆس، هێشـتا ئەسـتێرەی هیپـۆکرات درەوشـاوەیە. لەنێو پسپۆرە کلینیکییەکـانی سـەدەی حەڤدەهەمدا هێشـتا تۆمـاس سـیدنهام (١٦٢٤- ١٦٨٩ز) جـێگەی ڕێـزە ونازنـاوی "هیپۆکراتی ئینگلیزی" یان پێبەخشیوە، ئەم پزیشکە هەوڵیدا کاری پزیشکی بگەڕێنێتەوە بۆ هـونەری ئەزمـونگەری کە بە باوکی پزیشکی ناوی دەبات. هەروەهـا نوسـیویەتی پێویسـتە کـاری پزیشـکی گرنگـی بـدات بە وەسفی کلینیکی، ئەوەی لە زاری نەخۆشـەکەوە دەدرکێنرێـت ( وردەکـاریی چەنـد نەخۆشـییەکی باسـکردووە وەکـو نەخۆشـیی جومگەکـان، هیسـتریاو ئـاوڵە). لەڕێـگەی دەستنیشـانکردنی ڕاسـتەقینەی نەخۆشـییەکەوە، دەتوانرێـت چارەسـەرکردنەکە بەپێـی ئەزمونەکـان بێـت. سـیدنهام ڕۆڵێکـی گرنـگ و بنەڕەتـی لە بەکارهێنـانی چارەسـەرێکی تـر لە جیهـانە نـوێیەکەدا گێـڕا، ئەویش کینین بوو (نیانی درەختی پیرۆ یان نیانی درەختی پیرۆز)، کینین لەچارەسەری نۆرەتادا بەکاردەهێنرا.

نیانی درەخت و توێکڵی پیرۆ بەپێی ئەزموونی سیدنهام گۆڕانێکی بنەڕەتی سـەبارەت بە نەخۆشـی هێنـایەوە کـایەوە، هەرچەندە ناکۆک نەبوو لەگەڵ تێکەڵەکانی هیپـۆکرات، بەڵام کینـین بە تەواوی نۆرەتـای بنبـڕ کـرد، ئەم چارەسـەرە تایبەتمەنـدە بەوە جیـادەکرایەوە، لە بەرەنگـاربوونەوەی ئەو

کێشانەی لای هەموو نەخۆشەکان سەرهەڵدەدەن، گرنگییەکی بەرچاوی هەبوو. ئەم دۆزینەوەیە بووە هۆی ئەوەی سیدنهام کار لەسەر پۆلێن کردنی نەخۆشییەکان بکات، هەرچۆن ڕووەکناسەکان جۆری ڕووەکەکانیان پۆلێن دەکرد. جیاوازی نەخۆشییەکان و نیشانەکانیان لەنێو تاکەکاندا دەرخستەیەکی کتوپڕبوو، ئەم جیاوازییە هاوشێوەی جیاوازیی نێوان گوڵەکانی وەنەوشە وگوڵەکانی ترە. لە وتە بەناوبانگەکەیدا سیدنهام دەڵێ:

سروشت لەبەرهەمهێنانی نەخۆشیدا بەشێوەیەکی یەکسان، یەک جۆر نیشانەی نەخۆشی لەکەسە جیاوازەکاندا بەرجەستە کردووە، دیاردەی نیشانەکانی نەخۆشییەکە لە پێگەیەکی بەرزی وەکو سوکراتەوە بۆ نەخۆشێکی ئاسایی، هەمان دیاردە و هەمان نیشانەن.

دەبینین بۆچوونەکانی سیدنهام خاڵی گۆڕانکاریی بنەڕەتین لە ڕەوتی نەخۆشی سەرجێگا یان ڕەوتە کلینیکییەکان، نەوەی داهاتووی پزیشکەکانی هاندا نەخۆشییەکان پۆلێن بکەن، لە هەمووی گرنگتر، چووە نێو پرۆسەیەکی نوێوە ئەویش جیاوازی نێوان نەخۆشییەکەو ئەو کەسەی تووشی نەخۆشییەکە دەبێت لە لایەکەوە، ناساندنی تایبەتمەندییە گشتییەکانی نەخۆشییەکە کە چارەسەری گونجاوی بۆ دابین دەکرێ لەلایەکی دیکەوە. سەیر لەوەدایە سەرەڕای ئەم جیاوازییانەی دایهێنا، کەچی سیدینهام خۆی بە هیپۆکراتێکی کارامە دادەنێت. بەڵام بیرکردنەوەکانی سیدنهام کێشەی نوێی بۆ بواری پزیشکی خوڵقاند: چۆن دەبێ باوەڕت وابێ نەخۆشی و چارەسەری نەخۆشییەکە لەسەر بنەمایەکی زانستیی گشتگیر بێت، بەڵام

نیشانەکانی هەر نەخۆشییەک لە تاکێکەوە بۆ ئەویدی جیاواز بێت، بەهەمان شێوە دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکەش جیاواز بێت؟

## ئەمجۆرە پزیشکییە تەموژاوی نییە؟

دوای مردنی سیدنهام بە سەدەیەک، ناوبانگێکی باشی هەبوو، سەرەتا کارەکانی بە لاتینی بلاوکرانەوە کە تا ئێستاش زمانی باوە، دواتر وەرگێڕرانە سەر زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی وئەلمانی وئیسپانی چەند زمانێکی ئەورووپیی تر. دەوترێت ناودارترین مامۆستای پزیشکی لە سەدەی هەژدەدا، هێرمان بورهاڤ[15] (١٦٦٨– ١٧٣٨ز) بووە، هەرچەند ناوی سیدنهام هاتبێ ئەو وەکو ڕێزلێنانێک شەپقەکەی داگرتووە، بۆرهاڤ بەدرێژایی ٤٠ ساڵ دروشمێکی دیاری زانکۆی لیدن leiden بووە، لە هەموو لایەکی ئەورووپاوە خوێندکار ڕووی تێکردووە، دەستپێشخەری و وانە فێرکارییەکانی ئەدینبەرە، ڤییەنا، گۆتینجین، جنێڤ و ئەوانیدی کاریگەرییان لەسەری هەبووە.

سەرچاوەی بیری بۆرهاڤ جۆربەجۆرە، بیرکردنەوە پزیشکییەکانی لە بوارەکانی کیمیا وفیزیک وزیندەزانی و بوارەکانی ترەوە سەرچاوەی گرتووە. بیرێکی تیژی هەبوو، لە دەستنیشانکردنی نەخۆشیدا وردەکار بوو. هەموو وانە فێرکارییەکانی لەسەر جێگەی نەخۆشەوە هەڵێنجابوو. کلینیکێکی گەورەی هەبوو، پۆستەیەکی ڕاوێژکاری تێدابوو، تایبەت بوو بە سەرنج و سەرسامیی پزیشکان و گازندە

15 Hermann Boerhaave.

ونیگەرانیی نەخۆشەکان، ئێستاش ناوبانگی ئەوسای ماوە. ئەوەی جێگەی گرنگی پێدان بوو ئەوەبوو زنجیرەیەک کتێبی لێکۆڵینەوەی لەبارەی کیمیاگەری و مادەی پزیشکی وکاری پزیشکی دانابوو، سەرەڕای چەند چاپکراوێک لەبواری توێکاری و ڕووەکناسی و نەخۆشییەکانی کۆئەندامی زاوزێ. کاریگەریی ئەم نووسراوانە دوو نەوە یان سێ نەوە لە پزیشکان درێژەی هەبوو، بنەمای کارەکانی کۆکردنەوە بوو نەک دۆزینەوەی سەرەتایی. هەرچەندە ڕۆچووبووە نێو جیهانی سروشتەوە ( گرنگیدانی تایبەت بە باخچە خۆشەویستەکەی لە ماڵەوە)، ئەو هێشتا بەشێک بوو لە نەریتە میراتییەکان مەبەست لە کتێبخانەی پزیشکییە، هێشتا لای ئەو هیپۆکرات کەسێتییەکی زیندووە، هەمیشە بەدوای سەرچاوە وڕاستییە پزیشکییەکاندا بۆ ڕابردووی کۆن دەگەڕایەوە، هەرچەندە متمانەی تەواوی بەو سەرکەوتنانە هەبوو کە لە سەدەی ڕابردوودا بەدەست هێنرابوون.

ناودارترین قوتابی بۆرهاف لەسەدەی هەژدەدا کە لایەنگری ڕێبازی سروشتی بوو: کارل لینیۆس (١٧٠٧-١٧٧٨ز) بوو، کە پۆلێنکردنەکەی گۆڕی بە زانستێکی پێشڕەو، سیستەمی ناولێنانی دووسەرەی داهێنا، کە بەهۆیەوە بونەوەرە زیندووەکان دەناسرێنەوە بە جۆر و ڕەگەزیانەوە، لینیۆس ژیانی تەرخان کرد بۆ پۆلێنکردنی بونەوەرانی جیهانی سروشت، بەتایبەتی ڕووەکەکان، خۆی بە ئادەمی دووەم پێناسە دەکرد، خۆی وا دەناساند یەکەم کەسە ئەرکی ناولێنانی ڕووەک وگیانەوەرانی لە باخچەی عەدەندا کەوتۆتە ئەستۆ. ئەو مامۆستای




(٩) هێرمـان بۆرهـاڤ نـاودارترین مامۆسـتای پزیشـکی بـوو لەسـەردەمی خۆیـدا، هەرچەنـدە ژمـارەیەکی زۆری پزیشـک لەژێر دەستیدا راهێنانی پراکتیکییان دەکرد، بەلام جەماوەری لێکچەرەکانی زۆر کەم بوون.

پزیشکی بوو، ئۆپسالاش لە ئاستی فیردەوسی عەدەندا نەبوو. بەڵام زنجیرەیەک گەشتی لەگەڵ خوێندکارەکانیدا بۆ گەلێک شوێنی دەگمەنی جیهان ئەنجامدا، خوێندکارەکانی گوێڕایەڵ و دڵسۆزانە (سووربوون لەسەر ئەوەی ئەگەر ڕزگاریان بێت)، لەهەر جۆرە ڕووەکێک سامپڵێکی سروشتی بێننەوە، تاکو مامۆستاکەیان پۆلێنیان بکات. هەربەوجۆرەش لینیۆس نەخۆشییەکانیشی پۆلێن کرد، بەڵام پۆلێنکردنەکانی کەمتر کاریگەربوون لەو پۆلێکردنانەی لە سەردەمی ڕۆشنگەریدا ئەنجامدرابوون؛ لەلایەن هەریەکە لە فرانسوا بواسێ دیلاکروا دوسۆفاج (١٧٠٦- ١٧٦٧) زانکۆی مۆنپلییە، ویلیام کالن (١٧١٠- ١٧٩٠) لە زانکۆی ئەدینبەرە و ئیراسموس داروین (١٧٣١- ١٨٠٢)ی شاعیر و ڕووەکناس وداهێنەر و پزیشکی کارامە لە لیچفیلد و ناوچەکانی تری ناوەڕاست لە ئینگلتەرە پێی هەستابوون.

پۆلێکردنی نەخۆشییەکان nosology هەمووی بەجیابوون و لەسەر بنەمای دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکان ڕێکخرابوون، نەک لەسەر هۆکار و ئاماژەکانی نەخۆشییەکە. "تا" خۆی لە خۆیدا پێشتر نەخۆشی بوو. بۆ نموونە ئازار باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەپێی تایبەتمەندیی توندوتیژییەکەی و شوێنەکەی بەوردەکارییەوە پۆلێندەکرێت.

لەسەردەمی ڕۆشنگەریدا نەخشەی نەخۆشی بەشێکی بەرچاو بوو لە پراکتیکی پزیشکی و لەڕێگەی درێژەدان بە نەریتی هیپۆکراتەوە، ئاراستەی نەخۆش دەکرا. پزیشکەکان بۆئەوەی بتوانن دەستنیشانی نەخۆشییەک بکەن پشتیان بە وتەی نەخۆشەکە خۆی دەبەست سەبارەت بەونیشانانەی

هەستی پێدەکات، مێژوونووسان وا باسی نەخۆش دەکەن کە پەیوەندییەکی بەتینیان لەگەڵ پزیشکەکان هەبووە، بەپێی ئەم سیناریۆیەی نێوان پزیشک و نەخۆشیش نەخۆشی دەستنیشان کراوە، بەگشتی سوود لە چاوپێکەوتنی نێوان پزیشک و نەخۆش بینراوە و لەو ڕێگەیەوە کۆنترۆڵی دۆخەکە کراوە. ڕەنگە ئەم بۆچوونە زیادڕەوی تێدابێت، هەرچۆن لەسەدەی نۆزدەدا وەکو کەسێکی باڵا دەست باسی پزیشک کراوە کە ڕەنگە ئەویش هەر زیادڕەوی بێت. چونکە پێش دەرکەوتنی شێوازە نوێیەکانی دەستنیشاکردنی نەخۆشی، نەبینراوە نەخۆش لای پزیشکەکەی بە هەواڵێکی ناخۆشەوە دەرچووبێت، وەکو ئەوەی فشاری خوێنی یان ئاستی شەکرەی لەخوێندا لە ڕێژەی ئاسایی بەرزتر یان نزمتر بێت، یان گومانی تارماییەک لە وێنەی تیشکی ئێکس لە سینگیدا هەبێت؛ تا بڵێین دۆزینەوەی نەخۆشییەکە تەنها دوکتۆرەکە بڕیاری لێداوە. لەسیستەمی کۆندا پزیشک و نەخۆش بە زمانێکی هاوبەش پێکەوە دەدوان، پێشبینیی چوونیەکیان لە بارەی نەخۆشی و هۆکارەکانییەوە هەبوو، پێشبینی کردنی مەترسیدار یان موژدەبەخش لە سەردانی پزیشکدا، تەنها ڕەوتی نەخۆشییەکە دیاریی دەکرد، چونکە پەیوەندیی ڕاستەوخۆی نێوان نەخۆش و نیشانەی نەخۆشییەکە پاڵنەر بوو بۆ ئەوەی نەخۆش لەسەرەتاوە ڕاوێژ بە پزیشک بکات.

دوو لایەنی تر لە لایەنەکانی کردەی پزیشکی لە سەردەمی ڕۆشنگەریدا هەبوو شایانی باسکردنە: یەکەم: زەمەنی پرۆژە پزیشکییە مەزنەکان بوو لەم زەمەنەدا تەندروستی گرنگ بوو خەڵک ئامادەبوون لە پێناوی

تەندروستیدا پارەخەرج بکەن، ئەمەش بواری لەبەردەم چارەسەرکارە تەماحکارەکان، یان فریودەرەکان ڕەخساند، پێگەیەکیان لە بازاڕی پزیشکیدا لە نێو هەموو چین وتوێژەکان هەبێت. مەسەلەکە هێند ئاسان نییە بتوانی پزیشکی "فریودەر" لە پزیشکی "نیزامی" جیابکەیتەوە، زۆرجار پزیشکە فریودەرەکان بەدەوری کولتووری گەردوونناسی پزیشکیدا دەسووڕێنەوە، بەڵام ڕەنگە نیزامییەکان بۆ شێوازی چارەسەرکردن پڕوپاگەندە بۆخۆیان بکەن و ڕەچەتەی نهێنی بۆ چارەسەرکردن بەکار بهێنن و ناوبانگ پەیدابکەن لە پێناوی سەرنجڕاکێشانی نەخۆش. بەڵام پزیشکیِ تەواوکاری کە لەسەردەمی ئێستادا کاردەکات پشت بە هەندێ ئەلتەرناتیڤ دەبەستێت لە لێکدانەوەی فاکتەرەکانی تەندروستی ونەخۆشی، کە لەسەدەکانی ڕابردوودا هیچ دەنگ وسەدایەکی نەبووە. ڕەنگە پزیشکە چاوچنۆکەکان هەریەکە لای خۆیەوە بۆچوونی تایبەتیان لەسەر فاکتەرەکانی نەخۆشی هەبێ، یان ڕێگەیەکی باشتر لە چارەسەرکردندا هەڵبژێرن، بەڵام زۆرجار لە چارەسەرکردنەکانیاندا پشت بە کەسایەتییە گرنگەکانی مێژوو دەبەستن لە بواری پزیشکیدا، هیپۆکرات و گالینۆس لەبەرەی پێشەوەی ئەو چارەسەرکارە نانیزامییانە بوون لەو ماوەیەدا، بەڵام پاراسیلسۆس جیاواز بوو، شایستەی وەبیرهێنانەوەیە، ئەو نەک هەر تیۆرەکانی خستەلاوە، بەڵکو سەرجەم نەریتە پزیشکییەکانیشی پشتگوێ خست، ئەو ئەقڵییەتێکی نامێژوویی تایبەتی هەبوو. بەڵام زۆربەی فریودەرەکان پشتیان بە نەریتی پزیشکی دەبەست و بە کارامەیی لە بەرژەوەندیی خۆیاندا بەکاریان

دەهێنا، لە بەڵێنەکان یان چۆنێتی بەکارهێنانی شومەک و خزمەگوزارییەکانیان.

تایبەتمەندیی بەرچاوی دووەمی پزیشکی لەسەردەمی ڕۆشنگەریدا گەشبینی بوو هاوتای کاری بەردەوام، ئەم سەردەمە سەردەمی پرۆژەو دامەزراوەکان بوو، نەخۆشخانەکان بەشێوەکی زۆر ڕێکوپێک دروست دەکران، لەئەوروپا هەوڵەکان بۆ چاک کردنەوەی خزمەتگوزارییە پزیشکییە سەربازییەکان چڕبوونەوە، کاری خێرخوازی بەرامبەر پیشەی پزیشکیی گیرایە بەر. بیرکردنەوەی پێشکەوتن لەوەش پێشکەوتنی پزیشکی، ڕەچاوکرابوو، نەخۆش و پزیشکان وەکو یەک باوەڕیان بەوە هێنا، کاری پزیشکی لە داهاتوودا تواناکانی زیاتر دەبێت لە توانای ئێستاو ڕابردوو. لە هەمان کاتدا پزیشکان و نەشتەرگەرە ڕوناکبیرەکان لە هیپۆکرات یان سیدنهام بەجۆرێک دەڕوانن، نەک بۆ بەهرە وەرگرتن بەڵکو لە پێناوی زانیاری و بوون بە پێشەنگ. بەڵام بە گوێرەی بۆرهاڤ یان کالن، گرنگیی مێژووی پزیشکی تەنها لە بەها کەلەپورییەکەیدا نییە، بەڵکو سەرچاوەیەکە بۆ پەند و حیکمەتی زیندوو. لەسەدەی نۆزدەدا، پزیشکە کۆنەکان بوونە بەشێک لە مێژوو، نەوەیەکی نوێ وەکو پزیشک جڵەویان گرتە دەست و زیاتر بۆ ئایندەیان دەڕوانی.

# بەشی سێیەم
# پزیشکی لە نەخۆشخانەدا

### بژی فەرەنسا

گوزارشتی "پزیشکیی نەخۆشخانەکان" واتایەکی سنوورداری بۆ مێژوونووسانی پزیشکی هەیە، نەخۆشخانەکان لەسەرەتای سەدەکانی ناوەڕاستەوە سەریانهەڵدا، بەڵام کاری پزیشکی بە مانای پراکتیکی پزیشکی، دەگەڕێتەوە بۆ زەمەنێکی دوورتر لەو سەردەمە. پوختەی "پزیشکیی نەخۆشخانەکان" لە گوزارشتێکی ڕەوادا بۆ ئەو گەشەکردنە پڕ بەهایە دەگەڕێتەوە، کە ناوی کۆمەڵگەی پزیشکی فەرەنسییە، بەتایبەتی پاریس لەنێوان هەردوو شۆڕشی ١٧٨٩ و ١٨٤٨ دا. ئەم ماوەیە سەردەمێکە، کەتییدا پاریس دەبێتە قیبلەی جیهانی پزیشکی. نەخۆشخانەکانی پاریس ناوەندی ڕاستەوخۆی ئەو سەردەمەن، کاریگەریی ئەو کەرەستەو ئامێر و شێوازانەی بەسەر ناوەندە پزیشکییە فێرکارییەکان و کاری پزیشکیدا زاڵبوو، بۆ هەموو ئارژای جیهانی ڕۆژئاوا پەلی هاویشت.

هەندێجار ئەو ماوەیە لە مێژووی فەرەنسادا بە "شۆڕشی پزیشکی" ناوزەد دەکرێت، ئەمە وەسفێکی

دروستە، چونکە ئەم شۆڕشە پزیشکییە، دەرهاویشتەی شۆڕشێکی سیاسی بوو. مێژوونووسان شیکردنەوەی وردیان بۆ ستراکچەرە فێرکارییەکان، پراکتیکە پزیشکییەکان و پەیوەندی نێوان پزیشک و نەخۆش ئەنجامدا، بەبەراورد لەگەڵ سەردەمەکانی پێشوودا، داکۆکییان لەو گەشەکردنە بێپێشینەیە کرد، کە لە نێو ئەو شۆڕشە پزیشکییەدا ، دیار وئاشکرابوو. لە ڕاستیدا پزیشکەکان لە (١٨٤٠) متمانە ودڵنیاییەکی نوێیان پەیداکرد، بەبەراورد لەگەڵ دوو نەوە پێش خۆیان، ڕەنگە بەشێکی زۆری ئەو دڵنیاییە بۆ کاریگەریی پاریس بگەڕێتەوە.

وەکو هەموو شۆڕشەکانی تر، شۆڕشی پزیشکی پاریسی بە بچووکی دەستی پێکرد کەس نەیدەتوانی لە ڕۆژانی زریان و شلۆقیی سیاسیدا " لە سەردەمی تیرۆردا" پێشبینی شۆڕشێکی پزیشکی بکات. بە گەیشتنی هێزە سیاسی و سەربازییەکان بۆسەر پایەکانی دەسەڵات، ئەو هێزانە هەموو دامەزراوە پزیشکییەکانیان ڕامالّی – لە پزیشکان و نەشتەرگەران و نەخۆشخانەوە بیگرە بۆ دامەزراوە ئەکادیمی و کۆلێژە کۆنەکان، لەگەڵ ڕامالّینی تەواوی "سیستەمە کۆنەکە" لە دوو ساڵی قورسی پڕ لە ڕووداودا. لەسەرەتای نەوەدەکانی سەدەی هەژدەدا، بانگەشەی ئەوە دەکرا دەبێ هەر کەس پزیشکی خۆی بێت، سەرکردەکانی شۆڕش پەیمانی ئەوەیاندا، لەڕێگەی دابین کردنی چاودێری تەندروستییەوە بەدڵنیایی، گەندەڵی و نایەکسانی بنبڕ دەکرێت، پلە وەزیفییە تەندروستییەکان وپۆستە تایبەتەکان کە پەیوەندی بە پایەکانی دەسەڵاتی کۆنەوە هەیە پێویستە لاببرێن.

بەلام ئەم گەشبینییە هێندەی نەخایاند، نەخۆشی بنبڕ نەکرا، دەسەلاتە شۆڕشگێڕەکە هەر زوو بۆی دەرکەوت سەربازەکان، دەریاوانەکان پێویستیان بە چاودێری پزیشکی ونەشتەرگەری هەیە، بە تایبەتی ئەو پزیشکانەی بەشداری خولی تایبەتیان کردووە و ڕاهێنراون لەسەر کاری پزیشکی ونەشتەرگەری، لەگەرمەی شەڕ وشۆڕ و جەنگەکاندا جیاوازی نێوان کاری پزیشکی و کاری نەشتەگەری کۆتایی هات، لە سالی ١٧٩٤ سێ خوێندنگەی پزیشکی سەربازی نوێ کرایەوە، بەپلەی یەکەم بۆ ئامادەکردنی ئەو پیاوانەی پێداویستییە سەربازییەکان لە کۆمارە نوێیەکەدا دابین دەکەن. خۆشبەختانە گرنگترین کەس لەو کۆمیسیۆنەی کە کۆمەلەی شۆڕش دەستنیشانیان کرد بۆ پێداویستییە پزیشکییەکان لە سەردەمی نوێدا، پزیشک و کیمیاگەرێکی هاوسۆزبوو لە گەل ئامانجەکانی شۆڕشدا. ئەویش ئەنتوان فۆرکروا[16] (١٧٥٥ -١٨٠٩ز) بوو، ئەم پیاوە بەو سیفەتەی کیمیاگەرە هەندێ ناوبانگی دەرکرد، وەکو مامۆستایەکی کیمیا لە فێرگەیەکی نوێ کاری دەکرد، خۆیشی بەشداری دامەزراندنی ئەو فێرگەیەی لە پاریس کرد. سیاسەتمەدارێکی زیرەک ونیازپاکی ڕاستەقینە بوو، فورکروا لەپشتی پلانی دامەزراندنی ئەو فێرگانەوە بوو کە لە پاریس و ستراسبۆرگ و مۆنپیلییە کرانەوە. ئەو ڕاپۆرتەی کە ڕۆلی گەورەی هەبوو لە ئامادەکردنیدا، بریاری لەسەر ئەو پێداویستییە سەربازییانە دا کە دۆخی سیاسی ئەو سەردەمە دەیخواست، هەروەها جەختی لەسەر سێ لایەنی پزیشکی فێرکاریی نوێ کردەوە، یەکەمیان: پێویستە خوێندکار

16 Antoine Fourcroy.

لەیەکەم ڕۆژەوە ڕاهێنانی پراکتیکی چڕ ئەنجام بدات. هێشتا وتەکانی لە گوێدا دەزرینگێتەوە کە وتی: پێویستە خوێندکار " کەم بخوێنێتەوە، زۆر ببینێت وزۆر کاربکات" دووخستنەوەی تیورەکان و کاری پراکتیکی زۆر دوو تایبەتمەندیی بەربڵاوی ئەو سەردەمە بوون. دووەم: بڕیاردرا شوێنی فێرکاریی پزیشکیی نوێ، نەخۆشخانەکان بێت، هەلی شارەزایی زۆر و چڕ زۆر باشترە لە هۆڵی موحازەرە یان پراکتیکی پزیشکی لە دەرەوەی نەخۆشخانە. لە دواییدا: لەسەر دەرچوانی پزیشکیی نوێ پێویستبوو هەریەکە لە کاری پزیشکی وکاری نەشتەرگەری پێکەوە فێربن وڕاهێنانی لەسەر بکەن. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ ئەهمییەتی بیری نەشتەرگەری بۆ نێو کایەی پزیشکی کارێکی ڕەوایە، لە کاتێکدا کاری پزیشکی گرنگی بە تەواوی جەستە دەدەن، چی بە تێکەڵەکان بێت یان لەڕێگەی ڕۆحەکانەوە یان نەخۆشییە گشتگیرەکان، بەڵام نەشتەرگەرەکان بەرەنگاری بابەتە لۆکاڵییەکان دەبنەوە، شوێنێک دەگرنە ئامانج وەکو کێم و زوخاوی دومەڵەکان، یان شوێنی شکاوییەکان یان ئەو کێشە سنووردارانەی پێویستیان بە یەکلاکردنەوە هەیە لە جێگەیەکی جەستەوە. بەڵام لەگەڵ دامەزراندنی قوتابخانەی پزیشکیی فەرەنسیدا، چەمکی " دەرد وئافەت" گرنگییەکی پزیشکی هەبوو، یان گۆڕانێک بوو لە زانستی پزیشکی لە ئەنجامی نەخۆشییەکەوە کە بە چاو دەبینرێ، ئیتر بە میکرۆسکۆپ بێت یان بە بێ میکرۆسکۆپ، پزیشکەکان بیریان لە نەشتەرگەری کردەوە، تەنە ڕەقەکانی لەش شوێنێکی گونجاو بوون بۆ ئەو مەبەستە.

نەخۆشخانەی پزیشکیی فەرەنسی پشتی بە سێ کۆڵەکە بەستبوو، هیچ یەکێ لەو کۆڵەکانە تەواو تازە نەبوون، بەڵام هەرسێکیان بەیەکەوە، شێوازێکی نوێیان پێکهێنا بۆ تێڕوانین لە نەخۆشی. ئەو سێ کۆڵەکەیەش ئەمانەبوون: دەستنیشانکردنی نەخۆشییە جەستەییەکان، پەیوەندی کلینیکی - نەخۆشیناسی، لەگەڵ بەکارهێنانی کەیسێکی زۆر بۆ ڕوونکردنەوەی جۆرەکانی دەستنیشانکردنی نەخۆشی و هەڵسەنگاندنی چارەسەر. ئەم سێ کۆڵەکەیە دوای چاکسازی تێیدا گرنگییەکی بنەڕەتی لە بواری پزیشکیدا هەبوو، هەروەها نەخۆشخانە وەکو تەوەرێکی گرنگی کردەی پزیشکی مایەوە.



(١٠) کۆشکە مەزنەکەی نەخۆشخانەی هۆتێل دیو لە پاریس لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەم، کە دامێنانی پزیشکیی زۆر گەورەی بەخۆوە دیوە، دوو کەس لای چاپەوەن تابووتێکیان هەڵگرتووە بەرەو ئەو گالیسکەیە دەڕۆن کە لەبەردەم دەروازەکەدا وەستاوە، وادیارە خاوەنی گالیسکەکە چاوەڕێی ئەوان دەکات، تا مردووەکە بۆ گۆڕستان بگوێزێتەوە.

## دەستنیشانکردنی نەخۆشی جەستەیی: پەیوەندییەکی گەرموگوڕی نوێ

دەبێت پەیوەندیی نێوان نەخۆش و پزیشک لەسەر بنەمای دۆستایەتی و ئەتەکێتی هەڵسوکەوت بێت، ڕەنگە لە نەخۆش داوابکرێ خۆی ڕووت بکاتەوە، دەست لە لەشی بدرێت، هەرچۆن هاوسەری یان مێردی دەست لە لەشی دەدات، بەجۆرێک دەشێت نەخۆشەکە تووشی شەرمەزاری بێت. زۆربەی نەخۆشەکان بەو پەیوەندییە ڕازین، بەوپێیەی متمانەکردن بە پزیشکەکان لە بەرژەوەندیی خۆیانە، لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەدا لە نەخۆشخانەکانی پاریس ئەم دیاردەیە بەرگی ڕۆتینی بەبەردا کرابوو، لە ئەنجامی ئەو پشکنینەی بۆ جەستە دانرابوو و پزیشکەکان لە خوێندنگە فێرکارییە نوێیەکاندا، لەنێو نەخۆشخانەکاندا پێڕەویان دەکرد.

ئەمە مانای ئەوە نییە هەمیشە پزیشکەکان کە تا کۆتایی سەدەی نۆزدە، پزیشکی نێرینە بوون، نەخۆشیان بە ڕووتی نەپشکنی بێت، تێڕوانین بە ئەندامی زاوزێی ئافرەتدا لەسەردەمی ڕۆمانەکاندا داهێنرا. نەشتەرگەری بەردی میزڵدان، ناسوری کۆم، دیاردەی نەخۆشییەکانی کۆئەندامی زاوزێ، یان کرداری منداڵبوون، تەنها پیاوان ، بەشێوەیەکی سیستماتیک بەبێ هیچ کێشەیەک ئەنجامیان دەدا. سەردانی نەخۆش بۆ لای پزیشک لە هەندێ دۆخدا پێویستی بە بەرکەوتنی ڕاستەوخۆی نەخۆش هەبوو لەگەڵ پزیشکدا، وەکو پشکنینی زمان، پشکنینی لێدانی دڵ. بەڵام دەرهاویشتەکانی جەستە وەکو میز و پیسی لە دەستنیشانکردنی پزیشکیدا هەندێجار پێویستی بەوە نەبوو

نەخۆشەکە ببینرێت، چونکە لەسەر شێوەو ڕەنگی ئەو میز و پیسییە دەستنیشانی نەخۆشییەکە دەکرا.

سەردانی نەخۆش بۆ لای پزیشک، لەسەرەتای سەدەی نۆزدەوە گۆڕانکاری بەسەردا هات، زۆربەی نەخۆشەکان هەژار و نەخوێندەوار بوون، توانای ئەوەیان نەبوو دەستوەردەن لەو چارەسەرەی بۆیان پێشنیار دەکرا، لەلایەکی ترەوە ئایدیۆلۆژیای پزیشکیی نوێ پشتگیری پزیشکەکانی دەکرد، بەدوای ئەو نیشانانەدا بگەڕێن کە لەسەر جەستەو ڕووخساری نەخۆش دەردەکەوتن، زیاتر لەوەی پشت بەو نیشانانە ببەستن کە نەخۆشەکە باسی دەکرد، وەکو ئازار، بێخەوی و ماندوبوون کە تایبەت بە هەستی نەخۆشەکە بوو، بەڵام پووکانەوەی ماسوولکە و سووربوونەوەی دومەڵ بۆ نموونە ئەو نیشانانە بوون بەچاو دەبینران و گشتگیربوون، ڕێبەرانی نەخۆشخانەی پزیشکی فەرەنسی ویستیان لەڕووی پراکتیکییەوە، نیشانە لۆکاڵییەکان کە لە دەرەنجامی دەرد و نەخۆشییەوە دەردەکەون و بەچاو دەبیران، بکەنە بنەما نەک نیشانە تایبەتەکان بە نەخۆشەکە.

دەستنیشانکردنی نەخۆشی بنچینەی ئەم هەوڵدانە بوو، کە چوار ڕەهەندی پزیشکی بوون، تا ئێستاش خوێندکارەکانی لەسەر ڕادێنن، ئەوانیش پشکنین، دەست لێدانی ڕووکەش، پیاکێشان و گوێگرتنن. پزیشکەکان لە سەردەمی هیپۆکراتەوە ناوبەناو تائێستاش بەشێوازی جیاواز ئەم شێوازانەیان تاقیکردۆتەوە. بەڵام پزیشکە فەرەنسییەکان هەموویان کۆکردۆتەوە و شێوازێکی ئاساییان لێ دروست کردووە و بە سیستماتیک کراوە،

ئەمەش بۆ هەمیشە پەیوەندی نێوان پزیشک و نەخۆشی گۆڕی.

پشکنین سادەترین جۆری پراکتیکییە: بە نەخۆشەکەدا دەڕوانی، "زمانت دەرکە" ئەم فرمانە زۆر لە کۆنەوە باوە توێژی سەر زمان بە چینێکی سپی، نیشانەی تا و کێشە کتوپڕەکانی ترە زەردبوونەوەی سپێنەی چاو ئاماژەیە بۆ زەردوویی، سووربوونەوەی ڕوخسار ئاماژەیە بۆ تالێهاتن بەتایبەتی تای دواقۆناغی تووشبوون بە نەخۆشی سیل یان نەخۆشیی جومگەکان. ڕەنگ پەڕیوی مەیلەو سەوز نیشانەیە بۆ کەمخوێنی یان نەخۆشی سەوزی chlorosis ، ئەم نەخۆشییە تووشی کچی هەرزەکار دەبێت، لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا ئەم نەخۆشییە بەهۆکارێکی نادیار کۆتایی پێهات، بەهەمان شێوە نەخۆشی هیستریاش لە هەمان کاتدا ڕەنگە بە هەمان هۆکاری نادیار کۆتایی هات. بەڵام پشکنینەکان زیاتر پشتیان بەو دیاردانە دەبەست کە لەسەر جەستە یان ڕوخسار یان دەستەکان یان شوێنەکانی تر دەردەکەوتن. کاتێ پزیشک لە شوێنێکی تری دەڕوانی دیارە هۆکارێکی تری بۆ ئەوە هەبووە، ئەو هۆکارە لای نەشتەرگەرەکان زیاتر باوبووە نەک لای پزیشکەکان.

فەرەنسییەکان پشکنین بە سیتماتیک وەکو بەشێک لە هەڵسەنگاندنی گشتی لە نەخۆشدا پێڕەوی دەکەن. لە پشکنین بە دەستلێدانیش هەمان شت پێڕەو دەکەن کە کردەیەکی زۆر دۆستانەیە، خۆی لە دەستلێدانی نەخۆشدا دەبینێتەوە، هەندێجار ڕەنگە شوێنی ئازارەکە، ئاوساوی لە شوێنێکی جەستە ببینرێت بەڵام پزیشک پێویستی بەوەیە

دەستی لێبدات و خۆی هەستی پێ بکات، هیپۆکراتەکان دەیانزانی نۆرەتا زۆرجار دەبێتە هۆی ئاوسانی سپڵ، بەجۆرێک گەورە دەبێت بەچاو دەبینرێت لەگەڵ ئەوەشدا لە ڕێگەی دەستلێدانەوە دەستنیشان دەکرا، لەژێر سایەی کولتووری پزیشکەکان کە لەسەرەتای سەدەی نوێوە بڵاوبووەوە، نەریتی دەستلێدان زیاتر پەرەی سەند، واتە دەستلێدان وەکو دیوێکی تری دەستنیشانکردن گەڕایەوە نێو کایەی پزیشکی، لە ئەنجامی ئاوێتەبوونی هەردوو کردەی پزیشکی و کاری نەشتەرگەری. بە دەستنیشانکردنی میکانیزمەکانی نەخۆشی لە ئەندامەکانی لەشدا، وە دووپاتکردنەوەی هۆکاری نەخۆشییەکە، خوێندکارە فەرەنسییەکان فێرکران دەستەکانیان بەکار بێنن بەوپێیەی بەشێکن لەو کەرەستانەی لە دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکەدا بەکاری دێنن.

لێدان (لەسەر سینگ و سەر سک) سێیەم بەشی ڕۆتینی ئەزموونی پزیشکییە. هەرچەندە هەندێ سەرنجمان بە جیا لەسەر تۆمارە پزیشکییەکانی ڕابردوو نووسی، پزیشکی ڤییەنایی لیۆپۆلد ئۆینبروگەر[17] (١٧٧٢- ١٨٠٩) ڕاستی فەرموو کاتێک ناونیشانی کتێبەکەی لە ١٧٦١ز بە "داهێنانی نوێ" ناوزەد کرد، دەڵێن ئۆینبرۆگەر کوڕی خانەدانێک بوو، سوودەکانی لێدان لەوەوە فێربوو کاتێک باوکی دەینارد بۆ ژێرخانەکە تا بزانێت بەرمیلی مەی و شەرابەکان چەندی تیاماوە بە لێدان لە بەرمیلەکان دڵنیادەبووەوە چەندیان تیا ماوە، دوایی بۆی دەرکەوت تەکنیکی لێدان بە پەنجەکانی

17 Leopold Auenbrugger .

لەملاولەولای بەرمیلەکان بە ئاستی شلەکە گۆڕانکاریی لە دەنگی لێدانەکە هەست پێدەکرد، ئەمەش مانای ئەوەبوو پێویستی بەوە نەبوو سەرقەپاغەکان هەڵداتەوە تا لە بنەوەی بەرمیلەکان بە مۆمێک بڕوانێت، وەکو پراکتیکی پزیشکیش گەشەی بەم ئەزموونەدا و یارمەتی دا بۆ پێوان و هێزی لێدانی دڵ، جگەر و ئۆرگانەکانی تری لەش تا بزانێ گەورە بووە، یان بۆ زانینی ئاستی کۆبوونەوەی ئەو شلانەی لە سینگ یان لە ورگدا هەن، بۆشاییەکانی لەش بەهۆی نەخۆشییەوە گۆڕانکارییان بەسەردا دێ، بە لێدانی هەست بە دەنگی تایبەت دەکەیت.

کتێبە بچووکە سادەکەی ئۆینبرۆگەر نموونەیەکی زۆر باشی ئەو ڕاستییەیە کە لێکۆڵینەوە کلاسیکییە کۆنەکان دروست دەکرێن لە دایک نابن، ئەم کتێبە دوای بڵاوبوونەوەی نزیکەی چوار دەیە مێژوونووسان تەنها چەند ئاماژەیەکیان پێکرد، وەکو سەرچاوەیەکی گرنگ باسیان لێوە نەکرد. پزیشکانی سەدەی هەژدەیەم ئامادە نەبوون گرنگی بە تەنە ڕەقەکانی جەستە بدەن تاکو لە دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکان یارمەتییان بدات، بەلام بە هاتنی شێوازی فەرەنسی لە لە خوێندن و فێرکردنی پزیشکیدا هەموو شتێک گۆڕا.

نووسینەکانی ئۆینبرۆجەر بە لاتینی لەلایەن پزیشکە تایبەتەکەی ناپلیۆنەوە دۆزرایەوە کە ئەویش جین نیکۆلاس کۆرڤیزار[18] (١٧٥٥- ١٨٢١) بوو، پرۆفیسۆری پزیشکی بوو لە خوێندنگەی پاریس. کۆرڤیزار لە سەرەتاکانی سەدەی

18 Jean Necolas Corvisart.

نــۆزدەدا تەواو ئامــادەبوو بەو ئاراســتە نــوێیەدا بــڕوات کەتـایبەت بـوو بە ئەنـدامانی پزیشـکی فەرەنسـی، کـۆرڤیزار گرنگیی تایبەتی بە نەخۆشییەکانی دڵ دەدا، بەهـای لێدانی لە دۆخەکــانی ئاوســانی دڵ و کۆبــوونەوەی شــلە تێیــدا ونەخۆشییەکانی تری دڵ، درک پێکرد، لە ١٨٠٨ دەستی کـرد بە فێرکردنــی قوتابییەکــان و وەرگێڕانــی نووســینەکانی ئۆینبرۆگەر لە لاتینییەوە بۆسەر زمانی فەرەنسی.

بەشـێوەیەکی زۆر ڕوون سـەرنج و تێبینییەکـانی خـۆی سەبارەت بە گرنگیی ئەو تەکنیکە نوێیانە لە هاوکاری کردنی پزیشـک لە دەستنیشـانکردنی نەخۆشـیدا، خستەبەرچاو. دوو ساڵ پێش ئەوە

وتــارە زانســتییەکەی دەربــارەی نەخۆشــییەکانی دڵ بڵاوکـردەوە، لەو وتـارەدا پشـتی بەو سـەرنجانە بەسـت کە یەکــێ لە خوێنــدکارەکانی تۆمــاری کردبــوو. تۆمــارە پزیشــکییەکان کە لەم پەرتـووکە نایـابەدا هــاتووە شــایانی خوێنــــدنەوەیە: بیــــروڕای کــــۆرڤیزار ســــەبارەت بە نەخۆشـییەکانی دڵ ڕەشـبینانەیە، پـووختەی بۆچـوونەکەی ئەوەیە؛ نەخۆشــــییە ئۆرگانییەکــــانی دڵ زۆر بەکەمــــی بەشـێوەیەکی کـاریگەر بەو دەرمانـانە چارەسـەر دەبـن کە پێیـان دەدرێ، بەڵام دەتوانرێـت نەخۆشـییەکە دەستنیشـان بکرێت، مـرۆڤ دەتـوانێ پووختەی تۆمارە پزیشکییەکان کە لە نەخۆشــخانەکاندا تۆمــارکراون بخــوێنێتەوە، زۆرێـک لە ژنــان و پیـاوان لە چینــی کرێکــار، کە تووشــی نەخۆشـیی مەترســیدار بــوون، ســەردانی نەخۆشــخانەکانی پاریســیان کردووە بەوپێیەی تاکە شوێنە پەنای بۆ بەرن، بەڵام ڕێژەی

مردن لەو نەخۆشخانانەدا زۆر بەرز بوو، هەندێجار دۆخەکە ئەوەندە مەترسیدار بوو ناوی نەخۆشخانەکانی پاریسیان نابوو، "دەروازەکانی مردن".

شتێکی تر خرایەسەر تەکنیکە گشتگیرەکەی کۆرڤیزار لە دەستنیشانکردنی چوارەمی نەخۆشیدا کە داهێنانەتر بوو، ئەویش کولگرتن یان گوێگرتن بوو. هەندێجار پزیشکەکان گوێ لەو دەنگانە دەگرن کە لە جەستەی نەخۆشەکانیانەوە دەبیستری، دەنگی خیزەی سینگ لە هەناسەدا خەڵکانی دەوروبەر گوێیان لێدەبێ، نەک تەنها نەخۆشەکە، ئەو دەنگەی لە ناو سکەوە دەردەچێ، قۆرەقۆڕی سک، دەنگێکی بیستراوە، هەردەنگێکی بیستراو لەو شێوەیە بەڵگەیەکە لەوەی لە لەشی مرۆڤەکەدا ڕوودەدات. پزیشکەکان سەدان ساڵە گوێبیستی ئەم دەنگانە دەبن، جارجار پزیشکەکان ڕاستەوخۆ گوێیان دەخستە سەر سینگی نەخۆشەکە یان سکی تا باشتر ببیستن، بەم بیستنە دەڵێن "بیستنی ڕاستەوخۆ" بەڵام گوێگرتن بەشێوەی ناڕاستەوخۆ، ناوەندێک لەنێوان پزیشکەکەو نەخۆشەکە بوونی هەیە، ئەو ناوەندەش بیستۆکی پزیشکە ئەم ناوەندە پێیدەڵێن "ناڕاستەوخۆ" کە لاینیک[19] (١٧٨١- ١٨٢٦) داهێنەری بوو. لاینیک لەنێو پسپۆرانی کلینیکە پزیشکییەکانی فەرەنسادا. کەسایەتییەکی زۆر ئاڵۆز و بەهرەدارێکی بێ وێنە بوو، ڕەوتی پیشەیی لاینیک زۆر بەئاشکرا گرنگیی بەها دەرەکییەکان ڕووندەکاتەوە لەوەی کێ لەژیاندا بەشداری

19 R.T.H. Laennec.

دەكات كێ پەراوێز دەخرێت، لەبەرئەوەی كاسۆلیكی بوو و لایەنگـــری كۆشـــكی پاشـــایەتی بـــوو، بـــۆیە لەو ڕەوتە سـیكۆلارەی لەسـەردەمی كۆمـار و سـەردەمی ناپلیۆنـدا لە گەشـەكردندا بوو، ئەو دواكەوت، بۆیە نەوەكو مامۆستا نە وەكو پزیشك لەنەخۆشخانە دانەمەزرا تا ئەو كاتەی ناپلیۆن كەوت، و مولْكـداری گەڕێنـرایەوە، دوای ئەوە، لە كانیـاوی فێـرگە فەرەنسـییە نموونەییەكـانی خـواردەوە، بەشـداریی گەورەو كـاریگەری كـرد، بەو سـیفەتەی ڕۆژنـامەنووس و سەرنووسەر و پزیشكی كارامە بوو، سەماعە پزیشكییەكەی كە دروسـتی كـرد سـەرەتا جگە لە دەفتەرێكـی لـوولكراوی پتەو زیاتر نەبوو، بۆ ئەو كچە باڵا توونددو پڕە ئامادەی كرد كە دەیەویســـت گـــوێ لە ســـینگی بگـــرێ، بەڵام یاســـای توونـدوپڕی سـینگی ڕێگربـوو لەوەی ڕاسـتەوخۆ سـەربخاتە سـەر ئەو سـینگە تونـدوپڕەی نەخۆشـەكە، بـۆیە بەخێرایـی بیری لە دروستكردنی سـەماعەیەكی سـەرەتایی كـردەوە، كە لە داری نـاو هەڵكـۆڵراو ئامـادەیكرد، یەكـێ لە لایەكـانی بە قووچەكێك و لایەكەی تری بەچەرمێكی وەكو چەرمی دەف بەستەوە، تـا بە باشـی گوێبیسـتی سینگی نەخۆشـەكەی بێت بە ڕادەی جیـــاواز، جـــگە لەوە ( لاینیـــك مۆســـیقاژەنێكی لێهاتووش بوو).

ڕووداوی بەرەوڕووبـونەوە لەگەڵ ئەم كـچە نەخۆشـەدا بـــۆ ســـاڵی ١٨١٦ لە نەخۆشـــخانەی نیكیـــر دەگەڕێـــتەوە، لەمـاوەی نێـوان سـاڵانی ١٨١٦- ١٨١٩ لاینیـك لەم سـێ ساڵەدا، وەكـو ژیـانی تاكێك لە مێژووی تەواوی پزیشـكیدا داهێنـانی زۆری ئەنجامـداوە. كاتێك بـابەتە زانستییەكەی لە

ساڵی ١٨١٩ بڵاوکردەوە، بە توانابوو لە بەکارهێنانی سەماعە پزیشکییەکەی. زاراوەی زۆری هێنایە ناو بواری پزیشکییەوە کە تا ئەمڕۆش پزیشکەکان لە وەسفی دەنگەکانی هەناسەدا بەکاری دێنن، کاتێ بەهێزەوە دەدوا توانای باوەڕهێنانی بە بەرامبەرەکەی سەبارەت بە نەخۆشییەکانی دڵ و سییەکان بەشێوازی بیستن و کوڵگرتن کە سەماعەکەی بۆی دەستەبەرکرد زۆربەهێز بوو.گرنگییەکی زۆری بەو دەنگە بیستراوانە دەدا کە نیشانەی نەخۆشی "سیل"یان لەخۆگرتبوو. لە سەردەمی لاینیکدا "نەخۆشیی سیل بڵاوێزی مردن بوو"؛ هەمیشە ئەو بەشەی ئەو پڕبوو لە قوربانییەکانی ئەو نەخۆشییە، لە کۆتاییدا خۆیشی بووە قوربانی ئەو نەخۆشییە.

کتێبەکەی لاینیک کە ساڵی ١٨١٩ بڵاوی کردەوە لە دووبەش پێکهاتبوو: بەشی یەکەم دەربارەی چۆنێتی بەکارهێنانی سەماعەی پزیشکی بوو، بەشی دووەم زانستی نەخۆشییەکانی سینگ لە ڕووی توێکارییەوە. لاینیک قوتابییەکی دڵسۆزی قوتابخانەی پزیشکیی فەرەنسی بوو، نەک هەر لە وردەکارییەکانی پرۆسەی دەستنیشان کردنی نەخۆشی پسپۆر بوو، بەڵکو وا ڕاهاتبوو لەگەڵ تەرمی ئەو نەخۆشانەی کە دەمردن بچێتە سەر مێزی توێکاری، کە پرۆسەی بەش بەشکردنی مردووەکەی تیا ئەنجام دەدرا، لەگەڵ ئەو دەرەنجامانەی پێی گەیشتبوو لە ژیانی نەخۆشەکە بەراوردی دەکرد لەگەڵ نیشانەی ئەو زیانانەی بەرتەرمەکە کەوتوون.



(١١) بڕوانە ئەم تابلۆیە مێژووەکەی بۆ سەرەتاکانی سەدەی نۆزدە دەگەڕێتەوە، لاینیک لەکاتی بەکارهێنانی بیستۆکە پزیشکییەکەی، دیمەنی نەخۆشێک لەسەر جێگا لە یەکێک لە بەشەکانی نەخۆشخانەی نیکیر پیشاندەدا، وەکو دەردەکەوێ نەخۆشەکە بێهێزو لاواز کەوتووە، بەدەست نەخۆشیی سیلەوە گیرۆدەبووە.

چوار هەنگاوەکەی سیستەمی ئەزمونگەری پشکنینی پزیشکی – پشکنین بەچاو، دەستلێدان، دەستکوت، و کولگرتن، پێکرا و بەخێرایی نەبوو بەڵکو ناوبڕێک کەوتە

نێوان وەرگێڕانی کتێبەکەی ئۆینبرۆگەر (١٨٠٦) لەلایەن کۆرڤیزارەوە، لەگەڵ ئەو کتێبەی لاینیک لە ١٨١٩ دەربارەی سەماعەی پزیشکی نووسی، واتە زیاد لە دەیەیەکی خایاند. لاینیک ژمارەیەک خوێندکاری فەرەنسی و بیانی فێری بەکارهێنانی سەماعەی پزیشکی کرد، گرووپێک لە پزیشکان بەهای کارە پزیشکییەکانی لاینیکیان لە دەستنیشاکردنی نەخۆشیدا دەزانی، وەرگێڕە ئینگلیزییەکەی جەختی لەوە کردۆتەوە، ئەو نەخۆشانەی چارەسەریان وەرگرتووە لەسەر بژێوی تایبەتی خۆیان، ئەو کەسانە نەیانویستووە خۆیان بخەنە ژێر ئەزمونی سەماعەی پزیشکییەوە، بەڵکو ئەو کەسانەیان هێناوە کە لە چینە هەژارەکە بوون، لە نەخۆشخانەکان و لە سەربازەکان، دیارە ئەم کەسانە لەو خزمەتگوزارییە سوودمەندبوون. ئەو توانا و پسپۆرییەی پزیشکەکان لەنێو نەخۆشخانەدا وەریان گرتبوو، زۆر بەزەحمەت بۆ دەرەوە دزەی دەکرد؛ ئەو نەخۆشانەی لەسەر خەرجی خۆیان دەهاتن و دەرئەنجام هەرچی بووایە لەئەستۆی خۆیان بوو، بەهیچ شێوەیەک بۆیان نەبوو خاوەن بڕیاربن؛ هەروەها پێویستبوو لەسەر ئەو نەخۆشەی بۆ چارەسەرکردن ڕووی لە نەخۆشخانە کردووە، دەبێ ئەوە بزانێت، کە پزیشک لە بەرژەوەندیی ئەودا کاردەکات. تائێستاش ئەو ڕاپۆرتە پزیشکییانەی لە تۆمارە پزیشکییەکاندا پووختەی مێژووی پزیشکی و پشکنینەکانی بۆ نەخۆش تێدا تۆمارکراوە، یان پزیشکەکان داهێنانیان تیاکردووە، زۆر بەکەمی لە نەخۆشخانە فەرەنسییەکاندا دزە دەکەنە دەرەوە، یان بۆ کلینیکە پزیشکییە دەرەکییەکان

دەبـرێن. ئەو کـارە نموونەییـانەی پزیشـکانی فەرەنسـی، لە کـۆلێژی پزیشـکی پـاریس لە ئەنجامیانـداوە، تائێسـتاش کاریگەریی مـاوە، چونکە پێویسـتە ئەم نەریتە ببێتە بەشێک لە ئەقڵییەتەی کە پزیشکەکان لەسـەر جێگە نەخۆشەکانی خۆیانی پێ چارەسەر دەکەن.

## بۆ مردووخانە: پەیوەندیی نێوان زانستی نەخۆشـی و نەخۆشی سەرجێگا

سـالّی ١٧٩٤ کـۆلێژی پزیشـکی پـاریس بە تەواوی ئەو پرۆگرامـانەی کە ڕیفـۆمی تیـاکرابوو جـارێکی تـر کـرایەوە، بەلاّم وەکـو دەڵـێن ڕەگـی ئەم زانکـۆیە بۆسـالّی ١٧٦١ دەگەڕێـتەوە، هەر لەو سـالّەدا ئـۆینبرۆگەر باسـی جەسـتەی بەلێدان کـرد کە هاوکـات بـوو لەگەڵ دەرکەوتنـی کتێبەکەی جیۆڤـانی باتیسـتا مۆرگـانی[20] (١٦٨٢- ١٧٧١) بە نـاوی "دەربارەی سەرهەڵدانی نەخۆشی و هۆکارەکانی" ئەم کتێبە بە کۆڵەکەی پشتی پرۆگرامی زانستی نەخۆشیی فەرەنسـی دادەنرێـت، هەرچـۆن کتێبە بچووکەکەی ئـۆینبرۆگەر بـووە کۆڵەکەی پەیڕەوی نەخۆشی سەرجێگای فەرەنسی.

کتێـبە گەورەکەی مۆرگـانی خـۆی لە خۆیـدا ئینسـایکلۆپیدیایەک بـوو زیـاتر لەوەی کتێبێکی سـەرچاوەیی بێت، بەڕێگەیەکی ئاسایی لەسەرەوە بۆ پەنجەکانی پێ ڕێکی خسـتبوو، کتێـبەکە نـزیکەی ٧٠٠ ڕاپـۆرتی پزیشـکی نەخۆشـەکان و ئەوانەی بـۆ مردووخـانەی بـردوون و لەوێ

---

20 Giovani Battista Morgani.

توێکـــاری بــۆ لاشـــەکانیان کــردووە تێـدابوو، زۆربەیـــان نەخۆشـی خـۆی بـوون. مۆرگـانی زیـاتر تەرکیـزی کـردۆتە سەر ئەو گۆڕانکارییانەی لەکاتی نەخۆشیدا بەسەر جەستەدا دێـن، لەسـەرەوە شـۆڕدەبێتە خـوارەوە بـۆ هەمـوو کـون و کەلەبەرێکی جەسـتە. تۆمـارە پزیشـکییەکان نیشـانەکانی ئەو نەخۆشییانەی تیایە کە نەخۆش خۆی باسی نەخۆشییەکەی کردووە، بەو شێوازەی لای هیپۆکراتییەکان شتێکی باوبووە، خۆشـــی لە گەڵیانـــدا گرنگـــی بە وردەکارییەکـــان دەدات، ســــەرەڕای ئەوەش دەیەوێ بە پراکتیکـــی بۆچوونەکـــانی پشتڕاسـت بکـاتەوە بـۆیە کەیسـەکە دەبـاتە مردووخـانە، لەم لایەنەوە زۆر ســـەرکەوتووتر بـــووە لە پزیشـــکە کۆنەکـــان ســــەبارەت بەو گۆڕانکـــارییە ناســـازانەی لە ئەنجـــامی نەخۆشـــییەوە ڕوودەدن، چـونکە گومـانی تیـانییە پزیشـکە کۆنەکان توێژکاری لاشەیان بۆ مردووەکان ئەنجام نەداوە، کتێبەکەی مۆرگانی کۆمەڵێک سەرنج و تێبینی داهێنەرانەی تیـــایە، شـــێوازی کارەکـــانی کـــاریگەریی گەورەی لەســـەر پێڕەوکـــارانی هەبـــووە. ئەم کتێـــبە بـــۆ زۆربەی زمـــانە ئەورووپییەکـان وەرگێـڕراوە، پێداگری لەسـەر بەکارهێنـانی توێکـــاری کـــردووە، بـــۆ ئەوەی زیـــاتر بە نەخۆشـــییەکان ئاشنابن، پێشئەوەی نەخۆشخانەکانی فەرەنسا ئەم پرۆسـەیە بکەنە کردەیەکی ڕۆتینی.

مۆرگـــانی بـــۆ مـــاوەی ٥٠ ســـاڵ لەهەردوو بـــواری توێکاری و کاری پزیشکی لە زانکۆی پادوا وانەبێژ بووە، زۆربەی ئەو نەخۆشـــانەی لەکتێبەکەیـــدا " دەربـــارەی سـەرهەڵدانی نەخۆشـی و هۆکارەکـانی" ناویـان هـاتووە، لە

کلینیکە پزیشکییە گەورەو تایبەتەکەیەوە هاتوون. هەرچەندە ئەو زنجیرەیەک کاری توێکاری مەزنی ئەنجامدابوو، بەڵام لەلایەن دەستکەوتەکانی فێرگەی پاریسەوە، کارەکانی مۆرگانی کەوتنەژێرەوە، چونکە پزیشکەکانی ئەویَ نیمچە هەمیشەیی بوون، توانییان لە ماوەی دووساڵدا هەرچی راپۆرتی پزیشکی هەیە کۆبکەنەوە، بەقەد هەموو ئەوەی مۆرگانی بەدرێژایی ژیانی کۆی کردبووەوە، نەخۆشخانەکان سەنتەری کۆکردنەوەی هەموو نەخۆشییەکانی مرۆڤ بوون، فەرەنسییەکان ئەو هەلومەرجەیان بەتەواوی قۆزتەوە.

ئەگەر دەستنیشانکردنی نەخۆشی یارمەتی پزیشکەکانی دابێت تاکو دەردی نەخۆشییەکە بدۆزنەوە، ئەوا توێکاری لە مردووخانە باشتر دەتوانیَ ڕاستیی بۆچوونەکان سەبارەت بەودەستنیشانکردنەی ڕابردوو پشتڕاست بکاتەوە، یان ئەگەر بۆچوونەکە هەڵەی تیابوو، چاکی بکەنەوە. پەیوەندی پاسۆلۆجی- کلینیکی پەیوەندییەکی هەمیشە گۆڕاوە، شەقامێکی دوو سایدە بۆ ڕۆشتن و گەڕانەوە؛ ئەو سەرنجانەی لە چاودێری کردنی نەخۆشی سەرجێگا دووبارە و سێبارە دەبنەوە، ڕێخۆشکەرە بۆئەوەی بە درێژایی ژیانی نەخۆشەکە چاودێری کەیسەکە بکەیت، ئینجا لەبەر تیشکی دواسەرنج، لەسەر تەرمەکە، گفتوگۆ لەسەر ئەو ڕاپۆرتە پزیشکییانە بکەیت و دۆخەکان بەراورد بکەیت. پزیشکی کلینیکی خۆی بەکاری پاسۆلۆجی هەڵدەستیَ، چاودێریی نەخۆشەکەی دەکات تا لەژیاندا ماوە، وە لەمردنیشدا چاودێری دەکات تا سەر تەختەی مردووخانە. بۆیە پێشڕەوانی وەکو کۆرڤیزار و لاینیک و ئەوانیدی، لە

فێـــرگەی فەرەنســــی بەردەوام بە تەنیشـــت قەرەوێـــڵەی نەخۆشــــەکەوە بــــوون هەرچــــۆن لە مردووخــــانەکەش بەدوایەوەبوون.

پـاڵنەری ســەرەکی ئەو پزیشـکانە بـۆ گەڕان بەدوای ئەو زیانانەی بەر جەستە کەوتوون، ئەو گۆڕانە پاسـۆلۆجییانەیە کە بەهــۆی نەخۆشــــییەکەوە ســـەریهەڵداوە. فەیلەســـوف فرانســـیس بـــاکۆن[٢١] (١٥٦١- ١٦٢٦ز) ئەم گۆڕانکارییـــانەی نێونـاوە "شـوێن پێیەکانی نەخۆشـی"، لە کرۆکـی بـابەتەکەدا ئەو وێنەیەمـان پیشـاندەدا، کە نەخۆشـی بەنێـو ئەنـدامەکانی جەســـتەدا دەســـووڕێتەوە، ئەو گەشــــتەی نەخۆشـــییەکە کردوویەتـی، ســەرەنجام شــوێن پێیەکانی بەدیـار کەوتـوون، ناسـینەوەی ئەو شــوێن پێیـانە، ئامــانجی ئەو پشـکنینەیە لە مردووخانە بۆ تەرمی مردوویەک دەکرێت.

پزیشـکە کلینیکیـیە فەرەنسـییەکان، بەهەمـان ڕۆحییەتـی پشـکنینی جەسـتەییەوە، کـاری توێکارییـان بـۆ مردووەکـان دەکـــــرد، بەوپێـــیەی دیاردەکـــانی نەخۆشــــی، قەوارەی بەرجەســـتەی مـــادین، بە گـۆڕینەوەی پێشـبینییەکانی ٢٠٠٠ ســـاڵ بە دەرەنجــامێکی مـــاددەی ڕەق، کە بەرجەســـتەیە، دەبینــرێ، دەســـتی لێـدەدرێ، کێشـــی هەیە. ســـەبارەت بەو بـابەتە خـاڤێر بیچـات[٢٢] (١٧٧١- ١٨٠٢) بەسەرسـوڕمانەوە وتـی : "ئەگەر توێکاریـت بـۆ چەنـد لاشـەیەک کـرد" ئەوکـات تیۆرە کۆنەکان دەبنە پووشـی دەم ڕەشـەبا" بیچات تەمەنی (تەمەنـی تەنهـا ٣١ سـاڵ بـوو کـاتێ مـرد) لەو مـاوە کـورتەی

21 Francis Bacon.
22Xavier Bichat .

تەمەنیدا، بەدەستی خۆی توێکاری بۆ چەند لاشەیەک ئەنجامدا، لەگەڵ ئەوەشدا یەکێکە لە پایە گرنگەکانی کردەی پزیشکی لە هەموو پاریسدا، خزمەتی سەربازی بەجێ گەیاندووە، لە نەشتەرگەرەوە بووە بە پزیشک، دواتر تیۆری لۆکالّی نەشتەرگەری و تێڕوانینی بۆ کاری پزیشکی بەدیدێکی فەلسەفییەوە تێکەڵ بە یەکتری کرد. کۆچی دوایی بیچات خەڵکێکی زۆری خەمبار کرد، زۆر بەخێرایی بووە قارەمانی ڕێبازی نوێ لەبیرکردنەوەی کاری پزیشکیدا.

زۆرجار بە "باوکی شانەزانی- histology " ناودەبرێت، لە کاتێکدا هەستی بەوە کردووە میکانیزمی نەخۆشی لەهەر شانەیەک لە شانە لێکچووەکانی لەشدا ڕوودەدات هاوشێوەیە، هەروەها سیرەمی لینجەپەردەکانی دڵ، مێشک، سییەکان، و ناوسک بەهەمان شێوە لەگەڵ میکانیزمەکانی نەخۆشیدا کارلێک دەکەن. بیچات تەنها لەڕێگەی چاوو هاوێنەیەکی دەستییەوە ٢١ جۆر لەو شانانەی ناسییەوە، کە لە لەشدا هەن وەکو شانەکانی ڕووپۆشی ئێسک، دەمارەکان، فایبەرەکان و لینجە پەردەکان، هەروەها دەمارەکان و خوێنبەرەکانیشی بە شانەی تایبەت دادەنا. بیچات بەبەراورد لەگەڵ پزیشکە فەرەنسییەکانی تردا لایەنی پراکتیکی پیادەدەکرد، بەم کارەی پزیشکەکانی تریش چاویان لێدەکرد، لەدیدی ئەوانەوە کارەکانی بیچات، جیاوازبوو لەو ئەزموونە کۆنەی لە نەخۆشخانە فەرەنسییەکاندا پێڕەودەکرا. بەداخەوە لە نەخۆشخانە ژیا ولە نەخۆشخانەش مرد، کاتەکەی دابەشکردبوو لەنێوان سەردانی نەخۆش و مردووخانەدا، لە ڕێگەی بیروباوەڕ و

وزەو تواناكانییەوە بووە سەرچاوەی بەهرەو داهێنان بۆ ئەوانیدی. بەڵام دواجار مۆمی تەمەنی لە تافی لاویدا کوژایەوە.

نەخۆشخانەکانی پاریس خزمەتێکی بێهاوتایان پێشکەش بەو نەخۆشانە کرد کە نائومێد بوون لە چاکبوونەوەیان (پاریس بەتەنها خۆی قەرەوێڵەی زۆر زیاتری لە هەموو بەریتانیای مەزن بۆ نەخۆش هەبوو) ئەو نەخۆشانەی لە چینە بەش مەینەت و هەژارەکە بوون و داوایان لێکرا، گیان و جەستەی خۆیان پێشکەش بکەن، چ لە ژیان و چ لە مردنیاندا، خزمەتی کلینیکی پزیشکییان کرد، بەرامبەر ئەو خزمەتە پزیشکییەی، هەرچییەک بووایە، پێشکەشیان دەکرا. دەستنیشانکردنی نەخۆشی جەستەیی و زانستی نەخۆشی و پەیوەندییان بەیەکەوە، شێوازێکی نوێی لە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ نەخۆشیدا هێنایە کایەوە، هێزێکی نوێ لەناو نەخۆشخانەدا بەرجەستەبوو، بەرە بەرە ڕێکخستنێکی نوێ هاتە بەرهەم ئەویش ڕێگەی پۆلێنزانی nosology ی نەخۆشی بوو، بێچات لەسەر ئەندامەکانی لەش کاریدەکرد، بەشە ڕەقەکانی جەستەی خستە پێشی پێشەوە. دەتوانین بڵێین ئەم وێنەیە فراوانکردنی ڕێبازەکەی هیپۆکرات بوو، بەڵام نەخۆشخانە ناوەندەکەی بوو، شوێنی نەخۆشییەکەش ئەندامەکانی لەشبوون نەک تێکەڵەکان.



(١٢) ئەلفرێد فیلپوا (١٧٩٥- ١٨٦٧) پرۆفیسۆری کلینیکی نەشتەرگەری، لە کۆلێژی پزیشکیی پاریس، بەشداریی کارای کردووە لە بوارەکانی توێکاری، کۆرپەلەزانی، فسیۆلۆجیا، و نەخۆشییەکانی مەمک، ئەم وێنە تاریکە پێناسەیەکی پڕ ئازارو خەماوییە، مردووەکان لەبەرژەوەندیی زیندووەکاندا بەکاردەهێنرێن.

پاسۆلۆجیای ئەندامەکانی جەستە لە کلینیکە پزیشکییەکاندا بابەتێکی زاڵە. پزیشکە فەرەنسییەکان لە ڕێگەی ئەو توێژینەوانەی لەسەر ئەندامەکانی جەستە ئەنجامیانداوە، ناوبانگیان دەرکردووە، وەکو نەخۆشییەکانی دڵ، سییەکان، گورچیلە، مێشک و سیستەمی دەمار، گەدە وریخۆڵە، جگەر، پێست وئەندامی زاوزێ، توێژینەوەکەی کۆرڤیزار لەسەر نەخۆشییەکانی دڵ، وە توێژینەوەکەی لاینێک لەسەر نەخۆشیی سییەکان بەستراون بە داهێنانەکانیانەوە لەبواری دەستنیشانکردنی نەخۆشیدا. پزیشکەکانی تر، ئەلبێرت، لەسەر نەخۆشی پێست، ڕییە لەسەر نەخۆشییەکانی گورچیلە، ئەندرال لەسەر

نەخۆشییەکانی خوێن، ڕیکۆر لەسەر ئەندامی زاوزێ، کارکردن لەسەر ئەم ڕێبازە بۆ فراوانکردنی ئەو چوارچێوەیەیە کە هەموو بەشەکانی تری جەستە بگرێتەخۆ.

بێگومان لە ناو نەخۆشخانەکانی فەرەنسەدا، نەخۆشیی سیل زۆرترین شتی لەبارەوە نووسراوە، لە هەموو نەخۆشییەکان، نەخۆشیی سیل زیاتر لەنێو نەخۆش و پزیشکەکاندا بڵاوە. بۆیە لەسەرەتای سەدەی نۆزدە هۆکاری سەرەکیی مردن لە هەموو ئەوروپادا بە هۆی نەخۆشیی سیلەوە بوو. هیپۆکراتەکان بەوشێوەیە باسی نەخۆشیی سیلیان کردووە، کە نەخۆشییەکی مەترسیدارە، نەخۆشەکە لاواز دەبێت، تای لێدێ، کۆکەی درێژخایەنی تووش دەبێت... لەگەڵ هەندێ نیشانەی تر، بەڵگەی بەهێز هەیە دەیسەلمێنێ نەخۆشیی سیل لە کۆمەڵگەی مرۆییدا بۆ هەزاران ساڵ دەگەڕێتەوە. لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەمدا سیل بە هەموو شوێنێکدا بڵاوبووەوە، هەندێ هۆکار هەن ناچارمان دەکەن زۆربەی کەیسەکانی دەردە سی (phthisis) لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا دەستنیشانی بکەین بە سیل (tuberculoses). ئەم نەخۆشییە کاتێک ناوە تازەکەی وەرگرت کە ڕۆبەرت کوخ (Robert Koch) بەکتریای سیل تی. بی (باسیلی شێوە زنجیرەیی- tubercle bacillus) ی لە ساڵی ١٨٨٢ز دۆزییەوە، بەوپێیەی هۆکاری نەخۆشیی سیلە. بەڵام لاینیک و هاوەڵانی لە ڕووی پاسۆلۆجییەوە نەخۆشی سیلیان ناسیوە، ڕاپۆرتەکانیان سەبارەت بە دەستنیشان کردنی نەخۆشییەکەو بەراوردکردنی لەگەڵ ڕاپۆرتی توێکاری لە مەیتخانە ئەوەمان پێدەڵێ کە phthisis و tuberculosis زیاتر دوو ناون بۆ یەک واتا.

لاینیک ئەوەی بڵاوکردەوە کە دەتوانێ نەخۆشی "سیل بە بیستۆکە پزیشکییەکەی دەستنیشان بکات، ئاماژەی بەو دەنگە تایبەتە کردووە لەبەشی سەرەوەی سینگ، لە کاتی نەخۆشییەکەدا دەبیسترێ، بە پشتبەستن بەنیشانە کلینیکییەکان و نیشانە توێکارییەکان، ئەو خاڵە وردانەی بەسییەکاندا بڵاوبوونەتەوەو زیانیان پێگەیاندووەو پێیدەڵێن دەردەباریکە "سیل" (ئاوسانێکی کەم بە مانای دەقاودەقی وشەکە) یەکێکە لە تایبەتمەندییە جیاکارەکانی نەخۆشییەکە لەهەر کوێیەک بەرچاومان کەوت، دواتر چەند جۆرێکی تری سیلی لەبەشە جیاوازەکانی لەشدا باسکردووە وەکو سیلی لووی لەمفاویی لامل scrofula ، هەوکردنی مێشکی سیلاوی، سیلی ڕیخۆڵە. لاینیک گەشەکردنی نەخۆشیی سیلی سەرەتایی بۆ ئاستی فرەوانتر، شوبهاند بە پێگەیینی میوە، کوخ لە ڕێگەی توێژینەوەکانییەوە لەسەر میکرۆبی سیل ڕاستیی پۆلێن کردنەکانی لاینیکی بۆ ئەو نەخۆشییانەی بەسەریەکەوە تووشی چەند ئەندامێکی لەش دەبن سەلماند، بەڵام لەچوارچێوەی نەریتە پاسۆلۆجییەکانەوە ئەم جۆرە کارانە وەهمێکن لەگەڵ لۆجیکی پزیشکی یەکناگرنەوە، چونکە بیرکردنەوەی ئەو تەنها لەسەر ئەندامەکانی لەش چڕبۆتەوە. بەڵام بۆ هۆکاری دەردەباریکە (سیل)، لاینیک بەهیچ جۆرێک ڕاستییەکەی نەزانیوە، یان ئەگەر لەو چوارچێوەیەشدا بەدوای هۆکارەکان گەڕابێت، بە هۆکارە دەروونی-جەستەییەکانییەوە لکاندووە، پێیوابووە هەستە بەهێزەکان پەیوەندییەکی پتەویان بە نەخۆشییەوە هەیە. ناسینەوەی نەخۆشییەکان لەلایەن لاینیکەوە، لە ڕووی پاسۆلۆجییەوە هەردوو خاڵی بەهێز وخاڵی لاوازی لەخۆ

گرتووە، بە تەرکیزکردنە سەر دوا قۆناغی نەخۆشییەکە کە دیاردەی لەناوبردنی جەستەیە، پزیشکە کلینیکییەکان خۆیان لەقەرەی ئەو میکانیزمانە نادەن کە دەبنە هۆی ئەو زیانگەیاندن و لەناوبردنە، هەروەها دەرک بەو فاکتەرانە ناکەن کە دەبنە هۆی گۆڕانکاری. بەڵام خاڵی زۆر پۆزەتیڤ لەوەدایە لە نزیکەوە چاودێری کردنی ئەو پەیوەندییانەی لەنێوان نیشانەکانی نەخۆشییەکەو ئەو گۆڕانکارییە پاسۆلۆجییەی بەسەر ئەندامە زیانبەرکەوتووەکان ڕوودەدەن، لەو ڕێگەیەوە توانییان نەخۆشییەکی زۆر لەیەک جیابکەنەوە، دواتر ئەو نەخۆشییانە لەنێو فەرهەنگی زاراوە پزیشکییەکاندا شوێنی خۆیان قایمکرد، تەنانەت دوای ئەوەی تیۆری میکرۆبەکانی نەخۆشی دەرکەوتن و ئەو گۆڕانکارییانەی لە پێوەرەکانی دەستنیشانکردنی نەخۆشیدا بەدوایدا هاتن. باشترین نموونە لەسەر ئەوە جیاکردنەوەی تای تیفۆسە لە تای تیفۆئید، هەردوو وشەکە هاوشێوەن نیشانەی نەخۆشییەکانیش ئەوەندە لە یەکەوە نزیکن، لە کتێبە پزیشکییە کۆنەکاندا بە زەحمەت لێک جیادەکرێنەوە، هەریەکەیان جۆرێکە لە تای جیاواز، ئەم تایە لە ڕابردوودا ، لە پۆلێنکردنی نەخۆشییەکان لەسەدەی هەژدەی زایینیدا بە نەخۆشی دادەنرا، "تا" نەخۆشی بوو بۆ چەند جۆرێکی جیاواز دابەشکراوە بەو سیفەتانەی : پچڕ پچڕە، بەردەوامە، تیفۆسییە، تیفۆیدییە، نزمە تایە، نێرڤییە، گەنیوە، خرۆشاوە. " تای تیفۆئید" تا ئێستاش لای ئێمە پەسەندە، "زەردە تا" ناوی ڕاستەقینەی ئەو نەخۆشییەیە کە هۆکارەکەی ڤایرۆسە، ئەم زاراوانە بە بەردەوامی بەکاردەهێنران تەنانەت دوای ئەوەی پزیشکەکانی سەدەی نۆزدەهەم هێواش هێواش

گەیشتنە ئەوەی پێناسەی "تا" بکەن بەوەی نەخۆشی نییە، بەڵکو نیشانەیەکە لە نیشانەکانی نەخۆشی.

تا رادەیەک جیاوازی نێوان تیفۆس و تیفۆئید پەیوەندی بەو هەوڵە تاکە کەسییانەوە هەبوو کە ژمارەیەکی زۆر لە پزیشکەکان کاریان لەسەر دەکرد، هەریەکە لەو پزیشکانە لەژێر کاریگەریی قوتابخانەی پزیشکیی فەرەنسیدابوون، بەلام لە بەریتانیا، لە ئەمەریکا تەنانەت لە ناو فەرەنسەدا کاردەکەن؛ لە فەرەنسا پییەر لۆی[٢٣](١٧٨٧- ١٨٧٢) ئەو پێوەرانەی دانا کە لە زانستی نەخۆشیی تیفۆئیددا بەکار دێن، دانانی ئەم پێوەرانە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٨٢٩. رەوتی پیشەیی پییەر لۆی وێنەیەکی بچووک کراوەی ئەو سەردەمەی فەرەنسایە لە بواری پزیشکیدا، لەبەرئەوەی هێشتا تەمەنی بچووکتر بوو لەوەی راهێنان لە سەر کاری پزیشکیی نوێ بکات، چەند ساڵێک لە روسیا بوو پێشئەوەی لە ساڵی ١٨٢٠ بگەڕێتەوە پاریس، باوەڕی وابوو بە گوێرەی پێویست سەر لە نەخۆشییەکان دەرناکات، بۆیە وازی لە کاری پزیشکی هێناو لەسەر خەرجی خۆی، پەیوەندی بە نەخۆشخانەی شارێتییەوە کرد، لەماوەی شەش ساڵدا زیاتر لە ٢٠٠٠ کرداری توێکاری لە مەیتخانە ئەنجامدا لەبەرئەوە لە هەدوو بواری کلینیکی پزیشکی و دۆزینەوەی نەخۆشییەکان لە رووی زانستییەوە سەرکەوتنی تۆمارکرد، وە راپۆرت و تۆمارە پزیشکییەکانی لای خۆی پاراست. ئەو راپۆرت و تۆمارە پزیشکییانە لەداهاتوودا بوونە بنەمایەک بۆ لێکۆڵینەوەکانی سەبارەت بە دەردەباریکە و تای ڕیخۆڵە

23pierre louis .

(تایفۆئید). لۆی لیمفەگری ئاوساوەکان (پینەی پایەر) ی لە ناوپۆشـــی ڕیخـۆڵە گەورەدا ناسـییەوە، ئەم دیـاردەیەی بە نیشـانەی نەخۆشـیی تـای ڕیخـۆڵە وەسـفکرد. هەریەکە لە ولیام جینەر[24](11815 -1898) لە لەندەن، لەگەڵ جێرهـارد[25] (1809- 1872) لە فیلادلفیـا وچەند کەسـێکی تـر تەواوکەری کارەکـانی لـۆی بـوون، لە جیـاکردنەوەی دوو نەخۆشـــی لە یەکتـر. لەنیـوەی یەکەمـی سـەدەی نـۆزدەدا، توێکـاریزانی لە ڕووی زانســـتی نەخۆشـــییەکانەوە شـــاژنی زانســـتە پزیشـــکییەکان بـــوو. بەڵـــگەی بەهێـــزی ســـەبارەت بە نەخۆشـــییەکان پێشـــکەش بە پزیشـــکەکان دەکـرد. ئەمەش دەبـووە هـۆی گشـتاندنی پـۆلێنی نەخۆشـییەکان بەشـێوەی جیاجیا کە لە زەمەنـی ڕابردوودا دانرابـوو، ئەگەر بەکۆمەڵ نەخـــۆش ڕووی لەنەخۆشـــخانەکان نەکـــردایە، ئەم ســـەرکەوتنانەش بەدینەدەهـاتن، مەبەسـت لەو نەخۆشـانەی ڕێخۆشـــکەر بـــوون بـــۆ پزیشـــکەکان لەڕووی کلینیکـــی و پاســـۆلۆجییەوە بییـــانبینن، زۆرجـــار بە ســـووکایەتییەوە جەسـتەی مرۆڤیـان بە "مـادە"ی زۆروزەوەنـد نـاودەبرد. گەمەی ژمارەکـان، ئەم دەسـتەواژەیە لەلایەن لـۆی خـۆیەوە بەکارهێنرا، "ڕێگەی ژمارەیی" کۆڵەکەی سێیەمی لـۆی بـوو، ئەم ڕێگەیەی بەکاردەهێنا بۆ ئەو وێنانەی لای دروستدەبوو، لە دەستنیشانی نەخۆشییەکاندا بەش بەشی دەکرد، هەروەها ئەو ڕێـگەیەی وەکـو داتـا لە هەڵسـەنگاندنی چارەسـەردا بەکاردەهێنا.

---

24 William Jenner.
25 W.W.Gerhard.

**فێربوونی ئامار**

هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئەو ژمارە زۆرەی نەخۆش بۆ سەردانی پزیشک مەسەلەیەکی تازە نییە، هەروەکو چۆن نەخۆشخانەکانی پاریس کۆمەڵێ کێشەی تریان بەرەو ڕوو دەبێتەوە، پزیشکە سەربازییەکان لە ڕەگەزنامە جیاوازەکان، زۆرجار بۆ چارەسەری ئەو کێشانە ناچار دەبوون، ئامار پێشکەش بکەن، پزیشکی نەخۆشخانەکان لە "مەدەنی و سەربازی" هەستیان بە پێشکەشکردنی پووختەی ئاماری سالآنە بۆ کەیسە تایبەتەکان و نەخۆشییە دەستنیشانکراوەکان و جۆری چارەسەرەکان و بڕی دەرمانە دابەشکراوەکان کردووە. بەڕاشکاوی مرۆڤ بەشێوەیەک لە لۆی دەڕوانێت کە لووتکەی گەشەکردنە لە سەردەمی ڕۆشنگەریدا لەنێو فاکتەکانی ئەو سەردەمەدا، لەتێکەڵکردنی نێوان داهێنان و کاریگەریدا، لەنێو ئەو پزیشکانەی لەم دواییانەدا لە لووتکەی گەشەکردندا بوون هەڵەیەک هەیە لە کاری پزیشکییدا لە پاریس، لۆی کاریگەرییەکی جیهانیی هەبوو، وانەی بە ژمارەیەک لە خوێندکارە بیانییەکان دەوتەوە لە هەر کەسێکی تر زیاتر تێڕوانینی فێرگەی فەرەنسی گۆڕی، بابەتە کورتەکەی سەبارەت بە "کلینیکی فێرکاری" لە ١٨٤٨ وەرگێڕرایە سەر زمانی ئینگلیزی، پوختەیەکی نایاب بوو سەبارەت بە هەردوو پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن لەبواری پزیشکیدا. توانایەکی باشی هەبوو لە قەناعەت پێهێنانی پزیشکانی هاوڕێی، تا بەشێوازی کۆن بۆ هەموو نەخۆشییەکان کەڵەشاخ ئەنجام نەدەن. لە ساڵی ١٨٣٥ سەبارەت بەم بابەتە لێکۆڵینەوەیەکی پووخت و تایبەتی ئەنجامدا، تا ئێستاش

یەکێکە لەباشترین کارە باشەکانی ئەو، بەلام کولتووری ئەم مۆنۆگرافە لە میتۆدەکەیدایە نەک لە ڕاگەیاندنی پەیامەکەی. لەم کتێبەدا "چەند لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی کاریگەرییەکانی خوێنگرتن لە هەندێ لە نەخۆشییەکانی هەوکردندا" لۆی هەڵسەنگاندنێکی ئەنجامداوە لەسەر کاتە جیاوازەکان لە خوێنگرتن (زوو یان درەنگ)، برەکەی (کەم یان زۆر) بۆ حاڵەتی نەخۆشیی هەوکردنی سییەکان. هەروەها ئەم لێکۆڵینەوەیە باسی بەکارهێنانی برە جیاوازەکانی تارتاری ڕشێنەوە Tartar emetic (خوێیەکی ژەهرینە لە مەیانی پزیشکی و بۆیەکردندا بەکاردێت بریتییە لە تارتارانی پۆتاسیۆمی ئەنتیمۆن. و) ی کردووە. ئەمڕۆ وەکو یەکێک لە هەوڵەکانی لۆی بەبیری دێنینەوە، ئەم شێوازە چارەسەرە دابەشکردنی نەخۆشە لێکچووەکانە بۆ گرووپ. ئینجا بەراوردکردنی دەرەنجامەکان لەگەڵ چارەسەرە جیاوازەکاندا. لەڕاستیدا لۆی تەکنیکی ئەزمونی کلینیکی بەکاردەهێنا، بەلام شێوازی پرۆتۆکۆلەکەی لەگەڵ نەخۆشدا لەگەڵ شێوازی سەردەمی ئێستادا ناگونجێت. سەرنج دەدەیت لۆی مەسەلەی خوێنگرتن ڕەتناکاتەوە، بەڵکو هەڵسەنگاندنێکی بۆ کاتی خوێنگرتن و بڕی ئەو خوێنەی دەگیرێت ئەنجامداوە.

لێکۆڵینەوە بچووکەکەی لۆی هەرچەندە سەنگی خۆی لەنێو کتێبە کلاسیکییەکاندا هەیە، بەلام خاڵی ناکۆکیی نێوان لۆی و برۆسی[٢٦] (١٧٧٢- ١٨٣٨) بوو، ف.ج.ڤ. برۆسی، گەشەی بە سیستەمی (پزیشکی فسیۆلۆجی) دا لە

---

26F.J.V. Broussais.

بەرەنگاربوونەوەی سیستەمی توێکاریی چەقبەستوو، کە زۆربەی پزیشکە کلینیکییە فەرەنسییەکان پێڕەویان دەکرد. چاودێریی ژمارەیەک لەو نەخۆشانەی دەکرد کە دواتر لە مەیتخانە توێکاری بۆ لاشەکانیان دەکات و نیشانەی وروژانی درێژخایەن لە گەدەیاندا بەدی دەکات، ئەو سیستەمەی برۆسێ پێڕەویی دەکرد پێیوایە سەرچاوەی هەموو نەخۆشییەکان گەدەیە، دیاردەی ئەو برینە لۆکاڵییانەی لێرەو لەوێی ئەندامەکانی لەشدا سەرهەڵدەدەن سەرەتا لە گەدەوە دەست پێدەکات. وە چارەسەری نموونەیی بۆ ئەو هەوکردن یان وروژانە خوێنگرتن "کەڵەشاخ" ە، بۆ ئەو مەبەستەش بەکارهێنانی زالووی پێباشتربووە لە خوێنگرتن لەڕێگەی بریندار کردن بە نەشتەر. ساڵی ١٨٣٠ زنجیرەیەک گفتوگۆی توند لەنێوان برۆسێ و لۆی دا دێتە ئاراوە. برۆسێ بە پەرۆشەوە خەریکی هەندێ چارەسەری پزیشکییە، بەڵام لۆی لەناخەوە ڕەشبینە لەوەی کاری پزیشکی بتوانێ سنوورێک بۆ نەخۆشی دابنێت، بۆیە لۆی لە پێشەنگایەتیی ئەزموونە کلینیکەکاندا لەچوارچێوەی دەمەقاڵەیەکی بەردەوام لە گەڵ ڕکابەرەکەی برۆسێدا، کەوتەوە کار.

هەرچەندە ڕاوبۆچوونە دینامیکییە، فسیۆلۆجییەکەی برۆسێ سەبارەت بە نەخۆشی کاریگەریی بەردەوامی هەبوو، بەڵام ئەو بۆچوونە سەرەکییەی سەبارەت بە تەواوی نەخۆشییەکان هەیبوو گوایە سەرچاوەکەی وروژانی گەدەیە، زۆر درێژەی نەکێشا. لەبەرامبەردا میتۆدە ژمارەییەکەی لۆی کە خۆی داهێنەری بوو، بووبە

پێویستییەک بۆ کاری پزیشکیی نوێ؛ ژمارەکان بوون بەڕاستی، چ لە ڕیزکردنی جۆری نەخۆشییەکاندا، چی لە هەڵسەنگاندنی چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشیانەدا، لەگەڵ چەند قوتابییەکی خۆیدا گومانی بەرامبەر چارەسەرەکان هەبوو، لەڕاستیدا پێشتریش ئەم هەستە لە ناو نەخۆشخانەکانی پاریسدا هەبوو، چونکە خەمی پزیشکەکان دەستنیشانکردنی وردی نەخۆشییەکان بوو، لەڕێگەی توێکاری مردووەکانەوە. هەمیشە نەخۆشەکان کە دەچوونە نەخۆشخانە، پێشبینییەکانیان زۆر سنووردار بوو، چونکە ئەو دەم دەسەڵاتی پزیشکەکان لە لووتکەدا بوو، دۆخەکە تا ئەم نزیکانەش بەردەوامی هەبوو، تا ئەو کاتەی پەیوەندیی هێزەکان لە پاریسدا گۆڕانکاریی بەسەردا هات، نەخۆش سەربەخۆیی خۆی بەدەست هانی، هەیمەنەی ئابووری باڵی بەسەر دۆخەکەدا کێشا، دامەزراندنی پایەی بەڕێوەبەری پزیشکی بووە هۆی ڕێکخستنەوەی هەیکەلی هێزەکان لە کاری پزیشکی و نەخۆشخانەکاندا.

نابێت بەوشێوەیە لە لۆی بڕوانین، کاتێ هەست بەوە دەکات دەرمان وچارەسەری پێویست لەبەردەست نییە بیبەخشێتە نەخۆشەکانی، کەواتە خیانەتی لە نەخۆشە کڵۆڵەکانی کردووە، بەڵکو هەستکردنی بەو ڕاستییە ئەوە دەگەیەنێ، ڕاستۆگۆیانە کێشەکەی بۆدەوروبەر ئاشکرا کردووە، لە ڕێگەی ئامار و داتاو هەڵسەنگاندن و بەراوردکردنەوە، ئەم چالاکییە زۆر بەئاسانی دەتوانرێت لە نەخۆشخانەدا ئەنجام بدرێت.

## نەخۆشی جەستەیی و نەخۆشی دەروونی

دەوروبەری ساڵی ١٨٥٠، کاری پزیشکی لە نەخۆشخانەکانی فەرەنسادا ناووشۆرەتی پەیداکردبوو. ڕێبازی تێگەیشتنی نوێ لە نەخۆشی لەڕێگەی ئەزموونەوە لەوە گەورەتر بوو کاری پزیشکی تەنها چاودێری کردنی نەخۆش بێت، کەمبوونەوەی کرداری توێکاری و پشتبەستن بەو ئەزموونانە، هەموو ئەمانە وایکرد موعجیزەی کاری پزیشکی فەرەنسی زیاتر لە جاران گرنگیی خۆی هەبێت، لە لووتکەی ئەو گەشە کردنەدا هەزاران خوێندکار لە هەموو شوێنێکی جیهانەوە ڕوویان لە پاریس کرد بە مەبەستی خوێندن دواتر دەگەڕانەوە بۆ بەریتانیا وئەڵمانیا ونەمسا وئیتاڵیا وئەمەریکا وهۆڵەندا؛ تەنانەت هەندێکیان کۆلێجی پزیشکی ونەخۆشخانەیان کردەوە. لەسەرەتای سەدەی نۆزدەدا ئیتر کۆلێجی پزیشکی پاشکۆی نەخۆشخانە نەبوو. خۆی بووە دامەزراوەیەکی سەربەخۆ لە پلەی دووەم. کاتێ زانکۆ نوێیەکەی لەندەن لە ١٨٢٠ کرایەوە (کۆلێجی پزیشکیی ئێستا)، یەکەم کار کە ئەنجامیاندا دامەزراندنی نەخۆشخانەی فێرکاری بوو، ئەم میتۆدە لە هەموو لایەکی جیهان دووبارە بووەوە، تەنانەت لەشارە بچووکەکانی ئەڵمانیشدا، خوێندنی پزیشکی کلینیکی لەڕێگەی تیۆری و ڕوونکردنەوەوەو خوێندنەوە بوو نەک کاری پراکتیکی.

لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە، خوێندنگەی تایبەت لە ئەمەریکا کرایەوە بەبێ بوونی نەخۆشخانە وتاقیگە، بڕوانامەی پزیشکی دەدرایە خوێندکارەکان بەرامبەر بە کرێی خوێندنی مانگانە. هەرچەندە ئەو خوێندکارانەی لە پاریس دەگەڕانەوە یان دەرچووی فێرگە پزیشکییە

تایبەتەکـانی کەنـــاری ڕۆژهەلات بـــوون وەکـــو زانکـــۆی پنسـلڤانیا، نائومێد بوون لەو شـێوازە فێرکارییەی هـاتە نێو پیشەی پزیشکییەوە، یاسای ئەمەریکـی ڕێگەی خۆشکرد بۆ کەرتی تایبەت و پارێزگاری لێیان دەکرد، تا چەند دەیەیەک لە سەدەیە ئەم شێوازە بەردەوام بوو، بەلام دواتر زانکۆی جۆنز هۆپکنز johns hopkins کە ساڵی ١٨٧٦ لەئەمەریکا دامەزرا ئامـانجی ئەوە بـوو هاوشـێوەی خوێنـدنی بـالای ئەڵمانی لە خزمەتی توێژینەوەی زانستیدا کار بکات. هۆپکنز لەگەڵ ئەوەی پـارەیەکی زۆری لەو بـوارەدا خەرج کـرد ( خێرخـواز و وەبەرهێنەرێکـی ئەمەریکـی بـوو لەبواری هێڵـی ئاسنیدا کاریدەکرد و یەکێکە لە هاوڕێیانی ئاینی "کویکەرز") لەسـەرەتادا کـردنەوەی کـۆلێجەکە نـزیکەی دوو دەیەی خایاند، پێداویستییەکانی زۆر بـوو. بەلام نەخۆشـخانەکەی لە ١٨٩٣ کرایەوە ، کۆلێجەکە لەسـەر ئاراسـتەیەکی ئەڵمـانی بـۆ بواری توێژینەوە، ئاراستەیەکی فەرەنسی لە بواری پراکتیکدا چالاکییەکـانی ئەنجامـدەدا. پرۆفیسـۆر ویلیـام ئۆسـلەر[27] (١٨٤٩- ١٩١٩) یەکێکە لەو "چوار گەورە" یەی کە دەستەی فێرکـردن و ڕاهێنـانی زانکـۆی پزیشـکی بـوون لەسـەرەتای دامەزراندنی کۆلێجەکەوە، تا ئێستاش ئۆسلەر جێگەی ڕێزو شـکۆبەرزییە لای پزیشـکان، چـونکە ڕاهێنەرێکـی کلینیکـی، نووسـەر و مێژوونـووس و وتـار نـووس و مامۆسـتایەکی زانستخوازی مرۆڤدۆست بوو، سـەرچاوەیەکی زۆری کتێبـی کۆکردەوە. ڕێبازی زانستی ئەڵمانی لە زانکۆی جۆنز هۆپکنز پێڕەودەکـرا ، بەلام داهێنـان و گەشـەکردنی نەخۆشـخانە

---

27 wiliam osler.

فێرکارییەکـــــانی فەرەنســـــاش شـــــوێنەوارێکی تەواوی بەجێهێشـــت: وەکـــو ســـوورِانەوەی ڕۆژانە بە قاوشـــەکاندا "تـــوورکردن" کە گەورە پزیشـــکێک تێپەڕ دەبـێ کۆمەڵێـک پزیشـــکی مـــوقیم و کۆمەڵێـــک خوێنـــدکاری پزیشـــکی و بەدوایەوەن بە مەبەســـتی فێربـــوون، لەگەڵ پەرســـتارێک، پزیشـکەکە سـەردانی یەکەیەکەی قەرەوێڵەی نەخۆشـەکان دەکاو لە دۆخی نەخۆشییەکەیان دەپرسێ و گفتوگۆ لەسـەر دۆخەکە دەکەن؛ لە سـەردانە گەورەکانـدا یەکـێ لە پزیشـکە موقیمەکـان باسـی ئەو حاڵەتـانە بـۆ هاوڕێکـانی دەکـات "لە پزیشـــک و خوێنـــدکاران" کە مـــایەی گرنگـــی پێـــدانە بەسەرپەرشتی پزیشکێک لەپلەیەکی بالاتر و شـارەزاتر لەو مـوقیمە. زۆرجـار دوای شـەن و کەوکردنـی تۆمـار و فـایلی نەخۆشەکە و ڕەوتی نەخۆشییەکە و جۆری چارەسـەرەکەی وتـووێژ سـەبارەت بە نەخۆشـییە جیاوازەکـان دەکەن (واتە نیشانە وهۆکاری نەخۆشییەکە بۆ ئامادەبووان)، لە کەیسـی مردنەکانـدا پزیشـکێکی پاسـۆلۆجی ئەنجـامی توێکارییەکـان دەخـــاتە بەرچـــاو، ئینجـــا بەراوردێـــک لەنێـــوان ژیـــانی نەخۆشـەکەو هۆکـاری مـردنەکەی دەکـات، بە گوزارشـتێکی لۆجیکیی گونجاو دەری دەبڕێت.

لە نەخۆشـــــخانە فێرکـــــارییە گەورەکانـــــدا، هەمـــــوو پسپۆرییەکی پزیشکی و نەشـتەرگەری بەڕێوەبەری تـایبەتی خـۆی هەیە وەکـو: پزیشـکیی منـدالان، نەخۆشـییەکانی دڵ، نیۆرۆلـۆجی، منداڵبوون، نەشـتەرگەریی ئێسـک و پزیشـکیی لـووت و گـوێ وقـورگ. بـۆ هەر قاوشـێک لەم بەشـانەش قەرەوێڵەی تـایبەت بەخۆیـان هەیە. دووجـۆر جەولەی tour تێدا دەکرێت، گەڕانی نێو قاوشـەکان، وگەڕانـی گەورە. بەڵام

یەکێک لەپسپۆرییەکان کە زۆر کەمە ئەویش پزیشکیی دەرونییە، هەرچەندە بە دەروونزانی دەوترێت نیوەی کاری پزیشکی، لەبەر بەربڵاویی نەخۆشییە دەرونییەکان، لەجیاتی ئەوە ئەو نەخۆشییانەی تووشی باری دەرونیی مەترسیدار دەبوون، جاران پێیان دەووت شێتی یان دێوانەیی، دامەزراوەی تایبەتیان بۆ ئامادەکردن، ئەم دامەزراوە سەربەخۆیە بۆ شێتەکان ئامادەکرابوو، جیاواز بوو لە دامەزراوەی نەخۆشخانە ئاساییەکان لەسەرەتای سەردەمی نوێ، نەخۆشخانەی شێتەکان هەر بە ناوەکەیدا دیارە ستەمکارانەیە، دامەزراوەیەکی بچووک بوو ئامانجی سوودی مادی بوو، زۆرجار ئەو کەسانە بەڕێوەیان دەبرد کە هیچ پێشینەیەکی پزیشکییان نەبوو، پێچەوانەی نەخۆشخانە گشتییەکان، ئەم نەخۆشخانەیە تایبەت بوو بە خانەدانەکان، چونکە ڕەفتاری کەسەکە نامۆ بوو، تووشی هەلوەسەو وڕێنە دەبوو، ئەمەش مایەی شەرمەزاری بوو بۆ خزم و کەسە نزیکەکانی، ئەم جۆرە دامەزراوانە بە ناوی بەناوبانگترین دامەزراوەی نەخۆشی دەروونیی بەریتانییەوە ناونرا تاکو هاوتای ئەو وشە ئینگلیزییە بەکارهاتووە بێت، ئەویش دامەزراوەی بێدلام، کورتکراوەی ناوی تەواوی " بیت لحم" یان سانت ماری، بیت لحم، ئینجا بووە "تۆم ئۆ بێدلام" شێوازی کەسایەتییەکی خەیاڵییە، شەکسپیر لە شانۆگەری "لیر شا" دا بەکاری هێناوە، وەکو بەڵگەی ئەو ماتی و گۆشەگیرییەی نەخۆشە دەروونییەکان هەستی پێدەکەن.

بێـدلام قەوارەیەکـی نائاسـایی بـوو لەنێـو دامەزراوە دەروونییەکانـدا، کەسـانی بەخشـندەو خێرخـواز داهـاتی ئەو دامەزراوەیەیـان دابـین دەکـرد، بەڵام دەسـەڵاتداران سەرپەرشـتییان دەکـرد. زۆربەی ئەو نەخۆشـخانانە بریتـی بـوون لە دامەزراوەی بچـووک، موڵکـدارییەکەی دەگەڕایەوە بۆ لایەنە تایبەتەکـان، کە فایلەکانیـان زۆردەمێکە، شـاراوەن، بەڵام ئەو نەخۆشـخانانە شـوێنێکی تـایبەتی لە هـزرو هۆشـی گشتیدا داگیرکردووە، شێتبوون خراپترین کێشـە بـوو خەڵک لەسـەدەی ڕابـردوودا لێـی دەترسـان (لە ئێسـتادا خڵەفـان زۆرجـار و لای زۆرکەس جێـی ئەو نەخۆشـییە دەگـرێتەوە، بەڕادەیەک لە شـێرپەنجە ترسـناکترە). لە ڕاسـتیدا نەخۆشـخانەی ئاسـایی و نەخۆشـخانەی شـێتان، دووشـتی هـاودژن، نەخۆشـخانەی شـێتان، شـەرەفی ئەوەی پێنەبـڕاوە وەکـو نەخۆشـخانە نـاوببرێ، بـۆیە "شـێتخانە" ی بەرامـبەر وشەکە ئینگلیزییەکە بەبەردابڕا. دۆزینەوەی نەخۆشییەکە لە نەخۆشـخانەی شـێتان، پشـتی بە گێـڕانەوەی قسـەی دراوسـێکان یـان ئەنـدامانی خێـزانەکە، یـان سـەرنجدان لە ڕەفتـاری نەخۆشـەکە دەبەسـت. بەڵام ئەو پزیشـکانەی هەوڵیـان دەدا شـوێنە زیـان لـێ کەوتـووەکە بـدۆزنەوە، مەسـەلەکە وەکـو هەر سـەرەتایەکی کـردەی پزیشـکی لە پـاریس، تووشـی نائومێدی دەکـردن، چـونکە مێشـکی شـێت زۆر بەکەمـی ئامـاژە بە هۆکـارە دیاریکراوەکـان دەکـات لەو نیشانانەی لە نەخۆشەکەدا دەردەکەون، شـێتی نەخۆشـییەکی ئەقڵیـیە، جەسـتەیی نیـیە، تەنـانەت ئەگەر بە گـوێرەی ئەو کولتـوورە سـەپێنراوەش بێـت کە پێیـوایە تایبەتمەنـدییەکانی

مرۆڤ جیاوازە لە بوونەوەرەکانی تر، ئەقڵ و بەرپرسیاریێتی ئەخلاقــی توانـــای جیــاکردنەوەی هەڵەی لە ڕاســتی هەیە، لەڕێــگەی ئەو ڕوحە نەمـــرەوەیە خـــودا خۆشـــیدەویێن، کە ئەقڵت لەدەستدا مرۆڤایەتیشت لەدەستداوە.

لە چەند لایەنێکەوە ئەم وردەکارییە فەلسـەفییە و گفتوگۆ زارەکییـە خـراوەتە بەرباس، لەگەڵ زیـادبوونی تێکەڵبـوونی پزیشـکەکان لە "بازرگـانی کردن بە شـێتەکانەوە" ئەم جۆرە نەخۆشـــییە بـــووە مـــایەی سەرنجڕاکێشـــان، بەهەرحـــاڵ پزیشـــــکەکان ڕەفتــــاری لەگەڵ دەکەن. زۆرجــــــار بە دامەزرێـنەری پزیشـکیی دەروونیــی نوێیـان وتـووە بـاوکی پزیشـکی دەروونـی، ئەم نـاوە لە شـوێن خۆیـدایە، ئەم پیـاوە فیلیپ پینێل[28] (١٧٤٥ -١٨٢٦)بوو، لەبەرئەوەی پێش شـۆڕش دانەری کتێبـی پـۆلێن کردنــی هەمــوو نەخۆشـــییەکان بــوو (ئەوبـــوو زاراوەی neurosis واتە نەخۆشـــی شـــێتگیری) داهێنـاو لە پیشـەی پزیشـکیدا کـاری لەسـەردەکرد، وتـارێکی سـەبارەت بە گرنگیـی نەخۆشـخانە فێرکـارییە کلینیکییەکـان نووســـی، لە دەمـــی شۆڕشیشـــدا وەکـــو پزیشـــکێک لە نەخۆشـخانەی Bicetre بۆ پیـاوان و ئینجا نەخۆشـخانەی Salpetriere بۆ ئافرەتـان دامەزرا، کـاریکرد، هەریەکە لەم نەخۆشخانانە نەخۆشخانەی گشتی بوون، ژمارەیەکی زۆری نەخۆشیان لەخۆ دەگرت، لە لەشفرۆش و پەڕاگەندەو منداڵی بێ سەرپەرشت و پیروپەککەوتە و کەسانی ناتەواو لەڕووی ئەقڵییـەوە، پـڕ بـوو بـوون، جـگە لەو کەسـانەی مەترسـین

28 philippe pinel.

بۆسەر خەڵک یان ناتوانن لە کۆمەڵگەدا خۆیان بەرنەپێوە. ئینجا شۆڕش هەستا بە گۆڕینی ئەو نەخۆشخانانە بۆ چارەسەری نەخۆشە دەروونییەکان، پینیل لەکاتی کارکردنی لە نەخۆشخانەی سالپیترێر لەگەڵ تێپەڕینی کاتدا پرۆگرامی "چارەسەری ئەخلاقی" دامەزراند، کاری لەسەر ئازاد کردنی ژنە حیجز کراوەکان کرد، بەڕێگایەکی زۆر مرۆییانە چارەسەری ئەو ژنانەی دەکرد، هەرچۆن لە ئینگلتەرە ڕێبازی ئاینیی کویکەرز لە سەر بنەمای تیوک، لە خانەی یۆرک ڕیتریت، بنەماکانی چارەسەری هاوشێوەیان ئەنجام دەدا، کە خۆی لە چارەسەری ئەخلاقیدا دەبینییەوە، لەسەر ئەو بنەمایە هەمان شت لە ئیتاڵیا لەسەر دەستی ڤینچینزو کیارۆجی[29] (١٧٥٩- ١٨٢٠) پیڕەو کرا.

وردەکاریی چارەسەری ئەخلاقی لەنێو مێژوونووساندا هەرایەکی زۆری نایەوە ، بەڵام ئەم فۆرمە لە چارەسەری ئەخلاقی سەرنجی خەڵکەکەی ئاراستەی شێتەکان کرد، واتە لەم سەردەمەدا پسپۆریی دەروونی لەنێو کایەی پزیشکیدا سەریهەڵدا. لەماوەی سێیەکی سەدەی نۆزدەدا، کۆمەڵەی پزیشکەوانی دەروونی لە ئەمەریکاو زۆربەی وڵاتانی ئەوروپادا دامەزرا، ئەم کۆمەڵانە بەسەرکەوتوویی کەمپینیان ڕاگەیاند بۆ دامەزراندنی تۆڕی نەخۆشخانە دەروونییەکان، (پێیان دەوترا پەناگەی دەروونی asylum ) ئیتر لێرەدا چارەسەرە تەقلیدییەکانی وەکو کەڵەشاخ و مادەی ڕشێنەرەوە و دەرمانی ڕەوانی لابران شێوازە مۆراڵییەکان جێیان گرتەوە، شێوازی دروستکردنی بینایەی پەناگەکە

---

29 Vencenzio Chiarugi.

ڕۆڵـــی ســـەرەکی هەبـــوو لە چارەســـەری نەخۆشـــەکە، لە سـییەکانی سـەدەی نـۆزدەدا قەدەغەکردنـی کۆتبەنـدکردنی نەخۆش بووە دروشمی قۆناغەکە، پزیشـکەکان گەیشتنە ئەو دەرەنجامەی دیزاینی گونجاوی پەناگەی دەروونی، پێویستی بەوە نییە نەخۆش تێیدا ببەسترێتەوەو کۆتبەند بکرێت.

هەرچەنـدە ئەو پەناگایـانە لەژێرنـاوی مـافی مـرۆڤ و چارەســـەرکردندا کرابـــوونەوە بەڵام زەحمەتبـــوو بە گەشـــبینییەوە حـــوکم لەســـەر دۆزیـــنەوەی خێـــرای نەخۆشییەکەو چارەسەرە ئەخلاقییەکەی بدەیت، چونکە ئەو شـێوازە چارەسـەرانەی بـۆ چـاکبوونەوەی نەخۆشـەکان بەکاردەهێنران، ئەوەبوو پەناگەکە لەڕووی قەبارەوە گەورە دەبوو و پڕ دەبوو لە نەخۆشی نائومێد لەچارەسەر. بە پێی لێدوانی یەکێ لە کارمەندانی ئەو سـەردەمە پەناگەکان، جگە لە "موزەخـانەی شـێتی" شـتێکی تـر نەبـوون. سروشـتی تـایبەتی ئەو دامەزراوانە درزێکـی گەورەی خسـتە نێـوان پزیشکیی دەروونی و پزیشکیی کلینیکی و نەشتەرگەرییەوە، وەکو شۆکێک تاکو ئێستاش شوێنەوارەکەی نەڕەویوەتەوە، هەرچەنـدە زانیـاری زۆر سـەبارەت بە مێشـک و چـۆنێتی کارکردنی لە برەودایە.

لەکۆتـایی سـەدەی نۆزدەیەمـدا پسـپۆری نەخۆشـیی دەروونـی ئەڵمانی ئیمیل کرێپلین[30] (١٨٥٦- ١٩٢٦) هەوڵیدا پزیشـکی کلینیکـی و پزیشـکیی دەروونـی لە یەکتـر نزیـک بکـاتەوە، بە ڕێگـای کلینیکـی پزیشـکی دەروونـی لەسـەر بنەمـایەکی ئەکـادیمی دامەزرابێـت. کـرێپیلین بە نزیکـی

30 Emil Kraepelin.

هاودەمی دامەزرێنەری شیکاری دەروونی سیگمۆند فرۆید (١٨٥٦- ١٩٣٩) بـوو، لەڕێـگەی زانسـتی پـۆلێن کـردنەوە پەرەی بە شـێواوییە دەروونییەکانـدا کە بە بنەمـای پۆلێنکردنی نەخۆشییە دەروونییە نوێباوەکان دێتە ئەژمار، نەخۆشییە قورسە سەرەکییەکانی لە نەخۆشییە دەمارییەکان جیاکردەوە، باسـێکی پـووختی سـەرەتایی سـەبارەت بەو نەخۆشییەی ئێستا پێی دەوترێت شیزۆفرینیا پێشکەش کرد. کـریپیلین نـاوی نـا "خڵەفـاویی پێشـوەخت" واتە خڵەفـاویی گەنجـی، هەوڵەکـانی لە دامەزرانـدنی پسـپۆڕی پزیشـکیی دەروونـی بە شـێوەیەکی ئەکـادیمی بەشـدارییەکی گەورەو کاریگەربوو.

تـا ئێسـتاش بۆشـاییەک لە نێـوان پزیشـکی ئاسـایی و پزیشـکی دەروونـی بـوونی هەیە، بەڵام ئەو ڕەوتەی گیـرایە بەر لە پەنـاگەوە بـۆ کلینیکـی تـایبەت، بـاوەڕی کـۆمەڵگە ئەوروپییەکـانی بە نەخۆشـخانە پـتەو کـرد بەو پێـیەی دامەزراوەی چارەسـەرکردنە، جـگە لەوەی ڕەنگـی پزیشـکی زۆر لایەنـی ژیـانی گـرتەوە هەر لە خەمگینییەوە بگـرە تـا دەگـاتە جینایەتکـاری، لە یـاخیگەرییەوە بـۆ نیشـانەکانی لەدەستدانی ئاگایی. لەبەرئەوەی ناولێنانی شتەکان خۆی لە خۆیدا ئارامبەخشـە، بۆیە کریپیلین سیسـتەمی دۆزینـەوەی تێکچوونە ئەقڵییەکانی سەپاند، هەرچۆن پزیشکە کلینیکییە فەرەنسـییەکان بـۆ تێگەیشـتن لە نەخۆشـییەکان کە تووشـی جەسـتەمان دەبێـت دەستنیشـانی جەسـتەییان پێـڕەو کـرد، ئەویـش سیسـتەمی دۆزیـنەوەی نەخۆشـییە ئەقڵیـیە جیاوازەکانی پێڕەو کرد.



(١٣)بزووتنەوەی دامەزراندنی نەخۆشخانە پزیشکییەکان لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەدا، سەرەتا مایەی خۆشحاڵی بوو،بەلام کاتێک پەناگە دەروونییەکان دامەزران و پڕبوون لە کەیسی درێژخایەن ئەم گەشبینییە بوو بە هەڵم. ئەم هێلکارییە نەخشەی یەکێک لە پەناگە ئەقڵییەکانە لە برینتوود لە ئیسێکس لە ئینگلتەرە. نەخشەیەکی وردە لەو دامەزراوەیەی ، خۆی لە خۆیدا دامەزراوەیەکی سەربەخۆیە بەلام گۆڕاوە بۆ جیهانی بچووک بچووکی سەربەخۆ.

# بەشی چوارەم
# پزیشکی لە کۆمەڵگەدا

## تەندروستی گشتی

بزاوتـــی تەندروســـتی گشـــتی لەســـەدەی نـــۆزدەیەمەوە دەســـتی پێکـــرد، بێگومـــان پشـــتی بە ســـتراکچەرە سیاســـی، کۆمەڵایەتی و پزیشکییەکەی ڕابردوو دەبەست. بەڵام ئەوەی ئـێمە پێـی ئاشـنایین، بە تەواوی دوو ســەدەیە دەرکەوتـووە. ئەگەر پەیوەنـدیی نێوان نەخـۆش و پزیشـک لەچوارچێوەی کـاری پزیشـکی لە نەخۆشـخانەکاندا بێـت، ئەوا تەندروسـتی گشتی تایبەتە بە تاک و دەوڵەت، زۆرترین لایەنـی پزیشـکیی شـاراوەیە لە هەمـان کاتـدا ئاشـکرایە، کـاتێ دەچـین بـۆ نەخۆشـخانە، خەڵـک هەسـتی پێناکات، بەڵام کاتێک پەتـایەک بڵاو دەبێتەوە، وەکو ئەنفلەوەنزا یان نەخۆشییەک لەڕێگەی تـۆڕی ئاوەکـانەوە کە پیسـبووە، بـابەتەکە وەکـو هەواڵێکـی گرنگ چاوی لێدەکرێت.

وەکو لە ناوەکەوە دیارە، تەندروستی گشتی گرنگی بە پاراستنی تەندروستی و خۆپاریزی لە نەخۆشییەکان یان قەلاچۆکردنی نەخۆشییەکان دەدات. بەرپرسیاریتییەکەی لە چوارچێوەی نەخۆشییە درمییەکاندایە. بەلام مەسەلەی خۆپاراستن لە نەخۆشی هەمیشە توخمێکی تر لەخۆ دەگرێ ئەویش پاراستنی تەندروستی تاکە. هەرچەندە ئەم دوو توخمە لە ڕووی نەریتەوە، لە چوارچێوەی پزیشکیدا دوو گروپی جیاوازن بەلام زۆرجار تێک دەڕژێن، لە ئامانجێکدا هاوبەشدەبن ئەویش خۆپاراستنە لەنەخۆشی. بەزیادبوونی ئاراستەیەکی تر بۆسەر لیستی خۆپاراستنی تەندروستی گوزارشتی "پزیشکیی شێوازی ژیان"ە لە هەردوو توخمەکەدا، دەولەت ڕۆلی سەرەکی هەیە.

## پێش دەولەتی پیشەسازی

نووسراوە کۆنەکان ئاماژەیان بە ژمارەیەک نەخۆشی پەتا داوە، لە ڕاستیدا پێش سەردەمی نوێ، ژمارەی دانیشتوان بەیناوبەین لە کەمیداوە بە هۆی هەردوو سوارەکەی کۆتایی جیهان، کە خۆی لەخۆراک و نەخۆشیدا دەبینێتەوە، تیۆری مالتۆسی لێیان دواوە، ژیان لای زۆرکەس دژوار و سەخت و کورت مەودا بووە، لە مێژووی درێژخایەنی فشاری مالتۆسیدا کە خۆی لە هەژاری، نەداری و نەخۆشیدا دەبینییەوە، سەردەمە درێژخایەنەکەی تاعوون لە ناوەڕاستی سەدەی چواردەوە بۆ ناوەڕاستی سەدەی حەڤدە درێژەی هەبوو، ئەمەش ئەوە دەردەخا بەشێوەیەکی تایبەت ئەو ڕۆژگارە ڕۆژگارێکی ڕەش و خەمناکبووە.

مەرگی ڕەش وەکو ڤیکتۆرییەکان ناویان لێناوە، وەکو یەکەم پەتــا، لە مێــژوودا مشــتومڕی زۆر لەســەر کــراوە (کیشوەربڕ یان پەتایەکی جیهانی بووە). پێش ئەو سـەردەمە پەتــای تــاعوون لەچوارچێــوەیەکی بەرتەســکتر لە کــات و شــوێندا بڵاودەبــووەوە، بەڵام مەرگــی ڕەش پتــر لە چــوار ســاڵی خایانــد لە بڕینــی ڕێگــای ئاوریشــم و گەیشــتنی بە دەشــتاییەکانی ئیســتیبس لە ناوەڕاسـتی ئاسـیا بـۆ ئەوپەڕی ڕۆژئاوای ئەورووپا وڕۆژهەڵاتی ناوەڕاسـت و کەناراوەکانی ئەفەریقای بـاکور، لە نێـوان چـارەک بـۆ نیـوەی دانیشـتوانی ئەورووپـا، لە نــاوچوو، مەرگــی ڕەش یەکەم زنجیـرە پەتــای وێرانکەربــوو تــا ســاڵی ١٦٦٠ چنگــی خســتبووە گەرووی دانیشــــتووانی ئەورووپــــای ڕۆژئــــاوا ( لە ســــاڵی ١٧٢٠ لە مارســــیلیا بنبڕبوو).بەدڵنیــاییەوە مەرگــی ڕەش شــێوەیەکی تاعوونە، ئەو وشەیە وەکو ئاماژەیەک بۆ کارەساتی جەرگبڕ بەکاردێت. لەم دواییـانەدا ئەو ڕایە بـاوبوو کە دەووتـرا ئەو تــــاعوونەی لە ١٣٤٠ بڵاوبــــووەوە هۆکــــارەکەی میکرۆبــــی تاعوون نەبوو . *یەرسینیا* پێستیس لە هۆنگ کۆنگ لە دوا پەتـای سـاڵی ١٨٩٠ ئەمەی ئاشـکرا کـرد، ئامـاژەی بەچەنـد بـوونەوەرێکی تـر کـرد، مەرگـی ڕەش هەنـدێ تایبەتمەنـدی لەخۆگرتووە لەگەڵ تایبەتمەندییە تازەکانی پەتـای ڕشـانەوە نـــاگونجێ، لە ڕووی خێرایــــی بڵاوبــــوونەوەی، وەرزەکەی، شێوازی مردن، جگە لەوە هیچ کەسێک تێبینی بوونی مشـکی مردووی نەکردووە (تاعوونی مرۆیی لە شێوە نوێیەکەیدا بە تـاعوونی مشـک یـان جـانەوەرە قرتێنەرەکـانی تـر بەراورد دەکرێت) هەندێ لەوانەی لێدوانیان داوە ئەو ڕووداوەیان بە

ئەنتراکس یان ڤایرۆسێکی نەناسراو یان میکرۆبێکی تر داناوە، هۆکاری ڕاستەقینەی پشتی ئەو پەتایەیە، هەروەها ئەگەری هەیە بە ئەرگۆت ژاراوی بووبێت.

کێشەی ئێمە لەگەڵ ئەو لێکدانەوە ئەلتەرناتیڤەی سەبارەت بەمەرگی ڕەش ئەنجامدراوە، بەڕێژەیەکی زۆر تەرکیزی خستۆتە سەر پەتا سەرەکییەکە. بەڵام ئەگەر مرۆڤ بەشێوەیەکی گشتی سەرنج لە تاعوون بدات، لە ساڵی ١٣٤٥ بۆ ساڵی ١٦٦٦ ئەوا مەسەلەکەی زیاتر بۆ ڕوون دەبێتەوە؛ لەم چەند ساڵەی دوایی ئەو سەردەمەدا دەتوانرێ زۆر بەئاسانی تاعوون جیابکرێتەوە، (بۆنموونە پەتای تاعوونە گەورەکە کە ساڵی ١٦٦٥ لەندەنی گرتەوە) بە گوێرەی ڕاپۆرتە پزیشکی و نا پزیشکییەکان. جگە لەوەش ئەوانەی لەسەردەمی ئەو پەتا فرەڕەنگییە ژیاون، وەکو یەکەیەکی نەگۆڕ چاویان لێکردووە، لە کاتێکدا بێشک هیچ کەسێک ئامادەیی لەجۆرەکانی تردا نەبووە، هەمیشە پزیشکەکان لەسەردەمی پەتای یەکەم یان هەردوو پەتاکەدا ژیاون. ئەزموونی کەڵەکەبووی مێژوویی لەبازنەی یەک نەخۆشی دووبارە بووەوەدا خولاوەتەوە، بەدڵنیاییەوە ئەو تاعوونەی "ئێمە" یە؛ واتە ئەو تاعوونەی هۆکارەکەی میکرۆبی تاعوونە. پەتای یەکەم هێرشی کردۆتە سەر کۆمەڵێک لە دانیشتوان کە هیچ ئەزمونێکیان لە بەرگری جەستەی پێشوەخت و کەیسی پەتا وێرانکەرەکانی تری وەکو (ئاوڵە و سوورێژە بۆ نموونە) لە کۆمەڵگە پاکژەکاندا نەبووە.



(١٤)ئەم وێنە بەردینەی "فیلیکس ینیڤین" ئەو ترس و ماڵوێرانییەی لەکاتی پەتای تاعوونی دووبارە، لە کۆتایی سەدەکانی ناوەڕاست و سەرەتاکانی سەدەی نوێ دەخاتە ڕوو. ئەمجۆرە وێنەیە هێشتا لە پەتای ئینفلوەنزا یان پەتای ترسناکی وەکو ئاوڵە یان ئەنتراکس، دەمانترسێنێ.

بەزۆری لەو سەردەمەدا هۆکارەکانیان گەڕاندۆتەوە بۆ تووڕەیی خودا لە تاوانی مرۆڤ و تەمبەڵی، بۆ مرۆڤە پەراوێزخراوەکانی وەکو یەهودی و ژنە جادووگەرەکان، بۆ هەوای پیس، بۆ ئەوانەی پشتیان بە ئەستێرەناسی بەستووە. هەرچەندە کۆمەڵێک لێکدانەوەی لە سروشت بەدەر خراوەتەڕوو، بەڵام هاوشانی تاعوونی دووبارە ئاستی هۆشیاریش لەسەر مەسەلەی تەندروستی کۆمەڵگە گەشەی کردووە، لە بەرامبەردا چەند ڕێوشوێنێکی پێویست گیراوەتە

بەر بـۆ خۆپاراسـتن لە نەخۆشـی و قەڵاچـۆکردنی؛ وەکـو دابـڕین و جیـاکردنەوەی نەخـۆش، کـۆنترۆڵی سـنوورەکان بەزۆر، داخلکردنـی نەخـۆش لە نەخۆشـخانە بەزۆر، چەنـد ڕێوشوێنێکی تر بۆ ئەو کەسـانەی تووشـی نەخۆشـی بـوون، لەگەڵ چەند کارێکی گشتگیر وەکو کەرەنتینە کردنی ڕۆتینی بـۆ ئەو کەشـتییانەی لە نـاوچەی تـاعوونەکەوە هـاتوون، چـاودێری کردنـی تـاقمی کەشـتییەکە وشـتومەکەکان و پشکنینی پزیشکیی پێویست. نەخۆشییەکە سنووری چالاکیی تەندروسـتیی گشـتیی لە سـەرەتای سـەردەمی نوێـدا تـاقی کـردۆتەوە، ئەمەش وا دەگەیەنـێ، لە کـاتی قەیرانەکانـدا پەیوەنـدییەکی حەتمـی لە نێـوان دەوڵەت و کـاری پزیشـکیدا هەبووە. هەندێ لێکۆڵینەوەی مێژوویی ئاماژەیـان بەوەداوە لە ڕێگەی سەپاندنی "ڕێنمایی تەندروستی" یەوە، بەدرێژایی سنوری خـوارو ودیـوی ڕۆژهەڵاتـی ئیمپراتۆرییەتی نەمسـا- هەنگاریا، کـاریگەریی هەبووە لەوەی ڕێـگە لەهـاتنی تـاعوون لە ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـتەوە بگیرێـت، کە شـوێنی نەخۆشـی وجار نەجارێ شوێنی پەتاش بوو، چونکە بۆ ماوەیەکی زۆر لەڕۆژئـاوای ئەوروپـا دا نەخۆشـییەکە نەمـابوو. گەشـتیارە ئەوروپییەکـان بە لایـانەوە ئاسـایی بـوو، لە یەکـێ لە "لازاریتـۆ"[31] کانـدا کەرەنتیـنە بکـرێن بە مەبەسـتی کۆنترۆڵکردنی پەتا ونەخۆشی.

---

٣١ لازاریت یان لازاریتۆ lazarets ، وێستگەیەکە ئەو گەشتیارانەیان تێدا بەنـد دەکـرد کە لەدەریـاوە دەهـاتن، وەکـو کەرەنتینـەی ئێسـتا، هەنـدێجار لازاریت ئەو کەشتییانە بوون بەشێوەیەکی هەمیشـەیی لە کەنـاری دەریا لە دورگە دابڕەوەکاندا لەنگەریان دەگرت، یان لە دورگەیەکی وشکانی بینایەک دەکرایە لازاریت. لە هەندێ لە لازاریتەکاندا شومەکە هاوردەکان بە هەڵم

بەلای کەمەوە، تاعوون ئەو دڵنیاییەی بەخەڵک بەخشی مەسەلەی نەخۆشی و تەندروستی، کێشەی کۆمەڵگەیە. بەڵام سەرکەوتن لە دروستکردنی ژێرخانێکی تەندروستی هەمیشەیی، مەسەلەیەکە هێشتا یەکلا نەبۆتەوە، هەرچەندە نەخۆشخانەی تاعوون لە هەموو لایەکی ئەورووپا کرایەوە، زۆرجار نەخۆشخانەکە بۆ دابڕانی ئەو نەخۆشانە بوون کە دوای نەمانی تاعوونەکە تووشی نەخۆشییە بەکتیرییەکان دەبوون. بەشێوەیەکی گشتی وڵاتە باڵادەستە ئەورووپییەکان پەرەیان بە هەندێ چالاکیی فەرمی دا کە پەیوەندیی بە تەندروستیی گشتییەوە هەبوو تابیبێتە بەشێک لە شاخە تیژەکانی بیرۆکراتیکی دەوڵەت. لەسەرەتای سەدەی حەڤدەدا بیرۆکەی "پۆلیسی پزیشکی" لەو وڵاتانەی بە ئەڵمانی دەدوێن سەری گرت. بەدانانی کتێبێک سەبارەت بە "سیستەمی پۆلیسی پزیشکی" (١٧٧٩- ١٨٢٧) ئەم هەوڵە گەیشتە لووتکە، دانەری ئەم کتێبە لە لایەن پزیشکی جیهانی یۆهان پیتەر فرانک[٣٢] (١٧٤٥- ١٨٢١) دوە نووسراوە. یۆهان ڕیفۆرمخوازی بواری تەندروستی گشتی بوو، پێیوابوو پێویستە پۆلیسی پزیشکیی حکومی دەسەڵاتی زۆری هەبێ، کتێبە مەزنەکەی بە نزیکی تەواوی ژیانی مرۆڤی لەخۆگرتووە، لەسەر بێشکەوە بۆ ناو گۆڕ، لە دایکایەتییەوە، لە منداڵییەوە، لە چاودێریی منداڵەوە، لە جلوبەرگ و پۆشاکەوە، لە سەر شەقامەوە، لە ڕووناکییەوە تا ناشتنی مردووی تێدا باسکراوە. فرانک دەڵێ، بە هیچ جۆرێک ئێمە

---

پاکژ دەکرانەوە، بە مەبەستی ڕێگری کردن لە بڵاو بوونەوەی نەخۆشی، ئەم دیاردەیە تا ساڵی ١٩٣٦ کەم وزۆر بەردەوام بوو. وەرگێڕ

32 Johann Peter Frank.

یەکەم کەس نەبووین هەست بە لایەنە جیاوازەکانی ژیانی مــرۆڤ بکەیــن، کە کــاریگەریی ڕاســتەوخۆی لەســەر تەندروستی مرۆڤ هەبێت. دوابەشی کتێبەکەی فرانک دوای مردنی بە دەرکەوت، باسی ئەو سەردەمە دەکات کە ڤاکسین بەشێوە سیستماتیکەکەی وەکو شێوازێکی خۆپاراستن لە نەخۆشی ئاوڵە Smallpox شوێنی کوتانی کۆن دەگرێتەوە (بەگەرمی پشتگیری لەو ڕایە دەکات). ئەم دووجۆرە کوتانە واتە ڤاکسین و کوتانی کۆن هەردووکیان یەک ئامجیان هەیە ئەویش شێوازی خۆپاراستنە لە نەخۆشی، هەرچەندە هەردوکیــــان لەلایەن پزیشــــکەکانەوە داهێنــــراون، بەڵام سەرچاوەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ پزیشکی دەرمانی میللی. کوتــان Inoculation (وشــەیەکی ئینگلیــزییە ولە کــاری بــاخەوانییەوە وەرگیــراوە و هاوتــای موتــوربەکردنی ڕووەکەکــانە) ئەم کوتــانە دەرهێنــانی مــادەیەکی لینجە لە زیبکەی یەکێک کە تووشــی ئــاوڵە بــووە، دەخرێتە لەشــی کەسێکی ترەوە کە هێشتا تووشی ئەو نەخۆشییە نەبووە. لەبەردوو هـۆ ئەم کــارە لـۆجیکییە، **یەکەم:** ئــاوڵە بە نزیکــی ڤایرۆسێکی جیهانییە، بووە هۆی مردنی ڕێژەیەکی زۆر لە دانیشتوان، بەپێی هەلومەرجەکان گۆڕانکاری لەو ڕێژەیەدا هەیە، ڕێژەی مـردن لە نێوان ٥٪ و ٢٠٪ بـووە، شـوبهاندنی ئەم پرۆســـەیە بە ئـــاهەنگی ئـــاوڵەی ئـــاوی Chickenpoxلەوەدایە، لە ئـاوڵەی ئاویـدا، باوکـان ودایکـان منـداڵەکانیان دەخســتە بەردەمــی ئەو منــداڵانەی تووشــی نەخۆشییەکە بوون تـاکو ڤایرۆسـەکە بچێتە لەشیانەوە (کە ڤایرۆسەکە نیوە ساغە یان نیوە مردووە)، بەم کارە بەرگری لەش دژی نەخۆشـییەکە بەهێـز دەبێـت، ئەوکـاتەی منـداڵە

ساغەکە تووشی نەخۆشییەکە دەبێت. لە کاتێکدا خۆی نەخۆشییەکە مەترسیدارە، بەڵام لە ڕووی ستراتیجییەوە هەمان شتە، ئەگەرچی سەرکێشییەکە گەورەیە. **دووەم:** مرۆڤ ئەو ڕاستییە دەزانێ یەکجار تووشبوون بە نەخۆشییەکە، بەدرێژایی ژیان جەستەی مرۆڤ بەرگری دروست دەکات، بە دەرکردنی مادەی ڤاکسینەکە لە هەڵبژاردنی کەیسێکی خۆبەخش کە بە سووکی تووش دەبێت، چانسی مردن بەدرێژایی ژیان لە کورتی دەدات.

کوتان، هەر لەدێر زەمانەوە لە ڕۆژهەلاتدا پێڕەو کراوە، چینییەکان لە ڕێگەی هاڕاوەیەکەوە لە نەخۆشیی پەڵەی پێستەوە وەریان گرتووەو وەکو هاڕاوەی تووتن هەڵیان مژیوە. لە تورکیا لە ڕێگەی ڕووشانی پێستەوە دەکرایە لەشەوە، ئەو تەکنیکە دەکەوێتە بەر گوێی ژنی باڵوێزی بەریتانیا خاتوو ۆرتلی مونتاج (١٦٨٩- ١٧٦٢) لە کوستەنتینییە، ئەم هاڕاوەیەی بۆ منداڵەکانی بەکارهێنا، کە پێشتر تووشی ئەم نەخۆشییە نەبووبوون. لە ئەنجامی پێدانی ئەو شێوە کووتانەوە، منداڵەکانی زۆر بە سووکی نەخۆشییەکەیان تێپەڕاند، خۆی و پزیشکی باڵوێزی بەریتانیا لە لەندەن ڕیکلامیان بۆ ئەم دۆزینەوەیە کرد، بە پشتبەستن بەو گەواهیدانە، پاشا جۆرجی دووەم فرمانی بە پزیشکە نەشتەرگەرەکەی خۆی کرد ئەو کووتانە بۆ منداڵەکانی ئەویش بەکاربێنێ. جێمس جۆرین، یەکێک لە پزیشکە دیارەکانی لەندەن و قوتابی ئیسحاق نیوتن، کۆمەڵێ ئاماری کۆکردەوە لە پێڕەوانی تەکنیکی کووتانەکە، لە ڕێگەی بیرکارییەوە سەلماندی ئەم تاقیکردنەوەیە بەڕادەیەکی زۆر ڕۆڵی لە کەمکردنەوەی هەلی مردندا هەیە.

له ناوەڕاستی سەدەی هەژدەدا کووتان وەکو ئاسانترین و بەربلاوترین پرۆسە چاوی لێکرا، بە تایبەتی دوای ئەوەی پاشای فەرەنسا "لویسی پازدە" بەو نەخۆشییە گیانی لە دەستدا، بۆ بەدبەختی پاشا، کوڕەکەی "لویسی شازدە" لە ساڵی ١٧٧٢ بەسەرکەوتویی کووتانەکەی وەرگرت. دیارە ئەم پرۆسەیەش بێ کۆسپ نەبووە، ئەو نەخۆشانەی لە کاتی نەخۆشییەکەدا خۆیان دەکووتا زۆرجار گیانیان لە دەست دەدا، وە دەبوونە سەرچاوەی نەخۆشی بۆ ئەوانیدی.

وەکو زۆرێک لە ڕاهێنەرە پراکتیکییەکانی تر ئیدوارد جینەر[33] (١٧٤٩- ١٨٢٣) جار نە جاری کووتانی لە نەخۆشەکانیدا پێڕەو دەکرد، لەگوندی گلۆستەرشیر نزیک کلینیکە پزیشکییەکەی، دەژیا، لەوسەردەمەدا نەخۆشییەکی ناسراو هەبوو تووشی ئاژەڵان دەبوو، پێی دەوترا ئاوڵەی مانگا Cowpox ، هەندێجار ڕاستەوخۆ دەگوێزرایەوە بۆسەر دەستی ژنە شیردۆشەکان و زیپکەیەک لەسەر دەستی دەردەچوو، ئەم زیپکەیە لە ئاوڵەی ترسناک دەیپاراست. هەرچەندە جوتیارێک هەبوو بەناوی جێستی و خەڵکانی تریش لە پێشوودا چەند کەسێکیان بە مادەی ئاوڵەی مانگا کووتاوە، بە مەبەستی پاراستنیان لە ئاوڵە مەترسیدارەکە، بەڵام جینەر دوای ئەوەی سوودی لەم ئەزموونە بینی، لە ساڵی ١٧٩٦ ئەزموونە گرنگ و سەرکەوتووەکەی خۆی ڕاگەیاند وەکو وەسیلەیەک بۆخۆپاراستن لە نەخۆشی ئاوڵە. لەم تاقیکردنەوەیەدا هەندێ مادەی لە زیپکە ڕزیوەکەی سەر دەستی ژنێکی شیردۆش بە ناوی 'سارە نیلمز' وەرگرت و لەسەر باسکی کوڕێکی

---

33 Edward Jenner.

گەنج چاندی، کە ناوی 'جیمس فیپس' بوو، پێشتر ئاوڵەی ئاسایی نەگرتبوو، سەر باسکی ئەو کوڕە بووە برین و توێژاڵی بەست، بەڵام تەندروستی باشبوو جگە لەوەی تەنها بۆماوەی ڕۆژێک تای لێهات. دوای شەش هەفتە جینەر بە ئاوڵەی ئاسایی باسکی هەر ئەو کوڕەی کووتا، بەڵام ئەمجارەیان تووشی هیچ نەبوو؛ بەم تاقیکردنەوەیە دەرکەوت بەرگری لەشی کوڕەکە دژی نەخۆشییەکە بەهێزە.

کۆمەڵەی شاهەنشاهی ڕێگەی نەدا توێژینەوە سەرەکییەکەی بلاوبکرێتەوە، بۆیە ساڵی ۱۷۹۸ لەسەر بژێوی تایبەتی خۆی بەشێوەی نامیلکە بەناوی کووتان Vaccination بلاویکردەوە، داهێنانی ئەم وشەیە دەگەڕێتەوە بۆ دوای بەکارهێنانی وشە لاتینییەکە کە بۆ مانگا بەکاردەهات. هەروەکو پێشبینی دەکرا ئەم شێوازە نوێیە لە کووتان هەندێ نارەزایی لێکەوتەوە، بەتایبەتی بەهۆی "پیسکردن" ی مرۆڤ بە مادەیەک کە لە ئاژەڵەوە وەرگیراوە، مێژوونووسان سەبارەت بە هەندێ دەرەنجام لە پرۆسەی کووتانی پێشوەختدا، تووشی گومانکردن بوون بەوەی (ئەگەری هەیە بەهۆی ئەو ڤاکسینەی هەڵگری مادەی ئاوڵەی پیسە "لیمفەکان" یش پیس وژاراوی ببن). بەڵام کارەکەی جینەر بەخێرایی لە ناوە و دەرەوەی بەریتانیا پشتی پێبەسترا، دوو کۆمەکی گەورەی لە پەرلەمانی بەریتانییەوە پێگەیشت، ئەمەش بووە هاندەری تاکو خۆی تەرخان بکات لە مەسەلەی ئەو ڤاکسینەدا سەربکەوێت.

پاشای ئایندە ئیدواردی حەوتەم بە یەکێ لە پزیشکەکانی وت «ئەگەر لە تواناندا بێت خۆت بپارێزی، بۆ نەیپارێزی؟» ئەمە پرسیارێکی جوان بوو، بەڵام ئەو وەڵامەی نائومێدت

دەکات ئەوەیە، بڕی تێچوونەکەی زۆر گران بکەوێت، یان ئیرادەیەکی سیاسی یان پزیشکیی تەواوی لەپشتەوە نەبێت، یان ئەو خەڵکە و پزیشکەکانیان هۆشیارییەکی ئەوتۆیان سەبارەت بە خۆپاراستن نەبێت، ئەو هۆشیارییە هەمیشە گشتگیر نییە. هەرچەندە چیرۆکی ئاوڵە بەوشێوەیە بوو کە جینەر پێشبینی دەکرد، واتە بنبڕکردنی نەخۆشییەکە لە ١٩٧٩ بوو بە ڕاستی، بەڵام ئەم پێشبینییە شتێکی هاڵاوێردەو تایبەت بوو نەک یاسا؛ هەمیشە خۆپاراستن وێنەیەکی لاوازی پزیشکبوونە، کەمتر گرنگی پێدەدرێت، هەرچەندە بابەتێکی پێویستە لە کۆمەڵگە پیشەسازییەکاندا.

## کۆلێراو هەژاری: داینەمۆی تەندروستی گشتی

مێژوو نووسان وا ڕاهاتوون بزووتنەوەی تەندروستی گشتی لە سەدەی نۆزدەدا بەجۆرێک چاو لێبکەن کە کاردانەوەی زنجیرەیەک پەتای کۆلێرای دوای یەکە لەو سەردەمەدا. گومانی تیانییە یەکەم پەتای کۆلێرا گەیشتە ئەوروپا، هۆشیاری لای خەڵک دروست کردبوو سەبارەت بە نەخۆشییە کۆمەڵگەییەکان (شوێنەواری یەکەم پەتای کۆلێرا لە (١٨١٧- ١٨٣٢) هێواش هێواش ڕەوییەوە، دوای بڵاوبوونەوەی لە هیندەوە بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکوری ئەفەریقیا) . لە ١٨٢٧ ەوە شەپۆلی دووەمی پەتای کۆلێرا لە ڕۆژهەڵاتی هیندەوە دەستی پێکرد، ئەوروپا لە مقۆمقۆی نزیکبوونەوەی نەخۆشییەکەدا بوو، زۆربەی وڵاتانی ئەوروپی لەو چاوەڕوانیی نزیک بوونەوەیەدا (کە چوار ساڵی خایاند) وەفدیان نارد تا لە نزیکەوە لە ڕەوشی

نەخۆشـییەکە تێـبگەن ڕێوشـوێنی پێویسـت بگـرنەبەر تـا نەخۆشییەکە نەگاتە ئەورووپا.

لێرەدا دوو هۆی سەرەکی هەبوو، مایەی نیگەرانـی بـوو، یەکەم: نەخۆشییەکە لای ئەورووپییەکان شتێکی تازەبوو، هیچ شـارەزاییەکی پێشـوەختیان نەبـوو دەربـارەی نەخۆشـییەکە لای وڵاتـانی کۆلۆنیـاڵی هێڵـی ئیسـتیوائی گۆی زەوی نەبـێ. پەتای دووەمـی کۆلێرا بە ئەورووپادا هەڵیکرد، تـاکو گەیشـتە ئەمەریکـای بـاکور، پیشـەی پزیشـکی بەرەنگـاری کێشـەی گەورە بـووەوە، چـونکە دەیزانـی ئەم نەخۆشـییە زەنگێکـی مەترسیدارە هەم لە ڕووی ترسناکی نەخۆشییەکەوە هەم لە ڕووی ڕێژەی مردنەوە. تازەیی و تایبەتمەندیی نەخۆشییەکە وای کـرد، هەنـدێک وای لێکبـدەنەوە ئەم نەخۆشـییە، هەر ڕشـانەوەی مەرگـی ڕەشـی bubonic plague پێشـووەو گەڕاوەتەوە. کە بۆ هەمیشەیی لە ئەورووپادا کوژابووبووە.

دووەم: شـــێوازی بڵاوبـــوونەوەی نەخۆشـــییەکە سەرسـوورهێنەر بـوو. لێـرەدا دوو نمـوونەی ڕوونـی دوو جەمســەرە بــۆ لێکـدانەوەی نەخۆشـییەکە بـاس دەکەیـن: بڵاوبـوونەوە لە هەوا و تەشـەنەکردنی ئاسـایی، لایەنگرانـی بڵاوبـوونەوە لە هەوادا پێیـانوایە نەخۆشـییەکە کـۆمەڵگەییە، لەڕێـگەی کەش و هەواو گەردیلەکـانی هەواوە بڵاودەبـنەوە. ســەرچاوەی زۆربــاوی ئەم نەخۆشــییە بــریتییە لە مــادە ئۆرگـانییە بۆگەنەکـان وەکـو پاشـەڕۆک و پیسـایی مـرۆڤ، کەلاکی تۆپیو یان بۆنی ناخۆشی تر. بە ئاسانی هەست بەم هێــزە پــارادایمە نــوێیە دەکرێــت: هەوا تایبەتمەنــدییەکی هاوبەشـی لۆکـاڵییە یارمەتیدەرە بـۆ جیـاکردنەوەی "دۆخـی تەندروســت" لە "ناتەندروســت" لە کتێــبەکەی هیپۆکراتــدا

"کەشوهەوا وئاو وشوێن" لەچوارچێوەی نموونەیەکی نوێ بەڕوونی باسکراوە. لێکدانەوەی کۆمەڵێک نەخۆشییە کە ناوچەکانی هێڵی گەرمەسێری گۆی زەوی تووشی دەبن. هەندێ لەو نەخۆشییانە لەجیهانی کۆندا نەناسراوبوون و دەگوازرانەوە بۆ ئەوروپییەکان، بەگشتی پێی دەوترا "نەخۆشیی کەشوهەوا گەرمەکان"، گەرماو شێی خنکێنەر، بە دەوەن و گژوگیا داپۆشراو، لەو دیاردانەبوون، لە لێکدانەوەی جۆری نەخۆشییەکاندا پشتیان پێدەبەسترا.

بەڵام لایەنگرانی نەخۆشییە درمییەکان پێیانوابوو نەخۆشییە درمییەکان لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگوێزرێنەوە. ئەم ڕایە بە ڕووی نەخۆشییەکان خۆیان لێکدەدرێنەوە، وەکو ئەو کەسانەی چاودێری نەخۆشەکە دەکەن خۆیان تووشدەبن، تیۆری نەخۆشییە درمییەکان پاساویان ئەوەیە، هەرلەڕووی غەریزییەوە مرۆڤ خۆی بەدوور دەگرێ لەوکەسانەی تووشی نەخۆشیی مەترسیدار بوون، ئەویش خۆی لە پەیڕەوکردنی شێوازی کەرەنتینە کردندا دەبینێتەوە. هەر ئەمەش ترسی خستۆتە بەر خەڵک کە سەرچاوەی تاعوون و نەخۆشییە مەترسیدارەکان ئەو کەسانەن کە کەرەنتینەن و پەراوێزخراون.

گروپێکی مامناوەندی تریش هەن کە لایەنگری تیۆری "نەخۆشییە درمییە مەرجدارەکانن" کەمتر توندڕەون، باشتر لەگەڵ ئەو کەیسە تایبەتانەدا دەگونجێن، کە دوو نموونەکەی پێشوو ناتوانن چارەسەری بکەن. لایەنگری ئەم گرووپە دەڵێن، دەکرێ نەخۆشییەکان بەپێی هەلومەرجەکان هەوایی بن، یان درمی بن. بۆنموونە لەڕێگەی هەوای پیسەوە لە ناو کۆمەڵگەدا بڵاوبێتەوە، بەڵام هەندێک لە

تاکەکان تووشدەبن دواتر دەبنە سەرچاوەو کوانووی سەرهەڵدانی پەتای نەخۆشییەکە. ئەمەش دەبێتە هۆی تێکەڵبوونی جۆری نەخۆشییەکان و هەموو بەرەکان دەگرێتەوە. بەڵام بەداخەوە ئەو تیۆرانەی هەموو شتێک باسدەکەن، کەمتر لێکدانەوەی ورد دەکەن.

هەندێ نەخۆشی وەکو ئاوڵە و سووریژە، وا تەماشا دەکرێن درمی یان پەتایین، بەڵام زۆربەی نەخۆشییە پەتاییەکان شێوازی تووشبوون و بڵاوبوونەوەیان بەجۆرێک ئاڵۆزە، دەکرێت گفتوگۆی زۆری لەبارەوە ئەنجام بدرێت. لەم دواییانەدا تیۆری نەخۆشییە میکرۆبییەکان پارادایمێکی نوێی سەبارەت بە نەخۆشییە تەشەنەکردوو و درمییەکان وەکو شتێکی سەیر، خستەڕوو: بۆچی دووکەس وەکو یەک تووشی هەمان میکرۆبی نەخۆشی دەبن بەڵام کاردانەوەیان بۆ نەخۆشییەکە جیاوازە، یەکێکیان تووشی نەخۆشییەکە دەبێت بەڵام ئەویتریان تەواو ساخڵەمە؟

پێش تیۆری میکرۆبی نەخۆشی، کۆدەنگی لەم ڕووەوە نەبوو، لەڕاستیدا هەردوو ئەگەرەکان وەکو یەک چاوی لێدەکرا. بۆنموونە لە کاتی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیی تاعووندا، نەخۆشەکان جیادەکرانەوەو کەرەنتینە دەکران، بۆ پاکژکردنەوەی هەوای دەوروبەری نەخۆشەکان ئاگریان دەکردەوە، ئەو کاتەی گومانیان زیاتر بووایە جۆرە گوڵێکی بۆنداریشیان دادەنا دەوروبەری پردەکرد لەبۆنی خۆی.

کۆلێرا، ئەوکێشە هەمیشەییانەی بەشێوەیەکی خێرا جووڵاند، ئەو چاودێرە ئەوروپییانەی نێردران چاودێریی ڕەوتی نەخۆشییەکە بکەن بەرەو ڕۆژاوا، لەگەڕانەوەدا چەند ڕاوبۆچوونێکی جیاوازیان پێشنیارکرد، هەندێکیان پێیانوابوو

نەخۆشییەکە درمییەو تەشەنە دەکات، باشترین کاردانەوە کەرەنتینە کردنە، بەڵام هەندێکی تریان پێیانوابوو نەخۆشییەکە لەڕێگەی هەواوە دەگوێزرێتەوە، باشترین کاردانەوە، پاککردنەوەی ئاو وئاوەڕۆکانە، پاک ڕاگرتنی شەقام و ڕێوبانەکانە، حکومەتە ئەوروپییەکان گوێیان لە ڕای جیاواز دەبوو، بەڵام چارەسەرە کۆنەکەیان بە باش دەزانی کەخۆی لە کەرەنتینەو چاودێری کردنی ئەو نەخۆشانەدا دەبینییەوە کەتووشی نەخۆشییەکە دەبن، لەگەڵ چاودێری کردنی ئەو شتوومەکانەی لەسنوورەکانەوە دێنە ناوەوە کە ناوچەی تەشەنەکردنی پەتاکەن.

تەنانەت بەریتانیاش شوێنی ئازادیی کار و هەلسوکەوتی ئازاد، لەکاتی هاتنی یەکەم پەتای کۆلێرا کە لە ١٨٣٠ ەوە دەستی پێکرد، لە سنوورێکی دیاریکراودا کەرەنتینەی ڕاگەیاند، بەڵام لە کۆتایی ١٨٣١ لە مینای سەندەرلاند لە باکوری ڕۆژهەڵاتی بەریتانیاوە کۆلێرا گەیشتە بەریتانیا، ئینجا هێواش هێواش بەهەموو ئاراستەکاندا بڵاوبووەوە، تەنانەت لەسەرەتای ساڵی ١٨٣٢ گەیشتە لەندەنیش. لایەنگرانی هەوایی پێیانوابوو نەخۆشییەکە لەڕێگەی هەواوە بڵاوبۆتەوە، لایەنگرانی تەشەنەکردنی نەخۆشییەکە پێیانوابوو لەڕێگەی بەرکەوتەی مرۆڤ بەیەکترییەوە بڵاودەبێتەوە، بەڵام دوای کۆتایی هاتنی پەتاکە ئەو دەرەنجامەی هەردوولا پێیگەیشتن ئەوەبوو، سیستەمی کەرەنتینە ڕۆڵێکی ئەوتۆی لەم نەخۆشییەدا نەبووە، لەو ساتەوە سیاسەتی بەریتانی پێشوازیی لە میناکان دەستپێکرد، تەنها ئەو کەیسانەی گومانیان لێدەکرا جیادەکرانەوەو کەرەنتینە دەکران، بەو کارەی هەردوو

بۆچوونە سەرەکییەکەی پشتگوێ خست. بێگومان بەریتانیا ئەوکاتە خاوەنی گەورەترین پابەندبوونی دەریایی بوو، بەهۆی سیستەمی کەرەنتینەوە گەورەترین زیانی بەردەکەوت چونکە کەرەنتینە کۆسپی ڕێی کارکردن بوو. لە ساڵی ١٨٥١ ەوە، زنجیرەیەک کۆنگرەی تەندروستی نێودەوڵەتی ئەنجامدرا، لەبنەڕەتەوە تایبەت کرابوو بە کۆلێرا. وەکو فاکتەرێکی ڕۆتینی بۆ زاڵبوون بەسەر نەخۆشییەکەدا بەریتانیا و هیندی بەریتانی بەرەیەکی بەهێزیان کردەوە دژی سیاسەتی کەرەنتینە، دەرەنجامی ئابوری لەم جۆرە سیاسەتەدا بۆ هەموو لایەک ڕوونە، سیاسەتی زانستیی بەریتانی بە بێ پەردە لەسەر بنەمای بازرگانی بە پێوە ڕاوەستابوو. یەکێ لەوانەی پشتگیری ڕێگەی هەواییان دەکرد، یەکێ لە کەسایەتییە دیارەکانی تەندروستی گشتی بەریتانی ڕابردوو ئیدوین چادویک[٣٤] (١٨٠٠ -١٨٩٠) بوو. چادویک ڕاهێنانی لەسەر پارێزەری دەکرد، یاریدەدەری فەیلەسوفی ڕیفۆرمخواز جێرمی بێنتام[٣٥] (١٧٤٨ -١٨٣٢) بوو. چادویک سوودی لە ڕێبازی بێنتام وەرگرت سەبارەت بە توانا و یەکسانیی سادە لەنێوان کاری چاکە و بەختەوەریدا (لەکاتێکدا دروشمی فێرگەی سوودگەرایی "گەورەترین سوود بگەیەنە بە زۆرترین خەڵک") بوو. چادویک بۆیە هاتە بەشی تەندروستی گشتی تاکو گرنگی بە هەژاران بدات، بەتایبەتی جێبەجێکردنی یاسای هەژاران، کە یاسایەکی کۆنە و مێژووەکەی بۆ کۆتاییەکانی سەدەی شازدە دەگەڕێتەوە، وەکو هۆکارێکی

34 Edwin Chadwick.

35 Jeremy Bentham.

یاسـایی بـۆ هەڵسـوکەوت کـردن لەگەڵ ئەو مەسـەلانەی پەیوەنـدییان بە سـووککردنی بـاری سەرشـانی هەژارو ونەدارانەوە هەیە، دیـارە ئەم یاسـایە بە هـیچ جۆرێـک لە کۆمەڵگەیەکـدا نەدەگونجـا کە بە قۆنـاغی پێشـکەوتنی شارستانییەت و پیشەسازیی خێرادا گوزەر دەکات. بەریتانیا یەکەم وڵاتـی پیشەسـازی بـوو، نەدەکرا بەشـێوازێکی کـۆن ڕەفتـار لەگەڵ هەژارانـدا بکـات، لە سـایەی ئابوورییەکـدا لەسـەر کرێـی سـێکتەری پیشەسـازی پایەکـانی خـۆی قـایم کردبێـت، سـەرەڕای بـوونی بێکـاری وەرزی، هەژاریـی نێـو شارستانییەت و گەشەی هۆشیاریی چینایەتی.

سـاڵی ١٨٣٢ لە ئەوروپـا پەتـای یەکەمـی کـۆلێرا زۆر بە قورسی تێپەڕی، ئەو سـاڵە سـاڵێکی پڕ لە ڕوداوو کارەسـات بـوو، لەلایەکـی تریشـەوە پـرۆژەی یاسـای چاکسـازی لە پەرلەمـان هەنـدێ سـەرکەوتنی بەدەسـتهێنا تـاکو ئەو نایەکسـانییەی لە پەرلەمانـدا نـوێنەرایەتیی دەکـرا ڕێـک بخرێتەوە، لە ئەنجامی ئەو گۆڕانکارییە خێرایەی لە ژمـارەی دانیشتوانی شارە پیشەسازییەکاندا هاتبووە ئاراوە، پرۆژەکە چوارچێـوەی مـافی دەسـتوری دەنگـدانی فراوانکـردەوە، پەرلەمان لیژنەیەکی پسپۆری یاسایی پێک هێنا، تاکو چاو بە میکانیزمە کۆنەکەی کاری یاسـایی هەژارانـدا بخشـێنێتەوەو ڕێنمـایی نـوێ بە مەبەسـتی چاکسـازی دەربکـات. ئەمەش دەرەنجامی چەند ساڵێک مشتومڕی توند بوو، بەشێکی ئەم پاڵنەرە بۆ وتارێکی تـی ئـاڕ مـاڵتۆس دەگەڕێتەوە "گەڕانێک دەربـارەی پرەنسـیپی دانیشـتوان" (چـاپی یەکەم لە ١٧٩٨، چاپی شەشەم لە ١٨٢٦).



(١٥) تەنانەت لەسەرەتای هاتنی پەتای کۆلێرەوە لە ١٨٣٠، بەچاوێکی گاڵتەجاڕانەوە تەماشای بڕیارە فەرمییەکان دەکرا. لەم وێنەیەدا پیرۆکراتەکان بە شەپقە فەرمییەکانیانەوە، بەدوای ئەو بۆنە و بەرامەیەدا دەگەڕێن کە بەڵگەی نەخۆشییەکەیە، بەرازێکیش بە سەرسوڕمانەوە سەیری دیمەنەکە دەکات.

ماڵتوس ئاماژەی بەوە کردووە ڕەواندنەوەی هەژاری چەکێکی دوودەمە، مانەوەی هەژاران بەوشێوەیەی ئێستا لە ژیاندا، بۆی هەیە بەئاسانی کلۆڵی و بەدبەختی بەهۆی هەژاری و نەدارییەوە لە نەوەکانی داهاتوودا ڕەنێو بێنێ، لە کاتێکدا پەروەردەی هەژاری خۆی لەخۆیدا پاشکۆیەتی بەرهەمدێنێ. دەقی "یاسای دانیشتوان" کە ماڵتوس دایڕشتووە، دەڵێ سروشت توانای زۆربوونی هەموو جۆرەکانی بوونەوەری هەیە زیاد لە ژمارەی ئەوانەی لە دایکبوون و لە ژیاندان، واتە ئەگەر هەلومەرجەکە لەباربێت

دەتوانێ زۆر لەوە زیاتر وەچە بخاتەوە. لەم یاسا قورسەدا مرۆڤ جیاواز و هەڵاویردە نییە، لە کاتێکدا بەشێوەیەکی ئەندازەیی ژمارەی دانیشتوان بەپێی سەرچاوەکانی دەرامەت بەژمارەی یەک لەدوای یەک زیاد دەکات، هەژاری و نەداری، شەڕ و ماڵوێرانی و خراپەکاری ڕۆڵی هەیە لە دابەزینی ژمارەی دانیشتوان، خستنەوەی وەچەیەکی زۆر لە دۆخی هەژاریدا لە ماوەی درێژخایەندا شتێکی باش نییە.

تەنگژەی ماڵتۆسی تەنها یەکێکە لەو کێشانەی کە لیژنەی یاسای هەژاران لە ١٨٣٢ ڕەچاوی کردووە. چادویک سکرتێری لیژنەکەو دیارترین ئەندامی بووە، سەرۆکی پرۆژەیەک بووە بەشێوەیەکی سیستماتیکی بەدواداچوونی بۆ چۆنێتی بەڕێوەبردنی تەواوی یەکە ئیدارییەکان کە هەریەکەیان سەرۆکی قەشەیەک بەڕێوەی بردووە، ئەم یەکە ئیدارییە تایفییانە خۆی دەدا لە ١٥ هەزار پاریشەو[٣٦] یاسا کۆنەکەی هەژاران سەرپەرشتی دەکرد. ئەو یاسایە لە کۆتاییەکانی سەدەی شازدە لە سەردەمی شاژنی یەکەم

---

٣٦ پاریشە Parishes و بە ئینگلیزی eparchy پێدەوترێت، لە هەریەکەیەکی بەڕێوەبردندا کەنیسەیەک هەبووە، بە تایبەتی لە گوندو گەڕەک و ناوچە دوورە دەستەکاندا، بە پێی ژمارەی کەنیسە یەکە ئیدارییەکان دیاری کراون، پرۆتستانتەکان فۆرمی ئیداری کەنیسەیان لەشێوەی تایفەگەری داڕشتووە، نوێژکەرانی هەر کەنیسەیەک سەربەخۆیی ئیداری خۆیان هەبووە، یەکەم تایفەش براونتستە کە دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆبەرت براون کە ساڵی ١٥٨٠ وەکو یەکەم تایفە ناسرا. لەسەدەی ١٧ بە ناوی سەربەخۆکانەوە ناسران، لەسەرکردەکانیان کرۆم ویل و چەند شوێنکەوتەیەکیان، لە ١٦٦٢ سەدان قەشە لە کەنیسەکانیان دەرکران، ئەوانیش تایفەو گروپی تریان دروستکرد و بەرهەڵستی کەنیسەی سەرەکییان دەکرد. وەرگێڕ

ئەلیزابێس دەستبەکار بوو، ئەم ستاتۆیە بەجۆرێک دیزاین کرابوو گرەنتی پێدانی باجی ناوخۆ بۆ کەسانی پەککەوتە مسۆگەر بکات لەکاتی نەخۆشی و بێکاری و کەلێپەکانی تری ڕۆژگار. خراپیی ئەم یاسایە لەوەدا بوو بەزۆری بۆ کۆمەڵگەیەکی بێ جمووجۆڵ و لادێی دانرابوو، لەژێر سایەی سیستەمی کۆمەڵگەی بەریتانیدا کە بەردەوام لە گۆڕاندایەو بەرەو کۆمەڵگەیەکی پڕ جمووجۆڵ و پیشەسازی و شارستانییەت دەڕوات کارێکی دژوار بوو، مەسەلەکە بەجۆرێک ئاڵۆز بوو دوای کۆتایی هاتنی جەنگەکەی ناپلیۆن لە دەیەی دووەمی سەدەی نۆزدە، کاتێ هەزاران پیاوی سەربازی گەڕانەوە ماڵەوە، توانای کار پەیدا کردنیان نەبوو. لە ئەنجامی بەڕێوەبردنی ئەو یاسایە لە لایەن ١٥ هەزار یەکەی ناوخۆوە، ڕەوتی کارەکان پێچەوانەی مەیلە سوودگەراکەی چادویک دەچووە پێش، لە ڕاپۆرتی ئەندامانی لیژنەدا، کە ساڵی ١٨٣٤ بڵاوکراوەتەوە هاتووە، یاسای نوێی هەژاران کە لە هەمان ساڵدا دەرچووە، کاری لەسەر گشتاندنی میکانیزمەکان و یەکخستنەوەی کردووە، بەجۆرێک بەپێی یاسا و ڕێکخستنی هاوشێوە لە تەواوی وڵاتدا کاری پێدەکرێت. یاسای نوێی هەژاران، لەبەرئەوەی یاسایەکی دڵڕەقانە بوو، زۆر کەس ڕقی لێی بوو، ئەم میکانیزمەی سووک کردنی باری هەژاری لە ١٩٢٩ بە یەکجاری لابرا. چادویک دەیەویست لەو بەڕێوەبەرایەتییەدا دەسەلاتدار بێت، بەڵام ناچاربوو ڕازی بێت بەوەی وەکو سکرتێر دابنرێت بەرامبەر کرێیەکی گونجاو. شتێکی حەتمی بوو یاسای نوێی هەژاران لەڕووی کارگێڕییەوە ڕۆژانە

چادویکی ڕووبەڕووی کێشە و قەیرانی زیاتر دەکردەوە، بەتایبەتی لە پەیوەندیی نێوان نەخۆشی و هەژاریدا، دوکتۆرەکان هەمیشە سەرنجی ئەوەیان دەدا، هەژارەکان زیاتر لە دەوڵەمەندەکان تووشی پەتاکە دەبن، ئەمەش پەیوەندی بەو هەلومەرجەوە هەبوو کە تێیدا دەژیان لە ڕووی قەرەباڵغی و کەمی خۆراک و فاکتەرەکانی تری ژیان. چادویک سەرگەرمی ڕاستییەک بوو لەبنەڕەتدا ئەوەبوو نەخۆش کەوتنی کەسانی نان پەیداکەر بوو کە نەیدەتوانی کاربکات، فاکتەرێکی گرنگ بوو کە خێزان نەتوانێ داخوازییەکانی ژیانی ڕۆژانە پەیدا بکات.



(١٦) گۆستاف دۆری، لەندەن، ئەم تابلۆیە زۆر بە جوانی گوزارشت لە سەردانێک دەکات بۆ لەندەن (١٨٧٢) باسی ئەو قەرەباڵغی وهەژارییە بێسنوورە دەکات کە گەورەترین شارو دەوڵەمەندترین شاری ئەورووپای پێ دەناسرێتەوە.

کەواتە نەخۆشــی بــۆی هەیە ببێــتە هــۆی هەژارکردنــی خێزان، بەواتایەکی تر، ئایا هەژاری خۆی دەبێتە نەخۆشـی؟ چادویـک و هاوتەمەنەکـانی وایـان بەبـاش دەزانـی مـۆرکێکی ئەخلاقـی بـدەنە پـاڵ هەژاری، ئەوەشـیان ڕاگەیانـد، شکسـتی تاکەکان و ڕوخانیان لە ڕووی دەروونییەوە فاکتەرێکی تـری هەژاریــیە هەروەهــا شکســتهێنان لە پرۆســەیەکی وەکــو هاوســەرگیریی بــێ بەرنــامە، دەســتبڵاوی و پاشــەکەوت نەکــردن، خەرجکردنــی پــارە لەشــتی زیــانبەخش، وەکــو ئــالوودەبوون بە مەی و شــتی خــراپ. لەگەڵ ئەوەشــدا نەخۆشـی فـاکتەرێکی سـەرەکییە لە ڕوودانـی هەژاری، بـۆیە خـۆ ئامـادەکردن بـۆ خۆپاراسـتن لە ( نەخۆشـییە پیسـەکان) بۆی هەیە بـاری قورسـی هەژاری سـووک بکـات. بەتـایبەتی لەو نەخۆشـییە پیسـانە کـۆلێرا، تیفـۆس، سـوورەتا، هۆکـاری ئەم نەخۆشییانەش بۆنی گەنیوی ئەو مـادە ئۆرگانییانەن کە شــــیدەبنەوەو بە هەوادا دەگــــوێزرێنەوە بــــۆ نــــاوچە دوورەدەســــت و قەرەباڵغەکــان. دیــارە چارەســەری ئەم نەخۆشـییانە ئاسـانە: ئەویـش پاکوخـاوێنییە، ئەگەر پیسـی هۆکاری نەخۆشی بێت، کەواتە پاکوخاوێنی لەو نەخۆشـییانە دەمانپــارێزێ.گەشــــتەکەی چادویــــک لەو کــــاتەوە کە ڕیفۆرمخوازی یاسای هەژاران بوو، تـا دەگـات بەوەی چەند ساڵێک لە بـواری خۆپاراسـتن لە نەخۆشـییەکاندا کاربکات لە ١٨٣٤ بۆ ١٨٤٢ ، دەقێکی کلاسیکی لە دەقەکانی بزوتنەوەی تەندروسـتی گشـتیی پێشـوو بڵاودەکـاتەوە بە ناونیشـانی: "ڕاپۆرتێـک دەربـارەی تەندروسـتیی کرێکـارانی بەریتانیـای مەزن" لەم ڕاپـۆرتەدا شـێوازێک لە ئامـاری نـوێی ئەو کـاتە

دەخاتە ڕوو (لە تۆماری شارستانی ساڵی ١٨٣٧، ناوی ئەوانەی هاوسەرگیری دەکەن، ئەو منداڵانەی لەدایک دەبن، ژمارەی ئەوانەی دەمردن، تۆمار دەکرد)، بۆ ئەوەی بتوانێ لەڕووی چەندایەتییەوە ئەو جیاوازییە سەرسووڕهێنەرە لە ڕێژەی مردن و تێکڕایی تەمەنی مامناوەندی پێشبینی کراو لە منداڵییەوە، لەنێوان شارە قەرەباڵغەکان و لادێکاندا، لە نێوان دەوڵەمەند وهەژارەکاندا بپێوێت. لە پێناوی چارەسەری کێشەی نەخۆشییە پیسەکان. چادویک ناوێکی تازەی پێشنیارکرد ئەویش بەکارهێنانی سیستەمی خوێنبەرو خوێنهێنەری سووڕی خوێن بوو بۆ ڕاکێشانی ئاوی پاک 'هاوشێوەی خوێنبەر' و لێدانی زێراب و ئاوەڕۆکان بۆ دوورخستنەوەی پاشەڕۆکان 'هاوشێوەی خوێنهێنەرەکان'، دابینکردنی ئاوی پاک بە بۆڕی بۆ مالان، ماڵ ئاسانتر پاکوخاوێن دەبێتەوە، وە گواستنەوەی ئاوەڕۆ لەڕێگەی بۆڕیی لووسەوە کە پیسی لەخۆ نەگرێ و بەرگەی درز و شکاوی بگرێت تا دەرەوەی شار، ئەوا لەکێشەی لێدانی بیر بۆ پیسایی و پیسبوونی خاک ڕزگارمان دەبێ. سەرەڕای ئەوەش لەدەرەوەی شار لەڕێگەی چارەسەر، بەچەند قۆناغێک وەکو پەیینی ئۆرگانیک سوود لەو ئاوەڕۆ خەستە وەردەگیرێ بۆ کشتوکاڵ و دەفرۆشرێتە کشتیارەکان بە قازانج و بەروبوومی کشوکاڵی زیاد دەکات، تەنانەت دۆخی خۆراکەکانیش بەرەو باشتر دەڕۆن. ئەم پێشنیارانە چارەسەرێکی ئەندازەیی دەگمەن بوون بۆ مەسەلەی تەندروستی گشتی، لەسنووری خۆیدا شتێکی نوێ و گونجاو بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی چادویک چاوەڕوانی

دەکــرد چارەســـەرێکی ڕیشـــەیی نەبـــوو بـــۆ هۆکـــاری نەخۆشییەکان بە تایبەتی لەنێو هەژاراندا.

لەساڵی ١٨٤٨ کاتێک کۆلێرا گەڕایەوە چادویک هەلی بۆ ڕەخسا لەبواری تەندروستی گشتیدا شوێن دەستی دیاربێت، لیژنەیەکی تەندروستی پێکهێنا کە لە سێ کەس پێکهاتبوون یەکێکیـان چادویـک خـۆی بـوو (ئەنـدامی چـوارەم پزیشـکێک بوو دواتر دانرا). ئەو بڕگە یاساییەی ڕێگەی بە دامەزراندنی لیـژنەکە دابـوو تـاڕادەیەکی زۆر ڕێـگەی بەوەش دابـوو ئەو لیژنەیە ئازاد بێت لەوەی، هەر کۆمەڵەیەکی خـۆجێی ئەگەر ١٠٪ بـاجی دابێـت ئەوا بـۆی هەیە بەرپرسـێکی پزیشـکی تـایبەت بەخـۆی دامەزرێنـێ. بەڵام دانــانی ئەم بەرپرســە تەندروستییە بەزۆر نییە، ئەگەر ڕێژەی مردنـی خـاو crude death rate لە نـاوچەکەدا (کـۆی مـردن بەهۆکـاری جۆراوجـۆر، لەکـۆی دانیشـتوانی نـاوچەکە، لە مـاوەیەکی زەمەنـی دیـاریکراودا. و) لە کـۆی هەر هەزار کەسـێک ٢٣ کەس تێنەپەڕێنـێ. ئەم ئاسـانکارییە شـتێک بـوو لە ئەسـپی تەروادە، چونکە ئەو بەرپرسە تەندروستییانەی بە مەبەستی خۆپاراســتن دایاننــان، بەپێــی یاســاکە داوایــان کــرد لەسەرتاســەری وڵاتــدا هاوشـێوەی خۆیـان بەرپرسـی تـر دابنرێـت. ئەمجـۆرە ئاسـانکارییە بە نـاوی ڕێگەپێـدانەوە بـۆ بەندێکی یاسـایی، شێوازێکی بـاوە لەو کۆمەڵگە لیبراڵییـانەی لەســەر بنەمــای ئــازادیی کــار ڕەفتــار دەکەن، بەشـێوازێک ئێستاش سەداکەی دەنگدەداتەوە، دەتـوانین بڵێین لێکۆڵینەوە لەهەر کێشـەیەکی کـۆمەڵایەتی ئەگەر ئاگـادار نەبـین کێشـەی تـر بەدوای خۆیـدا دێنێـت وەکـو شـێوەیەک لە شـێوەکانی گەندەڵی.چادویک، بەدرێژایی ژیـانی دەسـتبەرداری بیـرۆکەی

نەخۆشییە پیسەکان و ڕۆڵی پاکوخاوێنی لە چاکبوونەوەدا نەبوو، لە ١٨٥٤ ناچارکرا دەست لە پۆستەکەی هەڵبگرێت، هەرچەندە کۆلێرا گەڕایەوە. شێوازە دیکتاتۆرییەکەی دوژمنی زۆری بۆ قووت کردەوە، دەیەویست لە دەرگای پێشەوە بڕگەی یاسایی ئیلزامیی بهێنیتە ژوورەوە، بەلاَم هێواش هێواش بە پارچە کراوی لەدەرگای پشتەوە دەیهێنانە ژوورەوە.

لەو کاتەدا، چەمکی نەخۆشییە پیسەکان گۆڕانکاریی بەسەرداهات. بەلاَم کاتێک خەڵک بەوەیان زانی، کار لەکار ترازابوو. فیلیپۆ پاچینی[37] (١٨١٢- ١٨٨٣) کە پسپۆری پشکنینی میکرۆسکۆپی بوو، هۆکاری کۆلێراکەی ١٨٥٤ ی ڕوونکردەوە. بە هەمان گرنگییەوە جۆن سنۆ[38] (١٨١٣- ١٨٥٨)، پسپۆری بێهۆشکاری و نەخۆشییە درمییەکان و پزیشکی پراکتیکی بوو لە لەندەن، سەلماندی کۆلێرا لە ڕێگەی هەواوە ناگوێزرێتەوە بەڵکو لە ڕێگەی ئاوەوە. جۆن سنۆ لە کاتی کۆلێرای یەکەم (١٨٣١- ١٨٣٢) پزیشکی موقیم بوو، کاتێ بووە پزیشکی پراکتیکی لێکۆڵینەوەی لەسەر نەخۆشییەکە کرد، بە پەرۆشەوە کاریدەکرد، لە کاتی هەردوو کۆلێرای ١٨٤٨ و ١٨٥٤ کە لەندەنی گرتەوە، بە تەواوی پشتی پێدەبەسترا، بەڵگەی بەهێزی سەبارەت بە پەتاکەی ١٨٤٨ پێشکەشکرد، بەوەی نەخۆشییەکە لەڕێگەی ئاوی پیس بە پاشەڕۆی مرۆڤ دەگوێزرێتەوە، زانیارییەکانی دەرەنجامی دوو ئەزموونی کەڵەکەبوو بوون لە ١٨٥٤ ڕایگەیاند. ترومپا بەناوبانگەکەی برۆد ستریت

---

37Philipo pacini.

38John snow.

یەکێکە لەو ئەزموونانەی سنۆ، ئەو ئەزموونەی کە ئەفسانە خولقێنە، ئەو ترومپایە لەگەڕەکی سۆهۆ بوو لە ناوەڕاستی لەندەن (شەقامی برۆد ستریت ئێستا ناوی بووە بە شەقامی برۆدویک ستریت) ئاوی دەدایە زۆربەی ماڵەکان، زۆرێک لەو ماڵانە ڕاستەوخۆ بۆریی بۆ ناوماڵەکان نەبوو یان زەمبەلەیان نەبوو. گەڕانی سیستماتیکانەی ماڵ بە ماڵ، دەرکەوت ئەو کەیسانەی ڕوویان دەدا، لەو ناوچەیە بوو کە یەک ترومپای ئاویان هەبوو، سەلمێندرا ئاوەکە پیسە و سەرچاوەی نەخۆشییە، چونکە بۆریی ئاوەڕۆیەک دەڕژایە ناوییەوە کلیلی سەر دەسکی ترومپاکە هەر ڕەمزی دانرابوو، ئەگینا کاری نەدەکرد؛ هەرچەندە پەتاکە ڕوو لە کزی بوو، بەڵام ئەو ڕووداوە سەرنجی زۆر لایەنی بەلای خۆیدا ڕاکێشا.

لێکۆڵینەوەی دووەمی سنۆ لە پەتاکاندا کە مایەی گرنگیدانی زیاتر بوو، بەراوردی ئەو دۆخەی خەڵک بوو، کە ئاوی ڕوباری تەیمزیان، لە دوو کۆمپانیای جیاواز دەکڕی: یەکێکیان فیلتەری دانابوو و ئاوەکەی لەسەرەوەی ئەو شوێنەوە وەردەگرت کە ئاوەڕۆکانی لەندەنی تێدا دەڕژا، بەڵام ئەویتریان فیلتەری نەدەکردو لەو شوێنەوە ئاوەکەی دەگواستەوە کە ئاوەڕۆکانی تێدەڕژا، سەرەڕای پیسییەکانی تر. هەندێجار دانیشتوانی یەک شەقام بوون، هەلومەرجی نیشتەجێ بوونیان هاوشێوە بووە، هەمان هەوایان هەڵدەمژی، بەڵام لە گەڵ دوو کۆمپانیای جیاواز گرێبەستیان کردبوو، سنۆ سەلماندی ئەوانەی ئاوی کۆمپانیا خراپەکەیان بەکارهێناوە، هەلی تووشبوونیان بە کۆلێرا ١٣ جار زیاتر بووە لەوانەی سەرچاوەی ئاوی باشتریان بەکارهێناوە.

دیاره ئەو بەڵگانەی سنۆ خستنییە بەرچاو بەلای ئێمەوە بەڵــــگەی ڕوون و ئاشــــکران، بەڵام لای زۆربەی ئەوانەی لەســەردەمەکەی ئەودا ژیــاون، نــا ئاشــکرابوون، سروشــتی کــۆلێراو هۆکارەکـــانی مـــاوەی چەنـــد دەیەیەک مـــایەی مشـــتومڕی زۆربـــوو، تەنـــانەت دوای ئەوەی لەســـەردەمی بەکتریۆلۆجیـــدا ڕۆبەرت کـــوخ ســـاڵی ١٨٨٤ هۆکـــاری نەخۆشـــییەکەی بـــۆ میکـــرۆب گەڕانـــدەوە. بەڵام شـــێوازی بیرکـردنەوەی کـۆن سـەبارەت بە نەخۆشـییەکە بە ئاسـانی ناگۆڕێت، لەکاتێکدا ژمارەی ئەو کەسانەی گوێیـان لە کـوخ دەگـرت لە ١٨٩٠ کـاتێ کـۆلێرا لە هـامبۆرگی دا، زۆر زیـاتر بوون بە بەراورد لەوانەی پێش چوار دەیە گوێیـان لە جۆن سنۆ دەگـرت. ئەو بەڵگـانەی کـوخ خسـتنییە بەرچـاو، وەکـو بەڵگەکـانی سـنۆ، زۆر بەهێـز بـوون. لە بەشـی داهـاتوودا دەبینین، قارەمـانە ڕاستەقینەکانی مەیانی پزیشـکیی نوێ، تـا هاتنی زانست، سەربازی ون بوون.

## سەرهەڵدانی بیرۆکراسی لە تەندروستی گشتیدا

"جـاران وشـــە، وشـــە بـــوو" ئـاوا لە ئینجیلـی پیـرۆزی یوحەنادا هاتووە، بەڵام ئێستا سەرکەوتن بۆ ژمـارەیە؛ ئێسـتا ئێمە کات بەڕێوەمان دەبات، چاودێری هەڵکشـان و داکشـانی نرخی دراوەکان، یان سوودی بـارمتەی خانووبەرە دەکەین، مانگانە باری کەشوهەوا بەپێی بەرزترین پلەی گەرمـی یـان شـێ لە تۆمارەکـانی کەشـوهەوادا دەپێـوین، ژمارەکـان لە کۆمەڵگەی هاوچەرخدا زاڵبوون بەسەر ژیانماندا.

گومانی تێدانییە بەڵگەکانی بواری تەندروستی ژمارەییە، ئامارە، بزووتنەوەی تەندروستی گشتی تا ڕادەیەکی زۆر بەرهەمـــی بـــزووتنەوەی پیشەســـازی و شارســـتانییە، کە شـــێوەی جیهـــانی ڕۆژئـــاوای لە کۆتاییەکـــانی ســـەدەی هەژدەمەوە گۆڕی، هەروەها پشتی بە ئەقڵی ژمارەیی بەست هاوشانی قازانج و زیان کردن لە سیستەمی پیشەسازیی کارگەکانـدا، توانییـان بەسـەر هێـزی هەڵمـدا زاڵـبن، لە سیستەمی فاتورەی کڕین و فرۆش system entry book-keeping دا و ئامـاری دانیشـتوان بەتەواوی بالادەست بوون. لە چەرخی ڤیکتۆریدا دانیشتوان هەروەکو ئێمە بەدەست ئەو فاکت و داتایانەی بەسەریاندا سەپێنرابوو هەستیان بە پشێوی ونیگەرانی کردووە. لێرەدا پێویستە تیشک بخرێتە سەر سێ ڕەهەند لە پرۆسەی پێوەری چەندایەتی بۆ کاری پزیشکی (کۆمەڵگە بەگشتی) ئەوانیش: لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون، چاودێری کردن و بایەخدان.

بەدواداچـوونی شـتەکان، سـادەترین بەشـی سـێ ڕەهەندەکەیە، لیژنەی یاسای هەژاران لە ساڵی ١٨٣٢ وا خۆی دەردەخات لەئاستی نیشتمانیدا پێشڕەوە، بێگومان کاتی خۆی لێکۆڵینەوە لە ڕاستییەکان شتێکی نوێ بوو، چادویک و هاوڕێکانی لە ئەندامانی لیژنە، فۆرمێکی ڕاپرسیی دوورو درێژیان بەسەر هەریەکە لە پاریشە بەرپرسەکان دەربارەی چاودێریکردن کە لەدەقی یاسای هەژاراندا هاتووە، دابەشکرد. هەوڵیاندا وەڵامەکانیان دروست و گونجاوبن. لەکۆتایی ساڵی ١٨٣٠ چادویک فرمانی کرد بەدواداچوونێک سەبارەت بە پەیوەندیی نێوان هەژاری و

قەرەباڵغیی دانیشتوان و نەخۆشییە پیسەکان ئەنجام بدەن. یەکەم کارێک کە کردیان جۆن سایمۆن[39] (١٨١٦- ١٩٠٤) لە ئەستۆی گرت بەو سیفەتەی لە ڕێبەرایەتی کردنی بزووتنەوەی تەندروستی گشتی بەریتانیدا جێگرەوەی چادویکە، ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەکە سەبارەت بە کووتان ومەودای کاریگەرییەکەی بوو لەڕێگەی سەپاندنی کووتانی زۆرە ملێوە کە هەموو ئەوروپای دەگرتەوە. ئەو لێکۆڵینەوەیە سایمۆنی هێنایە سەر ئەو باوەڕەی ڕێگەی خۆپاراستن لە ئاوڵە چالاک کردنی سیاسەتی کووتانی خۆڕاییە. لەو سالانەی سایمۆن لە پایەکەی خۆی بەردەوام بوو، هێواش هێواش هەستی بەوە کرد ڕازی کردنی خەڵک وەکو کەرەستەیەک بۆ بەدیهێنانی ئامانجی تەندروستی گشتی شتێکی بێسوودە، لەژێر سەرپەرشتی خۆیدا بەریتانیا سیستەمی کووتانی ئیلزامی لەسەرئەرکی حکومەت، بەخۆڕایی و گشتگیر، جێبەجێ کرد، لەگەڵ سزادانی ئەوکەسانەی ملکەچی بڕیارەکە نابن.

لەدەیەکانی ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەدا، جیهانی پێشکەوتوخواز هەر هەمووی هەستی بە هێزی ژمارەکان کردبوو، لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون بۆ ئەو مەسەلە کۆمەلایەتییانەی کە مۆرکێکی پزیشکییان لە خۆگرتووە، دووبارە دەکرانەوە، هەندێ مەسەلە گرنگیی زیاتری پێدرا و وردبینانەتر لێی کۆڵرایەوە، وەکو هەژاری، کارکردن بە مندالان، باردۆخی کارگەکان، فرتوفێڵ و گزیکردن لە مادە خۆراکییەکان، تۆڕەکانی ئاوی سازکار، دیاردەی

---

39 John Simon.

لەشفرۆشی، پێوەرەکانی خانوو دروستکردن، و بێگومان نەخۆشییە درمییەکان. زۆرجار بەدواداچوون بۆ مەسەلەیەک پەل دەهاوێ بۆ مەسەلەیەکی گرنگترو گشتگیرتر، بۆنموونە کارپێکردنی منداڵ بە کاری قورس و کرێدەستی کەم، مەسەلەیەکی لەوە گەورەتر دەورووژێنێ ئەویش پەروەردەو تەندروستی منداڵەکەیە. لە ڕۆمانێکی چارلز دیکنزدا، گرادگرایند تاکە کەس نەبوو لە ئەوروپای سەدەی نۆزدەدا وێڵی دوای "ڕاستییەکان" بێت، بەڵام لە ئێستادا ڕێژەی هاتنی ڕاستییەکان لە شێوەی خشتەو داتا و وێنە چەندایەتییەکان، بەردەوام لە زیادبووندایە.

ئەگەر لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونەکان، بابەتە پزیشکی و کۆمەڵایەتییەکانی لە ڕووی جۆر و فۆرمەوە جولاندبێ، ئەوا سیستەمی چاودێریکردن تەواوکەر و ستراتیجە، بە شێوەیەکی پلان بۆ داڕێژراو شوێن ئەو کێشانە دەکەوێت کە مایەی نیگەرانین. ستراکچەری زۆربەی شێوازەکانی چاودێری کردن، بۆ سەردەمی زوو دەگەڕێتەوە، بۆ نموونە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، گۆشتفرۆشە فەرەنسییەکان دەیانزانی کاتی هاتنی پشکێنەرەکان بۆ پشکنینی گۆشتەکەیان کەیە، نمایشگاو مارکێتەکان بەپێی مەرج و ڕێنماییەکان دەکرانەوە، مەرزەکان و بەندەرەکان و ئەو شارانەی شوورەدارن، بە کۆنترۆڵی پشکنین قایم کرابوون، بەتایبەتی لە کاتی هاتنی کۆلێراو نەخۆشییە درمییەکانی تردا؛ لەبەرئەوە پشکنینی گەشتیاران و شتومەکەکان شتێکی پێشبینی کراوبوو، بەهەرحاڵ ئەو پاشا وستەمکارانەی دەسەڵاتی ڕەهایان هەبوو، پێویستیان بە زانیاری ورد هەبوو دەربارەی هاتوچۆی دوژمنەکانیان. پێشەنگی ئەم

دەزگایانەی وەکو دەزگای لێکۆڵینەوەی فیدراڵی ئەمەریکی FBI ، ناوەندی هەواڵگری ئەمەریکی CIA ، نووسینگەی پێنجەمی بەریتانی MI5 و دەزگای هەواڵگری سۆڤییەتی KGB، لەڕابردوووشدا زۆر هەبوون، گەرچی تەنها تایبەتمەندبوون بە کۆنترۆڵ وئاسایشی وڵاتەوە، نەک بە تەندروستییەوە.



(١٧) لەم وێنەیەدا پێچەوانەی وێنەی (١٥) کاتێ دەوڵەت لە کارو بارە گشتییەکان خۆی هەڵدەقورتاند، خەڵک بە گاڵتەجاڕییەوە لێیان دەڕوانی، بەڵام لەم وێنەیەدا کە لانس کالکین لە (١٩٠١) کێشاویەتی خەڵک بەڕێزەوە لەو کارمەندە ئارامەی دەوڵەت دەڕوانێ کە ئەو کچانە دەکوتێ، دژی نەخۆشی ئاوڵە.

هەر لەگەڵ دارشتنی یاسای تایبەت بە تەندروستی گشتی، ئەو یاسایە پێویستی بە چاودێری کردن هەبوو، بەرپرسی یەکە پزیشکییەکان لە بواری تەندروستیدا، نەشتەرکاری کارگەکان، دەستەی پزیشکیی بەندەرەکان و ئەو گروپە تایبەتانەی پەیوەندییان بە تەندروستییەوە هەبوو، هەموو ئەمانە لەسەدەی نۆزدەدا بەشە بەرچاوەکەی کۆمەڵگەی ڕۆژئاوایی بوون. ڕوونترین نموونەی چاودێری کردن وەکو ئەرکی بەرپرسی تەندروستی گشتی و پزیشکە پراکتیکە ئاساییەکان، گەیاندن و ئاگاداركردنەوەی کۆمەڵگەبوو لە گەشەکردنی چەمکی نەخۆشی. ژمارەیەک لە کۆمەڵە مەدەنییەکان سووربوون لەسەر پێویستیی ئاگاداركردنەوەی دەسەڵاتی مەرکەزی لە مەترسیی نەخۆشییەکانی ئاوڵە. لە ساڵەکانی هەشتای سەدەی نۆزدەوە، دوای دەرکەوتنی زانستی بەکتریۆلۆجی، پلانسازی لە ئاستی نیشتمانی ڕەوتی خۆی وەرگرت وچەند نەخۆشییەکی خستە بازنەی پلانەکانییەوە، بەوپێیەی نەخۆشیی تەشەنەکردوون و مەترسین لەسەر تەندروستی گشتی. ئاوڵە وسوورەتا وگرانەتا ولەم دواییانەدا سیل و سیفیلیس، لەو نەخۆشییانەبوون کە مەترسی بوون بۆسەر تەواوی خەڵک وبەهای تایبەتبوونی تێپەڕاندبوو، هەموو تاکێک لەسەر دەستی پزیشکێک چارەسەر دەکرا، داوا لە پیشەوەرە پزیشکییەکان کرا، سەرەڕای ئەرکەکەی خۆیان دەبێ چاودێری دۆخەکەش بن (بەرامبەر پڕکردنەوەی فۆرمەکان کرێیان وەردەگرت، بۆیە بەرگرییان بەرامبەر بیرۆکراسییەت کەم بووبووەوە) لەگەڵ ئەوەی بەرپرسە

پزیشـــکییەکانی تەندروســـتی وهاوشـــێوەکانیان، لە وڵاتە جیاوازەکـان لەبەرەکـانی پێشـــەوە بـوون، بەڵام چـاوەڕوانی لەوە دەکرا هەموو پزیشکەکان بێنە ڕیزیانەوە، بۆ بەرەکانی پێشەوە.

لەچوارچێـــوەی مەســـەلە یاســـایی وپزیشـــکی وئەخلاقییەکانـــدا، کە پرۆســـەی چـــاودیری دەیگـــرتنەوە، کێشـــەکەی مـــاری مـــالۆنی بەناوبانـگ (١٨٦٩- ١٩٣٩) یـان "مـــاریی تیفۆئیـــد" ســـەرهەڵدەدات. ئەو ژنە لە دایکبـــووی ئیرلەنـدەیە و وەکـو چێشـت لێنەری زنجیـرەیەک لە خێـزانە دەوڵەمەندە نیۆیۆرکییەکان، لەدەیەی یەکەمی سەدەی بیستدا کـــاریکردووە. تەندروســـتییەکی زۆر باشـــی هەبـــوو، بەڵام هەموو ئەو تایبەتمەندییانەی ڤان کوخ پێش ماوەیەک باسی کردبـوو بە نازنـاوی (دۆخـی هەڵگری نەخۆشـی)، لە ماریـدا هەبوو، واتە بەکتریای تای تیفۆئیدی بڵاودەکردەوە، بێئەوەی خۆی هیچ نیشانەیەکی نەخۆشییەکەی پێوەبێت. ژمارەیەکی زۆری ئەنـــدامی خێزانەکـــان بەو نەخۆشـــییە تووشـــبوون، بەرپرســـەکانی تەندروســـتی گشـــتی بەدواداچوونیـان بـۆ ئەم شـــێوە لە تەشـــەنەکردنی نەخۆشـــییە دابـڕاوە کـرد. ئەم ژنە کۆچەرە، کە هۆشـیارییەکی ئەوتۆی نەبـوو و ئاگـاداری ئەو هەڵەیە نەبـوو لێـی ڕوویـدابوو، جـگە لەوەی مەترسـی بـوو بۆسەر تەندروست گشتی، نێردرایە بەندیخانە و سزای ئەو "تاوانە"ی ئەنجامی دابوو وەرگرت.

لێکۆڵینەوەی بەدواداچـوون ئەرکـی ئەو بەرپراسـانە بـوو کە پەیوەنـدییە نوێیەکانیـان ئاشـکرا دەکـرد، بەڵام چـاودێری

کردن ئەرکی هەر پزیشکێک بوو، کە نەخۆشێکی دەبینی تووشی نەخۆشی بووە پێویست بوو بەبەرپرسەکانی ڕابگەیەنێت. ئامارکردنی نەخۆشییەکانیش تایبەت بوو بەو کەسانەی ڕاهێنانی تایبەتیان کردبوو لەسەر تێگەیشتن لە سروشتی هۆکارەکان و مەسەلە پەیوەندیدارەکان. بزووتنەوەی تەندروستی گشتیی نوێ، هاوتەریب لەگەڵ دەستە ئامارییەکاندا دامەزرا، لەبەر زۆرێک لەو هۆیانە، هەردووکیان کاردانەوە بوون بۆ ڕەوتی دامەزراوەیی، هەروەها بزووتنەوەی تەندروستی گشتی وکۆمەڵە ئامارییەکان، خۆیان لەزۆرێک لەو ئەندامانە پێکهاتبوون کە پەیوەستی دۆخەکەبوون.

هەرچەندە ئەگەرە بیرکارییەکان لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا سەریان هەڵدا، بەڵام هاوبەشە بیرکارییە سەردەمەکە، "ئامار"بوو، کە لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەدا گەشەیەکی ئەوتۆی نەکردبوو. دەستە ئامارییەکان لەسەرەتاوە تەرخان کرابوون بۆ کۆکردنەوەی ژمارەیەکی زۆر لە بینراوەکان و پێشکەشکردنی ئەو بینراوانە لەسەر فۆرمی خشتێنراو، تۆمارکردنی مردوو لە تۆماری مەدەنیدا لەزۆربەی وڵاتە ئەوروپییەکاندا بەشێوەی ساڵانە هۆکاری مردنی تێدا تۆماردەکرا، لەهەمان کاتدا هەوڵی نێودەوڵەتی دراوە بۆ یەکخستنی ئەو بەشانەی دەستنیشانی نەخۆشییەکان دەکەن. زۆربەی نەخۆشییەکان لەسەر بنەمای نیشانەکان (وەکو 'تا' یان 'زەردوویی') بەش کراون، پێویستە ئەم نیشانانە لە خودی نەخۆشییەکە خۆی دوور بخەینەوە،

پـــۆلێنزانی، گرنگیـــدان به نەخۆشـــییەکانی لاپەســـەندە؛ پزیشـــکەکان لە هەردوو بـــواری نیشـــتمانی و نێـــونەتەوەیی پێویســـتە لە تۆمـــارکردنی هۆکـــاری مردنـــدا لە بەڵگەنـــامەو ڕاپۆرتی ســـالانەی نەخۆشـــخانەکاندا پەنجە بـخەنە ســـەر ئەو نەخۆشییانەی کە هۆکاری مردنەکە بوون.

لە ســـەرەتای کـاری فرانسیس گـالتۆن[40] (١٨٢٢ -١٩١١) کە ئامۆزای چارلز داروین بوو "نیشـانەی نەخۆشـییەکان" بە هەمـــان شـــێوەی نەخۆشـــییەکان چـــوونە بـــواری ئامـــارەوە؛ سروشـــتی پرۆســـەی بۆمـــاوەیی ســـەرنجی گـــالتۆنی بەلای خۆیـدا ڕاکێشـا، چەنـد شـێوازێکی بیرکـاریی بـۆ لێکدانەوەی هاوبەشـــە ڕێژەییەکـــانی دایـــک و بـــاوک لەســـەر وەچەکانیـــان داهێنـا، جگە لە ڕۆڵـی باوباپیران، لە پێکهـاتە بۆماوەییەکـانی تاکـــدا. بەو ســـیفەتەی دامەزرێـــنەری چـــاککردنی وەچەیە، بەشێوەیەکی تایبەت گرنگیی زۆری بەجیاوازیی ڕێژەیی ئەو منداڵانەدا کە لەدایـک دەبن، لەنێوان بـاوک و دایکە هەژار و نابەرپرســـەکان لەگەڵ بـــاوکە بەرپرســـەکان لە چینەکـــانی ناوەڕاســـت، زۆربەی تایبەتمەنـــدییە مرۆییەکـــانی نێـــوان هەردوو وەچەکەی دیراســـە کـــرد، وەکـــو درێـــژی بـــالا و تێکڕایی تەمەن و هێزی ماسوولکەیی و ســـەرکەوتن لەژیـان. گالتۆن لە هاوکێشەی تەندروستی گشتیدا بۆماوەزانی هێنایە نـــاوەوە، لە بوارێکـــدا پێشـــتر لەپـلەی یەکەمـــدا گرنگیـــی بە کـــاریگەریی مەســـەلە ژینگەییەکـــان دەدا، وەکـــو تەقینـــەوەی

40 Francis Galton.

دانیشتوان و پیسبوونی ژینگە. دوای گاڵتۆن پێویست بوو هەردوو بواری "سروشت" و "پەروەردە" ڕەچاو بکرێت.

هەرچەندە گاڵتۆن لەهەردوو بواری ماتماتیک و پزیشکیدا ڕاهێنانی ئەنجامداوە (بەلام لەهیچ بوارێکیاندا کاری نەکردووە) کارڵ پێرسۆن[41] (١٨٥٧- ١٩٣٦) کە خوێندکاری گاڵتۆنە بۆ هەریەکە لە زانستی ئەزموونگەری و پزیشکی کلینیکی ئاماری لەڕیزی پێشەوە داندا. زۆربەی سەرنجەکانمان لە نیشانەی نەخۆشییەکان، کە بەهاکەی 'p' (وەک گۆڕانکارییانەی دەپێورێن، ڕێژەی متمانەی ٪٩٥)ە، دەگەڕێتەوە بۆ پێرسۆن . هەر ئەو لێکۆڵینەوەی لەسەر ڕۆڵی بۆماوەیی لە نەخۆشی سیل و ئالوودەی ئەلکهول ئەنجامدا، بەلام لە بنەڕەتدا گرنگیی بە گەشەی زینەدزانی دەدا. لەسەر دەستی خوێندکارەکانی ماتماتیک لە زانستی ژینگە و هەڵسەنگاندنی چارەسەرە نوێیەکان، لەڕێگەی ئەزموونی کلینیکییەوە ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو.

ئەو گۆڕانکارییانەی لەسەدەی بیستەمدا بەدەستهاتن درێژکراوەی ئەو لێکۆڵینەوەو فۆرم و داتا سادانە بوو، لایەنگرانی تەندروستی گشتی لە سەدەی ڕابردوودا بەکاریان دەهێنا، بەلام کەسە پەیوەندیدارەکان لەسەدەی نۆزدەدا نەیانتوانی گەشەی پێبدەن، گەشەکردنی تەندروستی لە سەدەی بیست درێژکراوەی ئەو ڕاستی و ژمارانە "ڕێگەی ژمارەیی"یە کە لۆی لە ناو نەخۆشخانە و دەرەوەی نەخۆشخانە، لە کارگەکان لە ناو کۆمەڵگە دایهێنا لەڕێگەی

41 Karl Pearson.

هەڵسەنگاندنی داتاکانەوە، بەکارهێنانی، ئامرازە بیرکاری و ئامارە پێویستەکان بۆ ئەو هەڵسەنگاندنە، گرنگییەکی زۆری هەبوو لە بواری تویژینەوەی تەندروستی و بواری خۆپاراستن لەنەخۆشی.

# بەشی پێنجەم
# پزیشکی لە تاقیگەدا

## بە زانست کردنی پزیشکی

هەمیشە پزیشکیی ڕۆژئاوا لەو وەهمەدا ژیاوە "زانست"ییە، بەڵام ئەو زانستەی ئەو مەبەستێتی گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە. هیپۆکراتییەکان خۆیان دەبەنە ڕیزبەندی زانستەوە، (گریکەکان زاراوەی وەکو "فەلسەفەی سروشت"یان بەکارهێنا)، ژمارەیەک لە شوێنکەوتووانی گالینۆسیش بەهەمان شێوە. ئەو کردە پزیشکییەی بەکاریان دەهێنا دوو تایبەتمەندی 'زانستی' بنەڕەتی هەبوو.

یەکەمیان، تایبەتمەندییەکی ئەقڵانی شاراوەی هەبوو، لەبەر ڕۆشنایی بیرو بۆچوونەکانیان بۆ جیهان، دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکان و چارەسەرکردنەکانیان، لۆجیکی بوون. بێگومان ئەمە دیدێکی ڕێژەییە بۆ زانست؛ ئەو کردە پزیشکییەی لەسەر بنەمای ئەستێرەناسی بوو، ئەویش ئەقڵانی بوو، بەوپێیەی کاریگەریی هەسارەو

ئەستێرەکان لەسەر ڕەفتاری مرۆڤ و ڕووداوە دونیاییەکان شـتێکی پەسـەندکراوبوو. بـۆ دوورخسـتنەوەی ئەوجـۆرە پراکتیکە، پێویستە پرەنسیپە شاراوەکان لاببرێن، نەک بنەما ئەقڵانییەکان کە لە پرۆسەی ئەقڵانیدا پشتی پێبەستراوە.

تایبەتمەندیی زانستیی دووەم ئەوەیە پراکتیکی پزیشکی تـاکو لەسـەر بنەمـای "ئەزمـونگەری" بەدەسـتهێنراو بێت لە ڕێـگەی شـارەزاییەوە، ئەوا سـوود بە پزیشـک و نەخۆشەکانیان دەگەیەنێت، بۆنموونە، کەڵەشاخ، یان هەزاران شێوازی تری چارەسـەر هەن بێسـوودن یـان بەلای ئێمەوە مـایەی شـەرمەزارین، بەڵام بەپێـی ڕێنماییەکـانی پزیشـک پێویسـتن. مێژوونووسـان ئەم ڕووداوانە دەگەڕێـنـەوە بـۆ هێزی چارەسەری سروشت، یان باشبوونی دۆخی نەخۆش کـاتێ چارەسـەر وەردەگرێـت بەهـۆی چارەسـەرەکەوە چاکنەبۆتەوە، یان بەهۆی ئەو لۆجیکە کۆنانەوە کە بەردەوام بەرەوڕووی بووینەتەوە وەکو: "ئەوەی دوای ئەو ڕوویداوە، ئەوە هۆکـارە" بەڵام ئەم وتە کۆنەخـوازانە ناتوانێت ئەو لێکدانەوانە پووچەڵ بکاتەوە کە لایەنە بەشدارە مێژووییەکان بە پزیشکی "ئەقڵانی" یان "زانستی" ناویان بردووە.

لەسـەرەتای سـەردەمی نوێـدا، پشتبەسـتن بە شـارەزایی پشـتیوانیی لە ئەزموونەکـان کـرد، کە بـنکەکەی زۆرجـار تـاقیگەی کارخانەکـان بـوو. واتـای وشـەکە ئەو شـوێنەیە مرۆڤ کاری تێدا دەکات، سـەرەتا تاقیگەکان لە ماڵی خەڵک دادەنران، خۆی لەو ژوورە ساکارانەدا دەبینییەوە، کەسەکان لەکـاتی دەسـبەتاڵیدا بـۆ دۆزیـنـەوەی نهێنییەکـانی سروشـت بەکاریـان دەهێنـا. نمـوونەی بەرچـاوی کارخـانە کۆنەکـان و ئەو شـێوانەی ئەو کـاتە کێشـراون، دەریـدەخات کـارگەی

کیمیایی بوون؛ فەیلەسوفە سروشتییەکان هەوڵیانداوە فێری چۆنێتی گۆڕینی کانزا بن بۆ زێڕ. ئەو کەرەستانەی لەو کارخانەیەدا بەکاریان دەهێنا بریتی بوون لە فرن، ئامێری دڵۆپاندن، مادە کیمیاییە دۆزەرەوەکان، تەرازوو وکەمۆڵەی قەبارە جیاواز، بەڵام ئەوانەی گرنگییان بە توێکاری و زانستی جەستە و زانستەکانی تر دەدا، ئامرازی نەشتەرگەری و مێزی توێکاری و کەرەسەی تریان هەبوو بۆ پێوانەی ئەو توێژینەوانەی لەو کارخانانەدا ئەنجام دەدران. فیزیایی بەلجیکی جی.بی.ڤان هێلمۆنت[42] (١٥٧٩-١٦٤٤) بۆماوەی پێنج ساڵ لە دەفرێکدا پارێزگاری لە نەمامێک دەکرد، بەشێوەیەکی ڕێکوپێک بە ئاوی باران ئاو دەدرا، ئینجا دارەکەو خۆڵەکەی دەوری پێوا، بینی کێشی خۆڵەکە نەگۆڕاوە بەراورد لەگەڵ کاتی ناشتنی، ئەوەی گۆڕاوە کێشی دارەکەیە بۆتە ١٦٤ پاوەند، هێلمۆنت ئەو زیادەیەی گەڕاندەوە بۆ ئاوەکە. لە ئیتاڵیا سانتۆریۆ (١٥٦١-١٦٣٦) کورسییەکی تایبەتی دروست کرد، ئەو کورسییە بە وردی چاودێری کێشی سانتۆرۆی دەکرد، زۆر بەوردی ئەو کێشەی دەژمارد کە دەیخواردو دەیخواردەوە، لە گەڵ کێشی ئەو پاشەڕۆیەی دەیهاویشتە دەرەوە، هەموو جیاوازییەکە لەو "ئارەقە هەست پێنەکراو" ەدا بوو کە دەری دابوو. ولیام هارڤی باسی مار و بۆق و بوونەوەرە خوێن ساردەکان دەکات تاکو بتوانێت بە باشی چاودێری لێدانەکانی دڵ بکات، لەچوارچێوەی هەوڵدانی بۆ تێگەیشتن لە "جووڵەی دڵ" و سووڕی خوێن. ئەلبێرت ڤۆن

---

42J.b. van Helmont.

هالەر[43](١٧٠٨- ١٧٧٧) زنجیرەیەک تاقیکردنەوەی لەسەر گیانەوەرە زیندووەکان ئەنجامدا لەچوارچێوەی هەوڵەکانی بۆ جیاکردنەوەی نێوان وروژان و هەستیاریی گیانەوەران، مەبەست لە وروژان ( توانای کارلێکی لەگەڵ هاندەرە دەرەکییەکان، کە ئەرکی ماسوولکەکانە) وە هەستیارییەکەش مەبەست ( توانای هەستکردنە وەکو دەرەنجامی ئەرکی دەمارەکان). ئەزمونگەرایی پاڵنەرێکی کۆنە شوێنەواری کاری پزیشکییە، زۆرجار ڕۆحی پێوەرە چەندایەتییەکانی تێدایە، واتە ئەو شتانەی دەتوانرێ بپێورێت یان بزانرێت.

میکرۆسکۆپ، یەکێکە لەو ئامێرانەی لەشوێنی کاری زانستیی کۆندا دەبینرا. لەو کاتەدا هەندێ کێشەی هەبوو وەکو لادان وشێواندن، پێش سەدەی نۆزدە مێژوونوسان ئاماژەیان بە پشکنینی میکرۆسکۆپ داوە، وەکو ئەوەی یارییەک بێت بەدەستی بەهرەوەرە دەوڵەمەندەکانەوە. لێکۆڵینەوە نوێیەکان، لەدیبەیتە زانستییە جدییەکاندا پێداگرن لەسەرئەوەی میکرۆسکۆپ لەسەرەتای سەدەی حەڤدەهەمەوە بەکارهاتووە، بەتایبەتی لەلایەن ئەنتۆنی ڤان لیڤنهۆک [44]( ١٦٣٢- ١٧٢٣)ەوە، لیڤنهۆک کوتاڵفرۆش بوو و لە هۆڵەندا خۆی فێری بەکارهێنانی میکرۆسکۆپ کرد، وە ڕۆبەرت هوک[45] (١٦٣٥- ١٧٠٣) هەر لەسەرەتاوە کەسێکی خاکەڕابوو، بەڵام لەچوارچێوەی توێژینەوەکانیدا خۆی بە ڕکابەری ئیسحاق نیوتن[46] (١٦٤٢-١٧٢٧) دەزانی. هوک

43 Albrecht von haller.
44 Antoni van leeuwenhoek.
45 Robert hooke.
46 Issac Newton.

وشـــەی "خـــانە"ی لەکتێبەکەیـــدا بە نـــاوی (پشـــکنینی میکرۆســـکۆپی) لە ١٦٦٥ دارشـــت. بەڵام میکرۆســـکۆپ ڕێگربـوو لەوەی هەر کەسێک بە کەیفـی خـۆی ئەو جیهـانە نوێیەی دەیدۆزێتەوە ببینێت، تـاکو ئەو کێشـە هونەرییـانەی وەرسـکەربوون چارەسـەرکران. بەڵام لەسـەدەی نـۆزدەدا میکرۆسکۆپ لە ئاسـۆی بەکارهێنانیدا بووە هێمـای جیهـانی پزیشـکی، هەمـان ڕۆڵـی بینـی کە سـەماعەی پزیشـکی لە کلینیکی پزیشکیی پێشکەوتوودا دەیبینی.

## خانە: بچووکترین یەکەی هەمیشەیی

خـــانە یەکەی بنەڕەتیـــی پزیشـــکییە بـــۆ تێگەیشـــتن لە نەخۆشـــی، شـــێوازی تێکەڵەکـــان بەتەواوی پەیوەنـــدیی بە جەستەوە هەیە، بەڵام مۆرگانی ئەندامەکانی جەستەی کردە خـاڵی دەسـپێک و بنەڕەتـی بـۆ لێکۆڵینەوەکـانی، بیچـاتیش گرنگی بە شانەکانی جەستە دەدا بۆ پۆلێنکردنی گۆڕانکاری لە نەخۆشـییەکان و شـی کردنەوەیـان. ئینجـا خـانە چـووە ڕیزبەنـدی پێشـــەوە بـــۆ پارێزگـــاری کـــردن لەپـــێگە سەرەکییەکەی خۆی، تەنانەت لەگەڵ سنووردارکردنی یەکە لاوەکییەکانی خـانە و گەردەکـان، بەوپێیەی خـانە پێکهـاتەی ســـەرەکییە لە گۆڕانکـــارییە تایبەتەکـــانی میکانیزمەکـــانی نەخۆشی.

تیـۆری خـــانە کە لە ١٨٣٠ ســـەرکەوتنی بەدەســـتهێنا، دەکرێ بکرێتە بەردی بناغەی هەریەکە لە زانستی پزیشکی و زینـــدەزانی (بایۆلۆجیـــا)ی نـــوێ، وشـــەی بایۆلۆجیـــا دەگەڕێتەوە بـۆ سـاڵی ١٨٠١ بەڵام وشـەی "زانـا" لەسـاڵی ١٨٣٣ داڕێـژرا. ئەم دوو وشـەیە ئامـاژە بەو گۆڕانکـارییە

بنەڕەتیـــــــیە دەکەن لەم دوو دەیەیەدا ڕوویانـــــــداوە، لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەدا هەندێ تیۆر، بوونی هەندێ یەکەی زۆر وردیان سەپاند کە هەموو بوونەوەرەکانی لێ دروستبووە. هەندێ لەو یەکانە وەکو "خڕۆکەکان" لەڕاستیدا دروســـتکراوی میکرۆســـکۆپە بەکارهێنراوەکـــانی ئەو ســـەردەمەن. لە کۆتـــایی ســـاڵی ١٨٢٠ تەواوی کێشـــە تەکنیکییەکان چارەسەرکران. بەشێوەیەکی ڕێکوپێک باسی ئەو یەکانەیـــان کـــرد کە بەڕێـــگەی دۆزیـــنەوەی خانەکـــان دۆزرانەوە جگە لە ناوەڕۆکەکەیان بەتایبەتی نـاوک. ئینجـا دووســـاڵ بەدوای یەکـــدا ١٨٣٨ و ١٨٣٩ زانـــای ئەڵمـــانی ماتیاس شلایدن[47](١٨٠٤- ١٨٨١) پێشنیاری کرد، خانە ببێتە یەکەی ســـەرەکی پێکهاتەی ڕووەک، بەلام زانـایەکی تـری ئەڵمانی تیۆدۆر شوان[48] (١٨١٠- ١٨٨٢) پێشنیاری کرد خانە ببێتە یەکەی ســـەرەکی گیانەوەر، بەڕێکەوت نەبوو کە ئەم دوو زانایە ئەڵمانین، زۆربەی توێژینەوە پزیشکییە نوێیەکان لە چوارچێوەی سیستەمی زانکۆ ئەڵمانییەکاندا، لەئەڵمانیاوە سەریان هەڵداوە. شلایدن لەڕووی ئەکادیمییەوە زانایەکی ڕووەکـــی بـــوو، بەلام شـــوان کە پزیشـــکیی خوێنـــدووە، خوێندکاری گرنگترین مامۆستای بواری پزیشکی زانستی بووە؛ ئەویش یۆهـانز مـۆلەر[49] (١٨٠١- ١٨٥٨)بووە. شـوان ســـەرکەوتنێکی بەرچـاوی لەســـەرەتای کـاری توێژینەوەییـدا سەبارەت بە کرداری ترشـاندن و هەرسـکردن بەدەستهێنا، ســـەرەڕای گەشـــەپێدانی تیـــۆرییەکەی دەربـــارەی خـــانە،

---

47 Mathias Schleiden.
48 Theodor Schwann.
49 Johannes Muller.

هەروەها وتی ئۆرگانە ئاڵۆزەکان بریتین لەچەند کۆمەڵەیەک لە خانەی یەککگرتوو، پێویستە لە فرمانە سروشتییەکانی، لە نەخۆشـییەکانی، لە ڕووی تایبەتمەنـدییە زینـدووەکانی ئەو قەوارانەوە تێبگەین، هەروەهـا بـاوەڕی بەوە هەبـوو خـانە سـەرەتاییەکان لە قۆناغەکـانی پـێش گەشـەی کـۆرپەلە، یـان شانە هەوکردووەکان، لە شلەیەکەوە گەشـە دەکەن پێیدەڵێن "بلاستیما" [٥٠]



**وێنەی (١٨) یەکێ لە کێشـە هەمیشـەییەکانی ئەم میکرۆسکۆپە ئەوەبـوو یەک کەس دەیتـوانی لە هەمـان کاتـدا تەماشـای بکـات، ڕۆبەرت کـوخ ئەم کێشـەیەی لەڕێگەی بەکارهێنـانی کـامیراوە بـۆ تۆمـارکردنی وێنەکـان چارەسـەرکرد، سـاڵی ١٨٧١ تایبەتمەنـدیی هـاوبەش بەڕادەیەکی باشـتر دەرکەوت، بەداهێنـانی ئـامێرێکی سـێ تیوب بەشێوەیەکی باشتر شرۆڤەی وێنە گەورەکراوەکە دەکرێت.**

٥٠ لە گیانەوەرزانیدا کۆمەڵێک خانەی نامۆتوانای گەشەکردنیان هەیە ببنە ئەندامێکی نوێ یان پاشکۆیەک. بۆنموونە لە کرمەکاندا بلاستیما گرنگییەکی تایبەتی هەیە لە نوێبوونەوەی پارچە براوەکانیاندا. وەرگێڕ

ئەم تیۆرییە بەشێوەیەک ڕێکخرا، میکرۆسکۆپ بتوانێ لەبەر تیشکی ئەو سەرنجەی پێیوایە ژیان لە سەرەتاوە بەرهەمی پرۆسەیەکی فیزیاییە، ئاشکرا بکات. بەڵام شوان هەر زوو دەستبەرداری باوەڕە ماتریالیییەکەی خۆی بوو و دەیەی دوایی ژیانی لەنێو دونیای ئایین و قووڵایی فەلسەفەدا بەسەربرد. تیۆرە خانەکەی لای زۆربەی خەڵک پەسەند بوو، بەڵام لەلایەن هەندێ کەسی ترەوە، لە بواری پزیشکیدا جێبەجێ کراو گەشەی پێدرا، یەکێ لەوانە رۆدۆلف ڤیرچۆ[51] (١٨٢١- ١٩٠٢) بوو. فیگەرێکی بالای زانستی پزیشکی ئەڵمانیی سەدەی نۆزدە بوو. ڤیرچۆ بەدرێژایی ژیانی لەنێو کۆمەڵگەی ئەڵمانیدا کەسێکی لیبراڵ بوو، بەردەوام بە گیانێکی شۆڕشگێڕانەوە خەریکی کارکردن بوو، لە لاویێتیدا لایەنگری سیاسەتێکی ڕادیکاڵ بوو، لەساڵی ١٨٤٨ لەدەمی بڵاوبوونەوەی پەتای کۆلێرادا، ڕابەرایەتی کۆمەڵێ پزیشکی گەنجی ڕیفۆرمخوازی دەکرد؛ هەندێ کاتی لە ساتراتانەدا بەسەردەبرد کە ئەندامە شۆڕشگێڕەکانی بەرلین سازیان کردبوو. بەرپرسە پروسییەکان بۆئەوەی لە چەقبەستووەییە دەری بێنن، بە مەبەستی لێکۆڵینەوە لە پەتای گرانەتا ناردیان بۆ سیلیزیای باکور، کە ئێستا بووەتە بەشێک لە پۆڵەندا، بەڵام ئەوکات لە ژێر دەسەڵاتی پروسیادا بوو، ڕاپۆرتێکی نووسی بەرپرسەکانی دەسەڵات بە دڵیان نەبوو، گوێیان پێنەدا چونکە بەرپرسیارێتی ئەو پەتایەی خستبووە ئەستۆی هەژاری کۆمەڵایەتی و بەشمەینەتی و

51 Rudolf Virchow.

نەخوێنـــدەواری و ســـتەمی سیاســـی، بۆچـــوونی وا بـــوو باشترین ڕێگە بۆ زاڵبوون بەسـەر پەتـاو پەتـای هاوشێوە، دابینکردنـی دیموکراسـی و فێرکـردن و دادوەریـی ئـابوورییە. پێیوابوو یەکێ لەو ڕۆڵە گرنگانەی کە پێویستە پزیشکەکان پێیەوە پابەندبن بـانگەوازە بۆ ئەو چاکسـازییە، پزیشـکەکان هەر بە خۆڕســـک خۆیـــان لایەنگـــری هەژاران بـــوون، پیشـــەکەیان وای لـــێ کردبـــوون بەردەوام لەگەڵ هۆکـــارە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان سـەبارەت بە نەخۆشیی لەسـەر خەت بن. ڤیرچۆ بەردەوام گرنگیی بەسیاسـەت و ڕیفۆرمی تەندروســـتی دەدا، لە پەرلەمـــانی ئەڵمـــانی و ئەنجـــومەنی تەندروستی گشتیی بەرلین خزمەتی کردووە، پێی باشبوو قەوارەی سیاسـی بە جەسـتەی مـرۆڤ بشـوبهێنێ، بەوەی خانەکان دەبنە هاونیشتمانیی جەسـتە. پێویسـتبوو لەسـەر پزیشـکەکان لە چاوچێـوەی کـاری ڕۆژانەیانـدا، بەرەنگـاری شوێنەوارە خراپەکانی هەژاری- لەسەر تەندروسـتی ببنەوە. وزەیەکـی هەڵقـولاوی سـەبارەت بە گرنگیـدان بە هەردوو بـواری مرۆناســـی و شوێنەوارناســـی (ئەنســـرۆپۆلۆجیا و ئەرکیۆلۆجیا) هەبوو. هەوڵی زۆری دا سـەرەڕای دەرکردنـی چەند گۆڤـارێکی زانستی ژمـارەیەک کتێبی چەند بەرگییش بنووسـێت. تـا ئێسـتاش گۆڤـاری پاسـۆلۆجیا کەخـۆی بـۆ مـــاوەی نیـــو ســـەدە دامەزرێـــنەر وسەرنووســـەری بـــوو، دەردەچێـت و بە میـرات و"ئەرشـیفی ڤیرچـۆ" دەناسـرێت، تائێســـــتاش زۆر کەس بە زانـــــای زانســـــتی نەخۆشـــــی 'پاسـۆلۆجی' نـاوی دێنن. لە میکـانیزمی نەخۆشـییەکاندا زۆر بـــاوەڕی بە ڕۆڵـــی بنەڕەتیـــی میکرۆســـکۆپ هەبـــوو

(خوێندکارەکانی فێردەکرد بە چاوی میکرۆسکۆپی بڕوانن) ئەو تیۆرانەی گرنگی بە خانە دەدەن لە ناو کردەی پزیشکیدا جێی کردنەوە، گومانی لە بوونی "بلاستیما" کە شوان لەسەری دوواوە وەکو سەرچاوەی خانەی نوێ هەبوو، بەتایبەتی ئەو خانانەی لە قۆناغی پێش گەشەی کۆرپەلەدا لە شلەیەکەوە دروستبوون، یان کاردانەوەی ئەو شانانەی هەودەکەن، لەبەرامبەر ئەوەدا وتی هەر خانەیەک لە خانەی دایکی پێشووەوە دێت (هەرچەندە ئەم دروشمە لە بنەڕەتدا دروشمی ئەو نەبوو)، ڤیرچۆ باوەڕی وابوو لە جیهانی زانستیدا، خانە بەهیچ شێوەیەک دروست نابێت، یان لەخۆیەوە گەشە ناکات، وەکو 'بلاستیما' بەڵکو لە ئەنجامی دابەشبوونی خانەکانەوە دروست دەبێت. تیۆرەکەی خۆی دەربارەی پاسۆلۆجیای خانە لە ١٨٥٠، لە ڕێگەی زنجیرەیەک وتارەوە باسکرد، زۆربەی بابەتەکانی لە گۆڤارەکانی خۆیەوە بڵاوی دەکردنەوە، لەساڵی ١٨٥٨ کاتێ گەڕایەوە بۆ بەرلین (دوای حەوت ساڵ مامۆستایی لەبواری پاسۆلۆجیا لە فۆرتسبۆرگ)، زنجیرەیەک موحازەرەی خۆی بە ناونیشانی "پاسۆلۆجیای خانە" بڵاوکردەوە، سەلماندی خانەکان یەکەی بنەڕەتیی چالاکیی فسیۆلۆجی و بایۆلۆجین، ڕوودانی هەر نەخۆشییەکی کلینیکی ڕۆتینی (وەکو هەوکردنی کوتوپڕ ودرێژخایەن وگەشەی خانەی شێرپەنجەیی وبڵاوبوونەوەی) وکاردانەوەی جەستە بۆ هاندەرە دەرەکییەکان (وەکو ورووژان یان فشار) دەکرێ لەچوارچێوەی خانەییدا لێی بڕوانرێت. خانە پێگەیەکی

سەرەکی لە زانستی نەخۆشیدا هەیە، لەهەمان کاتدا کارکردنی لەسەر پرەنسیپی بایۆلۆجی هەمەکی ترە.

ڤیرچۆ کۆمەڵێک سەرنجی گرنگی هەبوو لەسەر ژمارەیەک نەخۆشی وەکو هەوکردنی خوێنهێنەر و گیرانی مولوولەی خوێن وشێرپەنجە و نەخۆشی ئەمیلۆید[٥٢] (کە نەخۆشییەکی دەگمەنەو تائێستا هۆکارەکەی نەزانراوە)، یەکێکە لەو مامۆستایانەی زۆرترین کاریگەریی لەسەر زانستی نەخۆشی هەبوو لەسەدەی نۆزدەدا. زۆرترین پێشرەوانی ئەو بوارە لە دواییدا لە ئامۆژگاکەی ئەو لە بەرلین خوێندیان. هەندێ ئەزموونی کاریگەری لەسەر گیانەوەران ئەنجامدا، بەڵام بەشێکی زۆری کارەکەی لە لێکۆڵینەوەی شانە وخانە پاسۆلۆجییەکاندا بەسەربرد، وئەو دەرەنجامەی پێی گەیشت بەو کێشە کلینیکیانەوەی گرێدا کە نەخۆش لە ژیانیدا بەدەستییەوە ئازاری چەشتووە، شاهیدی ئەو گەشەکردنە نوێیەی تەکنۆلۆجیای میکرۆسکۆپ بوو، وەکو بەکارهێنانی نەشتەری مایکرۆتۆمی بۆ برینی چینە تەنکەکانی شانەی لەش، تا باشتر چاودێری بکرێت، هەروەها ڕەنگ کردنی تا شێوەی شانەکان ڕوونتربن، وەکو ناوک وئەو تەنانەی لە سایتۆپلازمدا مەلەیان دەکرد، هەرچەندە ڤیرچۆ لایەنگری ئەزموونگەری بوو، بەڵام

٥٢ کۆمەڵێک نەخۆشین بەوە جیادەکرێنەوە پرۆتینی ناسروشتی amyloid لە شانەو ئەندامە جیاوازەکانی جەستە کۆدەکەنەوە کە ڕێگر دەبن لەوەی بە ئەرکەکانی خۆیان هەستن، ئەمەش کاریگەریی لەسەر شێوەو توانای ئەو ئەندامانە دەبێت، تا ئەرکە سروشتییەکانی خۆیان جێبەجێ بکەن وژمارەیەک کێشەی تەندروستی ترسناک بۆ نەخۆش دروست دەکەن.

پاسـۆلۆجیای ئەزمونگەری تـا قۆناغێـک دوای ژیـانی خـۆی، کـــارا نەبـــوو. هاوکـــات لەگەڵ هـــاتنی زانســـتی بەکتریـــادا. هەرچەنــدە ڤیرچــۆ گرنگیـــی بەو بـــوارەدا، بەلاّم دڵســـۆزانە پشتگیریی تیۆری میکرۆبیی نەکرد.

### میکرۆب: باوەڕی نوێ

لە پەرســتگای پزیشــکیدا، کەم پیــاوی پیــرۆز هەیە وەکو لـویس پاســتێر[53](١٨٢٢-١٨٩٥) شــکۆمەند بێـت. ئەو نەک هەر پزیشـکێکی لێهـاتوو بـوو، بەڵـکو لە بـواری فیزیـا وکیمیاشـدا ڕاهێنانی کردبوو، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە زانست گرنگییەکی زۆری لە بـــواری پزیشـــکیدا هەبـــووە. لەبەرئەوەی زۆربەی کاتەکانی لە تاقیگەدا بەسەر دەبرد، نەدەپەرژایە ســەر ئەوەی لە تەنیشت قەرەوێڵەی نەخۆشــەوە بووەسـتێ لە دوا قۆنـاغی ژیانیدا نەبێت، تا ئەو چاودێریی پزیشکانە بکات کە ڤاکسـینی هارییان لێدەدا، ئەوەش پێکەی تاقیگەمـان پێ نیشـان دەدات لە وێناکردنی پزیشکیی نوێدا.

بەشــێوەیەکی ئاســـایی وا تەمـاشـــای تیـۆری میکرۆبـــی نەخـۆشـــی کـراوە وەکـو ئەوەی ســـەرەتایەکی کاریگەربێـت لە پزیشـــکی و پزیشـــکیی مـۆدێرنــدا. هەنـــدێجار مێژوونوســـە ڕیڤیژینیستەکان "ڕاستکەرەوەکان" ئاماژەیان بەوە داوە، ئەو بـــوونەوەرە زۆر وردانەی بـــوونەتە هـــۆی زۆرێـــک لە نەخـۆشـــییەکانی وەکـــو گرانەتـــا، ســـیل، ســـیفیلیس، کـــۆلێرا، مەلاریا، ئاوڵە، ئینفلوەنزا وزۆر نەخـۆشی تـر، چەنـد دەیەیەک لە گفتوگـۆی چـڕوپـڕی خایانـدووە، تـاکو کۆدەنـگ بـوون

---

53Louis Pasteur.

لەسەر سەلماندنی ئەوەی ناوی میکرۆبە. لەگەڵ ئەوەشدا بەگوێرەی لێکدانەوەی ڕیڤیژینستەکان، کاری پزیشکی تا دوای مردنی پاستۆریش بەماوەیەکی زۆر لەمەسەلەی چارەسەرکردندا هێشتا وەکو پێویست نەبووە. لە دیویکی ترەوە، تیۆری نەخۆشییە میکرۆبییەکان باسی ژمارەیەک نەخۆشیی کتوپڕ ونوێ دەکات وەکو نەخۆشیی ڤایرۆسی لەدەستدانی بەرگریی لەش HIV ، تای لاسا[54] ونەخۆشیی لیجینەری لە سییەکان[55]، هەروەها باسی گەشەکردن و بەرفراوانبوونی بەرگری ئەو دەرمانانە دەکات لەنێو ئەو بوونەوەرە زۆر وردانەدا، لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ نەخۆشی درێژخایەنی تر هەن پەیوەندییان بە هەوکردنەوە نییە و لەنێو کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکاندا زۆر بەربڵاون. لەساڵی ١٩٥٠ تۆماس مەکوین[56] (١٩١٢- ١٩٨٨) مامۆستای پزیشکی کۆمەڵایەتی بوو لە زانکۆی بیرمینگهام، ژمارەیەک توێژینەوەی گرنگی بڵاوکردەوە سەبارەت بە کەمبوونەوەی

---

٥٤تای لاسا، بە پێی زانیارییەکانی W.H.O نەخۆشییەکی ڤایرۆسییە دەبێتە هۆی خوێنبەربوونی بەهێز، ماوەی نێوان دوو بۆ ٢١ ڕۆژ بەردەوام دەبێت. لەڕێگەی خۆراکی ماڵەوە کە میزو پیسایی مێرووەکانی بەرکەوتووە بڵاودەبێتەوە، ڕەنگە لە یەکێکەوە بۆ ئەویدی بگوێزرێتەوە، ئەم تایە زیاتر لە گانا وکینیا و لایبریا ومالی و سیرالیۆن و نایجیریا و وڵاتانی ڕۆژئاوای ئەفەریقیا بڵاودەبێتەوە، ڕێژەی گشتیی مردن بەم نەخۆشییە ١%ە و دۆخی مەترسیدار ١٥ لەسەدە. (و)

٥٥ ئەم نەخۆشییە پێیدەڵێن نەخۆشی لیجیۆنەری Legionnaires بەهۆی بەکتریای لیجیۆنێلا legionella وە مرۆڤ تووشی نەخۆشی دەکات کاتێ چەند دڵۆپێک ئاو لە قوڕگ دەپەڕێت ، ئەو دڵۆپە ئاوە کە ئەم بەکتریایەی تێدایە، دەچێتە بۆڕی هەناسەوە، لەوێوە بۆسییەکان و مرۆڤەکە تووشی نەخۆشیی سییەکان دەبێت. (و)

56 Thomas McKeown.

ڕێژەی مردن لە کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکاندا، ئەم پێشکەوتنە دەگەڕێنێتەوە بۆ خۆراکی تەندروست و بەرزبوونەوەی ئاستی بژێوی خەڵک بەشێوەیەکی گشتی، ئەمەش وای کرد تا ماوەیەک پێش ئێستاش، سیستەمی تەندروستی زۆر کەم نەبێ،هاوبەشیی ئەو پێشکەوتنەی نەکرد.

لە چوارچێوەی ئەو خوێندنانەوە بۆ کاری پزیشکی لەسەدەی نۆزدەدا، ئەنجامدرا، ڕەنگە پاستۆر و ڕۆبەرت کوخ[57](١٨٤٣- ١٩١٠) و ژمارەیەکی تری لایەنگرانی مایکرۆبایۆلۆجی، بەکتریۆلۆجی و هاوشێوە تاقیگەییەکانی تر، توانیبێتیان کاری لێکۆڵینەوەی زۆر گرنگ ئەنجام بدەن، بەڵام هەموو ئەم گرنگیدان و توێژینەوانە بەپێی پێویست نەبوون و زیادەڕۆییەکی زۆری تێدابوو سەبارەت بەوەی پەیوەندی بە مەسەلە سەرەکییەکەوە هەبوو ئەویش بابەتی نەخۆشی و نەخۆش و زیادکردنی تەمەن وتێکڕایی تەمەنی پێشبینی کراوە، کەواتە بە سنوورداری چییان بەچی کرد، ئەوەی دۆزییانەوە تا ئەو ڕادەیە گرنگ بوو؟

پاستۆر یەکەم کەس نەبوو بەکتریا و تەنە زیندووە زۆر وردەکان ببینێ، یەکەم کەسیش نەبوو دەربارەی "نەخۆشیی میکرۆبی" قسەبکات، بەڵام ئەو لێکۆڵینەوانەی لە کۆتایی ١٨٥٠ ئەنجامیدان، زۆر لۆجیکی بوو بە لای زانایانەوە، لای کەمێک لە زانستخوازان نەبێ، ئەگینا ئاسان نییە تەواوی پێشەکە وەکو زنجیرەیەک سەرنج وتێبینی و چانس و ڕێکەوت، ببەستیتەوە بە گشتی کاملەوە. لە لێکدانەوەی کریستالسازیدا گرنگی زۆریدا، بە تەنە زیندووە زۆر

---

57 Robert Koch.

وردەکان micro-organism ، وسەلماندی بلووری ترشی تارتاریـــک (کە بەرهەمێکـــی لاوەکیـــیە لە پیشەســـازیی پێستەخۆشەکردندا بەکاردێت) بەشێوازێکی کیمیایی ئاسایی دروستکراوە، لەڕووی بینـاییەوە بـێلایەنە، چونکە ئەو تەنە وردانە لە ئەنجـامی چـالاکیی خۆیانـدا ئەوە بەدەسـتدێنن تیشـکە جەمسـەرگرتووەکان پەرتـوبڵاو بـکەنەوە؛ لەمەوە باوەڕی بەوە هێنا تەنە میکرۆبیە وردەکان خاوەن توانـایەکی تـایبەتن، لەمەوە گەیشتە ئەو بـاوەڕەی کرداری ترشـاندن و ئەوانیـدی، لەڕێـگەی ئەو تەنە بەکترییـانەوە شـێوازێکی گونجـاوەو گرنگییەکـی پیشەسـازی هەیە لە نـان کـردن و دروســتکردنی بیــرە و کـــاری ترشـــاندندا. ئەزمـــوونە بەناوبانگەکەی لە زۆربوونی خۆبەخۆدا لە سـەرەتای ساڵی ١٨٦٠ ەوە، چەنـد سـاڵێکی خایانـد، و کـاریگەرییەکی تـایبەتی لەسـەر دەرچـوونی کتێـبەکەی داروین هەبـوو بە نـاوی "ڕەگەزی جۆرەکـــان"لە ١٨٥٩. ئەو کەمـــۆلانەی پاســـتۆر بەکاری دەهێنان ملەکانیان هاوشێوەی ملی قاز بوون، تـاکو دوای کولاندنی گیراوەکان بە مەبەستی پاکژبوونەوە، تۆزو هەوای پیس نەگاتە نێو ئەو کەمۆلانە. ئەم کردارانە وێنەی کـاریگەرن لە خەیاڵدانی ئێمەدا.ئەو ئەزموونـانە سـەلماندیان بوونەوەرە وردەکان لە خۆوە دروست نـابن، لە سـیمینارێکی گشـتیدا لە دیبەیتـی نێوان خـۆی و یەکێ لەهاوڕێیەکیدا ئەو سەرکەوت، کاتێک زیاد لە جارێک هـاوڕێکەی ئەزموونەکەی پاسـتۆری دووبـارە کـردەوە، بینـی شـلەکە پـڕی لە تەنـی زینـدووی وردە. بە لێکدانەوەی ئەو بیرەوەرییـانەی پاسـتۆر لە تـــاقیگەکەی خـــۆی نووســـیبوونییەوە هەنـــدێجار

تاقیکردنەوەکـانی شکسـتیان هێنـاوە (واتە لەو کەمـۆڵانەی تەنـــی بەکتیرییـــان تێـــدا بـــووە)، بەڵام هەنـــدێجار ئەو دەرەنجامانەی بە ئارامی خستۆتە لاوە؛ لەسـەر بەکتریـای کا کـاری کـردووە (کە هاوشـێوەی فـاکتەری تووشـبوون بە نەخۆشـی ئەنتراکسـە) سـپۆر یـان تـۆوی ئەو بەکتریـایە بەرگەی گەرمی گرتووە، ڕەنگە مرۆڤ پێشبینیی دەرەنجامە "نەرێنی"یەکـانی ئەزمـونەکەی پاسـتۆری کردبـێ، بەڵام بە شاردنەوەی ئەو دەرەنجامانە پاستۆر بەسەر ڕکابەرەکانیدا زاڵبـوو، هەمیشـە ئامـادەییەکی سـەیری ئەوتـۆی هەبـوو تـا هەردەم بەسـەر پشـتی ئەسـپی بـراوەوە بێـت، وسـووربێت لەسەر هەڵوێستی خۆی.

هاوشانی ئەزمونی زۆربوونی خۆبەخۆ، پاستۆر چالاکانە لە بابەتی ڕۆڵی ترشاندنەکان وتەنە زۆر وردەکانی تر کاری کرد، بەوپێیەی ئەو تەنە وردە زیندووانە هۆکاری پرۆسـەی ترشـاندنن لە: بیـرە، شـەراب، سـەرچاوە شـیرەمەنییەکانی وەکـو ترشـاندنی ماسـت. شـوان و زانـا ئەڵمانییەکـانی تـر لەوەدا کورتیـان کـردەوە، ئەو کـارلێکە گـرنگە ڕۆژانەیە، کارلێکی کیمیایی ڕووتە، بەڵام پاسـتۆر سـوور بوو لەسـەر ئەوەی ئەو کارلێکانە پێویستیان بە تەنی مایکرۆیی زیندووە تا بگەنە ئەنجام، ئەمانە پرۆسـەی کارلێکی زیندوون. زانیاری پراکتیکی گرنگی بۆ ئەوانەی بیرەو شـەراب دروستدەکەن پێشـکەش کـرد، جـگە لەوەی کـرداری کوڵانـدنی شـیری "پاستیۆریزە" وەکو بنەمایەک بۆ خاوێنکردنەوە لە ڤایرۆس و مادە زیانبەخشەکان تا ترشاندنی دوابخات، پێشکەشکرد.

لە دەوروبەری ساڵی ١٨٧٠ ناوبانگی گەیشتە ئاستێک حکومەتی فەرەنسی داوای لێبکات، بەڕوونی لە تەشەنەکردنی ئەو نەخۆشییە بکۆڵێتەوە کە تووشی کرمی ئاوریشم بووە، و هەڕەشە لە پیشەسازی ئاوریشم دەکات. خێزانەکەی لەگەڵ خۆی برد و لەکارکردن بەشداری کردن، بۆی دەرکەوت دوو بوونەوەری زۆر ورد بەرپرسن لەو نەخۆشییە، ئینجا ڕوونی کردەوە چۆن ڕێگری دەکات لەو زیانانە. دوای ئەم کارە گفتوگۆکانی سەبارەت بە "تیۆری نەخۆشی میکرۆبی" زیادیان کرد، زیاتر خۆی سەرقاڵ کرد بە توانای بەکتریاوە وەکو هۆکاری نەخۆشی. لەو جیهانەی کە هیچ ئامادەکارییەکی پزیشکیی تێدا نەبوو، دەستی بۆ نەخۆشییەک برد کە هاوبەش بوو لە نێوان مرۆڤ و گیانەوەراندا؛ ئەویش نەخۆشییەکی نائاسایی بوو کە ئەنتراکس بوو، پێچەوانەی تەشەنەکردنی زۆربەی بەکتریاکان، کاتێ مرۆڤ یان گیانەوەران تووشی نەخۆشییەکە دەبوون، بەکتریای نەخۆشییەکە زۆر بە ڕوونی لە ناو خوێنی سەر سلایدی میکرۆسکۆپ (لەکە یان پەڵەی خوێن) ەکە دەبینرا. ئیتر ئەوە پشتڕاست کرایەوە کە هۆکاری ئەو نەخۆشییە هاوبەشە ئەو بەکتریایەیە، خۆی و "هەندێ لە ڕکابەرەکانی" بەدوای دەرچەیەک دا دەگەڕان بتوانن ئەو بەکتریایە "لاواز" بکەن، دەرکەوت بەهێزبوونی بەرگری لەش هۆکارێکی گرنگە بۆ دوورخستنەوەی نەخۆشییەکە، ئەوەی بەخەیاڵی پاستۆردا هات، ڤاکسینێکی قایلکەر بوو دژی ئەنتراکس، ئەمە بڕیارێکی بوێرانەبوو (پاستۆر لە بلاوکردنەوەی بیروبۆچوونەکانیدا کارامەبوو،

ڕەنـگە یەکەم زانـای گەورە بوو‌بێـت، بتوانێـت بـۆ میـدیا بــدوێت)؛ لە کــاتی کوتــانی ئــاژەڵی کێڵگەکانــدا داوای لەڕۆژنامەنووسان کرد ئامادەی بینینی ئەو ڤاکسینە بن کە خـۆی دایهێنـاوە، ئینجـا ئاژەڵەکـانی بەو میکـرۆبە زینـدووە شــەڕەنگێزەی ئەنتــراکس کووتــا. دەرەنجـامی ڕاگەیەنــراو ئەوەبـــوو، زۆربەی ئەو ئـــاژەڵانەی نەکووترابــــوون، مرداربوونەوە، هەواڵی ئەم کووتانە دڵخۆشکەرەیە بە هەموو دونیـادا بڵاوبـووەوە. دوای ئەنتـراکس، تیشـک خـرایە سـەر ژیـانی پاســتۆر خــۆی، ئەو ئامــادە بــوو دوا دۆزیــنەوەی گەورەی خۆی ئاشکرا بکات ئەویش چارەسەری نەخۆشی هــاری بــوو، بەڕێژەیــی نەخۆشــییەکی دەگـمەن بــوو، بەڵام دەبـووە هـۆی مردنێکـی ترسـناک، تەنـانەت تـرس و لەرزی دەخستە دڵی خەڵکەوە. پاستۆر ناچار بوو کوێرانە کاربکات لەسـەر نەخۆشـی هـاربوون، چـونکە (ئەوەی ئێسـتا لەسـەر نەخۆشـــی هـــاری دەیـــزانین ئەودەمە نەزانراوبـــوو)، کە نەخۆشــییەکی ڤایرۆســییە، ڤــایرۆس بــوونەوەرێکی تەواو وردە، کاتێ پاستۆر ناسراو نەبوو جگە لە ڤایرۆسی هـاری. نەخۆشییەکانی وەکو ئاوڵە، زەردەتا، سووریژە، ئینفلوەنزا و چەنـد کـۆمەڵە نەخۆشــییەکی تــریش، ڤایرۆســی بــوون، لەڕاستیدا بوونیان ڕاگەیەندرابوو، وشـەی "ڤایرۆس" بەواتا گشتییەکەی دەمێک بوو بەکار دەهات، بەوپێیەی "ژەهـرە" و دەبێـــتە هـــۆی نەخۆشـــی، بەڵام مانـــا بـــایۆلۆجییە ســـنووردارەکەی بـــۆ ســـەرەتاکانی ســـەدەی بیســـتەم دەگەڕێتەوە، بەوەی "ڤایرۆسێکە توانـای پاڵاوتنی هەیە" واتە بریکــارێکی زۆر وردە لەو فیلــتەرانەوە ڕەت دەبێــت کە

دەبوایە بەکتریا و هۆکارە بایۆلۆجییەکانی تر ئەو فیلتەرانە گلی بدەنەوە. شێوازی کەڵچەری شانە و میکرۆسکۆپە ئەلیکترۆنییەکان، لە کۆتاییدا ڤایرۆسەکانی ناساند و تەنانەت پۆلێنی کردن.

بە رای پاستۆر رەفتارکردن لەگەڵ ڤایرۆسی سەگی هار واتە رەفتارکردن لەگەڵ یاریدەدەری ڤایرۆسەکە کە نەیزانی چۆن پەیدا دەبێت. لەجیاتی ئەوە دەرکی بەوەکرد نیشانە ترسناکەکانی هاری بەڵگەی ئەوەیە جۆرە ڤایرۆسێک دەبێتە هۆی نەخۆشی لە سیستەمی دەمارەکاندا، بەڵام لە کەروێشکدا ئەو ڤایرۆسە، لە درکە پەتکی برِبرِەی پشت دەدات. لە میانەی تێپەڕبوونی مادەی زیانبەخش بەشێوەی زنجیرەیی لە ناو ئەندامەکانی لەشدا، برِی ئەو مادەیە برِیار لەسەر ترسناکی ئەو "ژەهر" ی هارییە دەدات کە دەڕژێتە لەشەوە، ئەو زەمەنە نادیارەی کەوتۆتە نێوان کاتی گازی سەگەکە (یان هەر گیانەوەرێکی تر) و دەرکەوتنی نیشانەی هاری لە قوربانییەکەدا کەم تا زۆر، مانای ئەوەیە لەو زەمەنەدا بەرگری جەستە دژی نەخۆشییەکە لەو کەسەی گیانەوەرەکە گازی لێگرتووە دەکەوێتە کار. لێرەدا هەندێ مەسەلە هەن ناتوانیت بەسەریدا زاڵ بیت، بۆ نموونە کاتێک لە کۆمپانیایەک داوای کۆمەک دەکەیت بۆ سەرخستنی پرۆژەیەک، تا دەگاتە ئامانج، لەیەکەم هەنگاودا کۆسپ دێتە رێی، بەڵام تەواوی پرۆژەکەی پاستۆر سەبارەت بە ڤایرۆسی هاریی سەگ کە خۆی و هاورێکانی لێیەوە فێربوون، تەنها لەسەر یەک کەسی تووشبوو تاقیکرایەوە، یۆنانییەکان بەمە دەڵێن فیزو لەخۆبایبوون، پێچەوانەی قارەمانە کلۆڵەکانی گریک، پاستۆر ئەو تاقیکردنەوەیەی

لەچارەسەری هاری، کردە چەکی دەستی و لە ئەستێرە گەشەی زانستەوە بوو بە پیاوی پیرۆزی زانست. ئەو کەسەی بەخت یاوەری بوو و کەوتەبەر چارەسەرەکەی پاستۆر ولەو نەخۆشییە ڕزگاری بوو وەکو یەکەم کەس، جۆزیف مایستەر بوو، دوای ئەو نەخۆشی تریش بەخێرایی چارەسەر کران. چارەسەری هاریی سەگ، نێوبانگێکی نێودەوڵەتی گەورەی پەیداکرد، لە هەموو ئەوروپاوە نەخۆشیان دەهێنا بۆ پاریس بۆ چارەسەر بە کۆرسێک لە دەرزی کووتان (ئەو سەردەمە سەردەمێکی زێڕین بوو). خەڵکانێکی زۆر قایلبوون بەوەی توێژینەوەی زانستی شایستەی ستایش کردنە، بە پوولی گیرفانییان لە بەرژەوەندیی پاستۆر دەنگیاندا، لەڕێگەی کۆمەکی جەماوەرەوە لە پاریس بوودجەی پەیمانگای پاستۆر دابینکرا، کە لەنێو حەشاماتێکی زۆرەوە ساڵی ١٨٨٨ ئەو پەیمانگەیە کرایەوە وبەدوایدا زۆر پەیمانگەی تر، لەناوچەی ژێر دەسەڵاتی فەرەنساو دەرەوەی دەسەڵاتی فەرەنسەدا کرایەوە. زۆربەی ئەو پەیمانگە پاستۆرییە پاشکۆیانە هەر لە بنەڕەتەوە تەرخان کرابوون بۆ دروستکردنی ڤاکسین وبەرهەمە بایۆلۆجییەکانی تر، بنکەی سەرەکی دروستکردنی ڤاکسینەکان لە پاریس بوو، بەڵام ئامانجی سەرەکیی ئەوسا وئێستاش، لێکۆڵینەوەی پزیشکی بوو. پاستۆر لە دوا حەوت ساڵی تەمەنی ژیانیدا لەو پەیمانگەیەدا وەکو سەرۆکی پەیمانگا ژیانی بەسەربرد کە بەناوی خۆیەوە ناونرابوو.

ڕۆبەرت کوخیش سەرۆکی دوو پەیمانگە بووە، بوودجەی تەرخانکراو بۆ دروستکردنی ئەو پەیمانگایانە حکومەتی ئەڵمانی دابینی کردووە، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە

بۆچوونی جیاواز بەرامبەر توێژینەوە زانستییەکان هەبووە، لەنێوان ئەڵمانیاو ولاتانی تردا. پەیوەندی نێوان ئەڵمانیاو فەرەنسا دوای شکستی فەرەنسا بە دەستی بسمارک لەشەڕی پروسیا (١٨٧٠- ١٨٨١)، پەیوەندییەکی زۆر ساردبوو. دەبوایە زانست بابەتییانەو مۆرکی نێونەتەوەیی لە خۆ گرتبا و کۆسپەکانی، نەتەوەپەرستی، ئاینی، و جێندەرییەکانی تێپەڕاندایە. بەڵام مەسەلەکە بەو شێوەیە نەبوو، لەڕاستیدا کوخ وپاستۆر، لە کاری پیشەیی وکەسێتییاندا ڕق وکینەی نەتەوەپەرستانە دژی یەکتری بەسەریاندا زاڵبوو؛ پاستۆر دوای شەڕی فەرەنسی- پرووسی، ئەو نیشانەی ڕێزلێنانەی لەلایەن ویلایەتەکانی ئەڵمانیاوە پێیبەخشرا ڕەتیکردەوە، ڕازی نەبوو بیرەی ئەڵمانی بخواتەوە، کوخیش بەرامبەر داهێنانە فەرەنسییەکان سەبارەت بە زانستی بەکتریۆلۆجی وزانستی بەرگری لەش هەڵەی زۆری کرد. یەکتر بینینەکانیشیان لە کۆنگرە جیهانییەکان مۆرکێکی فەرمی وەردەگرت و بەدەر نەبوو لە ساردوسڕی. لەسەرەتای سەرهەڵدانی زانستی بەکتریادا چەند دەسکەوتێکی زانستیی پێویست هەبوو هەردوو لایەن لەسەری هاوڕا بوون، بەڵام هەریەکەیان ستایلێکی جیاوازی لەویدی هەبوو، پاستۆر پێی باش بوو ئەو بوونەوەرە زۆر وردانە لە کەمۆڵەدا بچێنێ، بەردەوام ئەو سووپە خۆراکییەی دەگۆڕی کە ئەو بوونەوەرانە لەسەری دەژیان. هەندێ لە لێکۆڵینەوە تایبەتەکانی بۆ خۆی وهاوڕێکانی دەپاراست، بەڵام کوخ کە نەوەیەک لەو گەنجتر بوو، لەڕووی تەکنیکییەوە زۆر وردبوو. تەکنیکی وردی فۆتۆگرافی

لەکارەکانیدا بەکاردەهێنا بە مەبەستی پێشخستنی ئەو داتا بابەتییانەی پێشکەشی جیهانی دەکرد. بەکتریاکانی لەسەر قەوزەی ئاگـار-ئاگـار دەچاند، کە ناوەنـدێکی ڕەقە، ئەو کێشانەی بەهۆی پیسبوونەوە دەردەکەون تا نزمترین ئاست کەم دەکاتەوە، یەکەم کەس بوو کەرەستەی پاکژکردنەوەی بەکارهێنا، یەکێ لە خوێندکارەکانی بەناوی پێتری سینییەکی پێشکەشـکرد کە نـاوی ئەوی لەسـەر هەڵکۆڵرابـوو. کـوخ پسپۆری بەکتریـای پزیشکی بوو، بەڵام پاسـتۆر پسپۆری زیندەزانی بوو، لە جیهانی تەنە مایکرۆبییەکاندا ئەفسانە بوو. پاسـتۆر لەسـەرکەوتنێکەوە بـۆ سـەرکەوتنێکی تـر لە پێشـکەوتندا بـوو، تەمەن ڕێگـر نەبـوو لە داهێنانەکانیـدا، لە کاتێکـدا کـوخ تەنهـا لە دوو دەیەی ژیانیـدا، دەسـتکەوتی زانسـتی هەبـوو، کـاتێ چـووە تەمەنەوە، شـکۆی زانسـتی گەنجێتیی بۆ نەگەڕایەوە.

یەکێک لەو کـارە گرنگـانەی کـوخ ئەنجامیـدا، ئەنتـراکس بوو، دوای کۆتایی هاتنی جەنگی فەرەنسا-پرووسیا یەکسەر بووە پزیشکی گشتی. ئاشکراکردنی سووڕی ژیـانی بەکتریا ئاڵۆزەکان کە لەشێوەی تۆو دایە و سـاڵانێکی زۆر لە خاکدا بە شاراوەیی دەمێننەوە، بۆ ئەو دەگەڕێتەوە. توێژینەوەکانی کوخ یەکێ لە مامۆستا کۆنەکانی سەرسام دەکات، ئەمەش ئاسانکاری دەکات لەوەی ئەو مامۆستایە بە بێ زیادڕەوی پاڵپشتیی کارەکانی داهاتووی بکات، دەرەنجامی سـەرەتایی کارەکـانی سەرسـووڕهێنەر بـوون؛ کە خـۆی لەو داهێنـانە هونەرییـانەدا دەبینییەوە، کەپێشـتر باسـکران، وەکـو ڕۆڵـی بەکتریـا لە هەوکردنـی برینەکـان، لە هەمـوو کارەکـانی

شـاهانەتر لەسـەدەی نـۆزدەدا ئەو دوو فـاکتەرە بـوون کە بـوونە هـۆی دۆزیـنەوەی نەخۆشـییەکانی سـیل لە (١٨٨٢) هەروەهـا ئەو پەتـایەی کە جیهـانی لە (١٨٨٤) خسـتە دڵەڕاوکێوە ئەویش نەخۆشـی پەتـای کۆلێرا بوو. ئەم دوو دۆزیـنەوەیە دوو دەسـتکەوتی هـونەری زۆر گەورە بـوون لەمێژووی مرۆڤایەتیدا. میکرۆبی سیل، سەختگیرە لە چاندنا، گەشـەی لەسـەرخۆیە، بـۆیەکردنی زەحـمەتە، لە کێشـە بەکتریۆلۆجییەکانـدا، کاندیـدێکی نـاڕوونە لە فـاکتەرە بـوونگەرایی و ژینگەیـیە جیاوازو -بەرفراوانەکانـدا زۆربەی سەرچاوەکان بە نەخۆشی درێژخایەن ناوی دەبەن.

کوخ کارەکەی لەمەڕ کۆلێرا لەهیند تۆمـارکرد، دوای ئەوە تیمێکی فەرەنسـی و ئەویتـر ئەڵمـانی لە سـاڵی ١٨٨٣ بەرەو میسر گەشتیان کرد، بەمەبەسـتی پشکنینی نەخۆشـی کۆلێرا لەوێ. ئەنجـامی هەڵـمەتەکەی فەرەنسـا کارەسـاتی بەدوای خۆیدا هێنـا، چونکە گەنجێکی جێگەی ئومێد لە تیمەکەدا کە خوێندکاری پاستۆر بوو گیـانی بەخشـی، ئەندامانی تـیمەکە گەڕانەوە بێئەوەی هـیچ ئەنجـامێکی ئەرێنـی بەدەسـت بێنن. بەڵام کـوخ وتـیمەکەی گەیشـتنە ئەوەی ئەو بـونەوەرەی بەرپرسـە لە نەخۆشـی کۆلێرا لە میسـر دۆزراوەتەوە، بەڵام ناسـینەوەی هەر تەنێکـی تـایبەت لە کۆئەنـدامی هەرسـدا کـارێکی سـەختە، چـونکە لەگەدەو ڕیخـۆڵەدا بەکتریـای زۆر هەیە، ئینجا کوخ گەڕایەوە بۆ هیند، چونکە شوێنی ئاسـایی بڵاوبوونەوەی نەخۆشـییەکەیە، لەوێ ئەو تەنانەی ناسـییەوە کە لەشـێوەی کۆمـای ئینگلیزیـدا بـوون، لە هەردوو سەرچاوەی ئاوی خواردن و پاشەڕۆی قوربانییەکانی پەتای

کۆلێرادا هەن. لەبەرئەوەی باوەڕ وابوو سەرچاوەی کۆلێرا پیسیی مرۆڤ و ئاوی پیس و بەرزبوونەوەی ئاستی ئاوی جۆگەکانە، بۆیە بۆچوونەکەی کوخ لە ناسینەوەی ئەو تەنە بەرپرسەی کە هۆکاری نەخۆشییەکەیە، زۆر درەنگ باوەڕی پێهێنرا. پسپۆری تەندروستی گشتی ئەڵمانی ماکس ڤۆن پێتینکۆفەر [58] (١٨١٨- ١٩٠١) خاوەن تیۆرییەکی تایبەت بە خۆی بوو باوەڕی وابوو کارلێکی پێویست لەنێوان چەند فاکتەرێکی یاریدەدەر، بۆ نەخۆشی کۆلێرا هەیە، کە "میکرۆب" ی نەخۆشییەکە تەنها یەکێکیانە. ماکس ڤۆن لە دەست پێشخەرییەکی کەم وێنەدا بەئاشکرا کەمۆڵەیەک لەو کەمۆلانەی میکرۆبەکانی کوخی تیا هەڵگیرابوو، هەڵقوڕاند، جگە لە سکچوونێکی کەم هیچ نیشانەیەکی تری تیا بەدەر نەکەوت، بەشێوەی کامڵ تووشی کۆلێرا نەبوو. لە دیبەیتە فێرکارییەکاندا لە ساڵی ١٨٩٠ هێشتا عەیبو عاری، تیۆرەکانی میکرۆبی کوخ لە ناوەندە زانستییەکاندا مشتومڕی زۆری لەسەربوو. تا ڕادەیەک کاریگەری ڤاکسینی کۆلێرا کە لە هیند لەلایەن بەکتریۆلۆجی ڕوسی ڤلادیمێر هافکین[59](١٨٦٠- ١٩٣٠)ەوە ئامادەکرا، هاوبەشی لە گۆڕینی ڕەوتی ڕووداوەکان کرد. هەروەها دەرکەوت ئەم میکرۆبە لەڕێگەی دەم و پیسییەوە وەلامێکە بۆ تەشەنەکردنی زۆربەی نەخۆشییە درمییەکان.

---

58 Max Von Pettenkofer.

59 Waldemar Haffkine.



وێنەی (١٩) لویس پاستۆر یەکێکە لەو زانایانەی زۆرترین دەرکەوتنی لە تابلۆ هونەرییەکان لە سەدەی بیستەمدا هەبووە. ئەم وێنەیە لە گۆڤاری ڤانیتی فێر لە ١٨٨٦ بلاوبۆتەوە. ئەم گۆڤارە زۆر تایبەت بوو، لە ١٨٦٨- ١٩١٤ دەردەچوو، تەنها کەسە ناودارەکانی هەڵدەبژارد. لەم وێنەیەدا پاستۆر دوو کەروێشکی بەدەستەوەیە، ئەو کەروێشکانە گرنگییەکی زۆریان لەو توێژینەوەیەدا هەیە کە دەربارەی هاری بوو.

لە ساڵی ١٨٩٠ ئاراستەی بۆچوونە پزیشکییە زانستییەکان سەبارەت بە تیۆری نەخۆشییە میکرۆبییەکان گۆڕانکاری بەسەردا هات ، زۆربەی گفتوگۆکان لەو بازنەیەدا دەخولانەوە، ئایا میکرۆبێکی دیاریکراو دەبێتە هۆی نەخۆشییەکی دیاریکراو، یان پەیوەندی زانستی بەرگری لەش و تەشەنەکردنی نەخۆشییە پاسۆلۆجی-

فسیۆلۆجییەکان بە سروشتی بەکتریا ژاراوییەکانەوە چییە؟ پرەنسیپی تیۆری نەخۆشییە میکرۆبییەکان خرایە سەرچاوە پزیشـــکییەکانەوە، زۆربەی خوێنـــدکارانی پزیشـــکی لە پرۆگرامی خوێندنی بڕیار لێدراودا دەیانخوێند، بەڵام هەندێ لە پیـاوانی پزیشـکی هێشـتا ئەو کۆرسـانە ڕەتـدەکەنەوە، هەندێکیان باوەڕیـان وابـوو بەکتریـا پەیوەندیی بە بەشێکی نەخۆشییە تەشەنە کردووەکانەوە هەیە، بەڵام مەرج نییە بەو شـێوەیە لێـک بـدرێتەوە کە بەکتریـا هۆکـاری سـەرەکیی نەخۆشـییە. پێـوەری زێـڕین لە هۆکـاری نەخۆشـییەکە لە تیۆرەکـانی کوخـدا بە شـاراوەیی ئامـاژەی پێـدراوە، بەو ئاشـکراییە نەیخسـتۆتە ڕوو کە شـاگردەکەی فریـدریک لـوفلەر[60] (١٨٥٢- ١٩١٥) دەربـارەی دەردەکۆپـان نووسیویەتی:

ئەگەر دەردەکۆپـان ئەو نەخۆشـییە بێـت بەهـۆی بـوونەوەرە مایکرۆبییەکـانەوە بڵاودەبێـتەوە، ئەوا سـێ ئەگەرمان لەبەردەمە ، لێکۆڵینەوە لەو سێ ئەگەرە پێویستە بـۆ ئاشـکراکردنی تەواوەتـی سروشـتی مشـەخۆرانەی نەخۆشییەکە.

ئەگەر دەردەکۆپان نەخۆشییەک بێت بەهۆی زیندە تەنە مایکرۆبییەکانەوە تووشی مرۆڤ بێت، ئەوا دەبێ سێ ئەگەر لە بەرچـاو بگیرێـت تـا لێیـان بکـۆڵرێتەوە، لێکـۆڵینەوە لەو ئەگەرانە بـۆ ئاشـکرابوونی سروشـتی مشـەخۆریی نەخۆشییەکە، کارێکی پێویستە:

60 Friedrich Loffler.

١-پێویستە بوونی ئەو تەنە زیندووە (میکرۆب) وردانە بەشێوەیەکی هەمیشەیی لە فۆرم و ڕێکخستنێکی تایبەت لە شانەکانی مرۆڤە تووشبووکەدا بسەلمێنرێت.

٢-پێویستە ئەو تەنە زیندووە کە لە جووڵەیدا دیارە بەرپرسە لە نەخۆشییەکە، لە ناوەندێکی پاکژدا بچێنرێت وگەشەی پێبدرێت.



وێنەی (٢٠) ڕۆبەرت کوخ لەگەڵ میکرۆسکۆپەکەیدا وێنەی زۆری هەیە، لەم وێنەیەدا لە خوارووی ئەفەریقایە، لەشێوەی زانایەکی تێکۆشەر لە تاقیگەکەیدا دەردەکەوێ، کەرەستەی بەکارهێنانی بەکتریۆلۆجی زۆری لەبەردەستە، وەکو کەمۆڵەو دەفری پێتری هەر شوێنێ زانستی ڕۆژئاوایی کاری تیا کردبێت بە تاقیگە دانراوە.

٣- پێویسته لەو ناوەندە پاكژەدا بە تاقیكردنەوە بسەلمێنرێت ئەو تەنە زیندووە هۆكاری نەخۆشییەكەیە.

بەڵام لە زۆر نەخۆشیدا ئەو پێوەرە زێرینە ساخكردنەوەی زەحمەتە، چەندە پسپۆرە بەكتریۆلۆجییەكان و ئەوانەی لە بواری سیستەمی بەرگری لەشدا كاردەكەن زانیاری تەواویان لە زانستی نەخۆشی و جەستەیی لە بەرامبەر پەتایەكدا هەبێ، ئەوەندە هۆكارە نادیارەكانی تەواوی پرۆسەكە لایان ئاشكرا وڕوون دەبێت. زۆر ئاسانە بەكتریا لە شوێنێكی جەستەی كەسێك جێگیر بێت، وەكو پێست، گەدە، گەروو یان شلەكانی لەش بەڵام نیشانەی هیچ نەخۆشییەكی تیا دەرنەكەوێ، لەكاتێكدا زۆربەی ئەو بەكتریایانە هاوتای ئەو بەكتریایانەن كەسانی تریان نەخۆش خستووە. دەكرێ ئەوانەی گومانیان لەتەواوی پرۆسەكە هەیە، ئاماژە بەو ڕاستییە بكەن، دەكرێت ئەوانەی گومانیان لەتەواوی پرۆسەكە هەیە، ئاماژە بەو ڕاستییە بكەن، زۆرێك لە بەكتریاكان كە پزیشكێك بە هۆكاری نەخۆشیی دەزانێت، پزیشكێكی تر هەمان بەكتریا بە هۆكاری ئەو نەخۆشییە نەزانێت، ئەوانەی بەكتریایان بە هۆكاری هەندێ نەخۆشی زانی، بەڵام دواتر پەشیمان بوونەوە لەوەی بەكتریا هۆكاری ئەو نەخۆشییانەبێت، بەڵكو بەچەند هۆكارێكی تریانەوە بەست. كوخ خۆشی زۆر گرنگیی بەو كەسەدا كە هەڵگری نەخۆشییەكەیە وەكو گرانەتاكەی ماری، بەڵام میكرۆبی هەمان نەخۆشی لە كەسێكی تردا لە كەماڵی تەندروستیدا ژیانی بەسەر دەبرد، لە بەدواداچوون بۆ هەندێ سووڕی نەخۆشی، كێشەكە زۆر گەورە كرایەوە چونكە هەندێ كەس

لەوانەی تووشـــی نەخۆشـــییەکە بـــوون زوو خۆیـــان دابەدەستەوە، بەڵام کەسانی تر هاوشێوەی خۆیان هەڵگری نەخۆشـــییەکە بـــوون، سپوســـاخ بـــوون، تووشـــی هـــیچ نەخۆشییەک نەبوون. نەخۆشییە ڤایرۆسییەکانیش هەمان ڕێچکەی نەخۆشییە "میکرۆب"ییەکانیان گرت، بەڵام هۆکاری یاریـدەدەر لەو نەخۆشـــییانەدا شـــاراوەبوون. هەنـدێ لەو نەخۆشـــییانەی ســـوور بـــووین لەســـەر ئەوەی ڤایرۆســـین، پێشـــتر وایـــان پێشـــنیار کردبـــوو "بەکتریـــا" فـــاکتەری یاریدەدەری ئەو نەخۆشییەیە، زۆربەی مەسەلەکان لە بابی متمانەوە باوەڕیان پێدەکرا، نەک بوونی بەڵگەوە.

## میکرۆب و پزیشکی و نەشتەرگەری

ئەو نـــاکۆکی و بەزم و هەرایەی بە نـــاوی زانســـتەوە ئەنجـــام دەدرێـــت، لەبەردوو هـــۆی تیـــۆری و دوو هـــۆی پراکتیکـــی، متمـــانە خـــۆی بەحەق دەزانێـــت. هیچکـــام لە تیۆرییەکان بە تەواوی تازە نین، بەڵام بەگشتی هەردووکیان دوای دەرکەوتنـی تیـۆری نەخۆشـیی میکرۆبـی، بەتەواوی ناسـران و هەسـتیان پێکـرا. هـۆی یەکەم لە دابڕانـی نێـوان هۆکـاری نەخۆشـییەکەو جەسـتەی نەخۆشـەکەدایە. میکـرۆب فاکتەری دەرەکییە، لەگەڵ کاردانەوەی تـاک بۆ ئەو فـاکتەرە، پێویســـتە لەو ڕووداوانەش تێـــبگەین کە لە جەســـتەدا ڕوو دەدەن، بەڵام پێویستە بەدوای ئەو هۆکـارەدا بگەڕێین کە لە دەرەوەوە هاتووە. نەخۆشی ئەو شتەیە لە کەسـی نەخۆشـدا ڕوودەدات، بەڵام ئـێمە وا ڕاهـاتووین هەمیشـە سەرزەنشـتی

نەخۆشییەکە دەکەین، کولتووری سەرزەنشتی نەخۆشییەکە نەرەویوەتەوە (بەتایبەتی ئەو نەخۆشییانەی بە ستایلی ژیان ناسراون وەکو پەیوەندی سێکسی، هێشتا بەهێزە)، ئەو بۆشاییەی لەنێوان نەخۆش و هۆکاری نەخۆشییەکەدا دروستبووە، ڕێخۆشکەر بوو بۆئەوەی پزیشکەکان بتوانن لە مەسەلەی دۆزینەوەی نەخۆشییەکەدا، پێوەرە بابەتییەکان بخولقێنن.

چەمکی تیۆریی دووەمی نەخۆشییە میکرۆبییەکان زیادبوونی بیرۆکەی تایبەتمەندیی نەخۆشییەکەیە، لە سەرەتادا تەندروستی گشتی وەکو بزووتنەوەیەک لەگەڵ زۆربەی نەخۆشییە درمییەکاندا وەکو یەکەیەک ڕەفتاری کردووە، کە دەتوانن تایبەتمەندییەکانی خۆی بگۆڕێت لەکاتی تەشەنەکردنی نەخۆشییەکە لەناو کۆمەڵگەدا، "نەخۆشییە پیسەکان" لای ئیدوین چادویک لە دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکەدا، تەنها یەک دیوی هەبوو، ئیتر چی لەشێوەی تیفۆس بووایە یان تیفۆئید یان کۆلێرا یان سووربوونەوە، یان سوورەتا، یان هەر نەخۆشییەکی درمی لەو نەخۆشییانەی لە ناوچە شارستانییە قەرەباڵغەکاندا بڵاودەبنەوە، بەڵام میکرۆبەکان وەکو بناغەیەکی بایۆلۆجی هاتن و "جۆرەکانی تا لێهاتنیان" لێک جیاکردەوە بە مەبەستی ناساندنیان، لەدواییدا 'تا' لەژێر نیشانەکانی نەخۆشییەکەدا دانرا، نەک لەگەڵ نەخۆشییەکە خۆیدا. پۆلێنکردنی نەخۆشییەکان بووە مەسەلەیەکی پزیشکی گەورە، دوای ئەوەی تۆمارکردنی ڕێژەی مردن و هۆکارەکانی بوونە مەسەلەیەکی ڕۆتینی لە هەموو وڵاتە

پیشەسازییەکاندا. گرنگیدانی نێودەوڵەتی بە پەتا گەورەکان بە تایبەتی کۆلێرا زیادی کرد بە پێویستیی تۆمارکردنی زیاتری هۆکارەکانی مردن، لە سنووری نیشتمانیدا، گرنگیدان بە پۆلێنکردنی نەخۆشییەکان تەنها بەشێک بوو لەو هەوڵەی دراوە بۆ وردکردنەوەی زیاتری زاراوە زانستی و پزیشکییەکان.

شوێنەواری جێبەجێکردنی تیۆری نەخۆشی میکرۆبی بەرفراوانە، بەڵام لێرەدا دوو شوێنەواری باسدەکەین کە شایستەی ئەوەن تیشکیان بخرێتەسەر، یەکەمیان پاکژکردنەوەی نەشتەرگەرییە، دوای ئەوە پاکڕاگرتنی برینی نەشتەرگەرییە. نوێترین مادەی سڕکەر ئەلکولی ئەسیل و کلۆرۆفۆرم بوو، لە سەرەتای١٨٤٠ ەوە، بەکارهێنانی ئەم دوو مادە سڕکەرە، لە پێشینەی ئەو گۆڕانکارییانە بوو کە نەشتەرگەران بە دەستیان هێنا، دوای ئەوەی کۆنترۆڵکردنی ئازار بووە ڕاستی. گرنگیی بەردەوامی لابوور لە پراکتیکی پزیشکیدا لەوەدایە دۆزینەوەی ئەم دوو مادەیە لەلایەن کۆششی کیمیاگەرانەوە بووە، ئەوی شایانی باسە دۆزینەوەی سڕکەری ئیسەر یەکەم دۆزینەوەی گەورەی ئەمەریکی بوو لە بواری پزیشکیدا، هەرچەندە پڕ بوو لە چیرۆکی ترسناک لە ڕێگەی گفتوگۆو دەمەقاڵێی زانستییەوە، هەروەها دوای ئەو مشتومڕەش کۆمەڵێ هەوڵی شکست خواردوو پێش سەرکەوتنی داهێنانەکان لەکایەدا بووە، ئەمە جگە لەو کۆتاییە ئازاربەخشانەی لە ڕەوتی پیشەیی بەڵێن پێدراودا بەدیدەکرێن. یەکەم نمایشی جەماوەری بۆ ئەنجامدانی کارێکی نەشتەرگەری لەژێر کاریگەریی بەنجی

ئیسەردا لە نەخۆشخانەی ماساچۆستس لە ١٦ ئۆکتۆبەری ١٨٤٦ ئەنجامدرا. زۆر بەخێرایی گەمییەکان هەواڵەکەیان بە ئەوروپادا بڵاوکردەوە، تۆمارە پزیشکییەکان پڕن لەو نەشتەرگەرییە لۆکاڵییە سەرەتاییانەی بەو مادە نوێیەی ئیسەر ئەنجامدراون. ساڵێک دوای ئەوە کلۆرۆفۆرم داهێنراو هەوڵەکان بەردەوام بوون بۆ دۆزینەوەی ئەو مادانەی تر کە کۆنترۆڵی ئازار دەکەن. هیچ داهێنانێکی پزیشکی بێ کێشەو مشتومڕی زۆر بە ئەنجام نەگەیشتووە، سڕکارییش بەدەر نەبووە لەو ناکۆکی و ململانێیە، لە پرۆسەی منداڵبووندا هەندێک ناڕازی بوون لەوەی بەنج بەکار بهێنرێت چونکە ئەو کەسانە باوەڕیان وابوو لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە، پێویستە حەوا بەدەم ئازارەوە منداڵی ببێ، هەندێ لە پزیشکە سەربازییەکان باوەڕیان وابوو پێویستە ئازارەکان بە ئەندازەیەک بووروژێنرێن تا ئازاری کاری نەشتەرگەرییەکە لە چاویدا کەم ئازارتر دەربکەوێت. مردنی چەند کەسێک لە کاری سڕکردندا پزیشکەکانی ڕاچڵەکان لەوەی ئەم مادەیە مەترسیدارە، هەندێجار ئەمجۆرە ڕووداوانە لە مێژووی ئەدەبیشدا ڕەنگیداوەتەوە، بەڵام توانای خێرایی ئەو مادەیە لەکۆنترۆڵکردنی ئازار، لەنێوان نەخۆش و پزیشکان وەکو یەکێک لە دیارترین سیمای سەرەتای مێژوی تەکنیکی سڕکردن بوو. ڕێخۆشکەربوو بۆ نەشتەرگەران تاکو بە ئاسانی کار لە لابردنی شانە تووشبووەکان بکەن یان پارێزگاری لەشانە ساخڵەمەکان بکەن، بەڵام کرانەوەی برینەکان بۆ ماوەیەکی زور دەبووە هۆی ئەوەی برینەکان بەر هەوا بکەون بەوەش ئەگەری

تووشـبوون بە هێرشـی میکـرۆب لە زیادبووندا دەبـوو، لە ئەنجـامی ئەوەشـدا پرۆسـەی سـڕکردن لەچوارچێـوەی نەشتەرگەریدا بۆ نەشتەرگەرەکان فراوانبووەوە، بەڵام مەرج نییە گرەنتی ئەوە بدرێت بە نەخۆش تا بەزیندوێتی دەرفەتی دەرچوونی لەو مەینەتییە هەبێت.

سڕکردن یەکێک لە سیما دیارەکانی نەشتەرگەریی نوێیە، بەڵام پاکژی (تعقیم) تـایبەت بە مـادەی کیمیـایی بە بنەمـای سیمای دووەم دادەنرێت. جۆزیف لیستەر[٦١] (١٨٢٧- ١٩١٢) پێشرەوی نەشتەرگەری تەعقیم بوو، لەکۆتایی ساڵی ١٨٦٠ لیستەر بە ئەسڵ لە کۆمەڵەی هاوڕێیانی ئاینی پیرۆز بوو. باوکی لە داهینانی میکرۆسکۆپی بێڕەنگ بەشدار بوو. واتە لە خێزانێکـی زانسـتخوازەوە ئاراسـتەکرابوو. دەڵـێن لە نەشـتەرگەرییە ئاشـکراکەدا کە بە ئیسـەر، لە بەریتانیـا ئەنجامدراوە ئەو ئامادەبووە، کە ڕۆبەرت لیستۆن[٦٢] (١٧٩٤- ١٨٤٧) نەشـتەرگەرییەکەی ئەنجامـداوە. کە پرۆفیسـۆری نەشـتەرگەری بـوو لە نەخۆشـخانەی کـۆلێجی پزیشـکیی لەندەن. لیستەر لێکۆڵینەوەی گرنگی ئەنجامدا، سەبارەت بە پشـکنینی میکرۆسـکۆپی، بەڵام ئەو کـاتە هێشـتا خوێندکاری کـۆلێجی پزیشـکی بـوو، دوای دەرچـوونی لە زانکـۆ، بەرەو ئەدینـبەرە کەوتەڕێ بە مەبەسـتی تەواوکردنـی خوێنـدن لەبواری نەشتەرگەریدا، لەوێ کچی پرۆفیسۆرەکەی خواست ونزیکەی دوو دەیەی لە ئەدینبەرە وگلاسکۆ بەسەربرد، لەو

---

61 Joseph lister.

62 Robert Liston.

ماوەیەدا سیستەمەکەی خۆی دەربارەی پاکژکاری نەشتەرگەری لە ١٨٦٧ پێشکەش کرد.

لیستەر بەهرەی لە لێکۆڵینەوەکانی پاستۆر وەرگرت، دەربارەی ڕۆڵی بونەوەرە زیندووە وردەکان لە پرۆسەی ترشاندن و بۆگەنکردن و پرۆسە زیندووەکانی تردا، لەسەرچاوە سەرەکییەکەیدا پاڵپشتیی پاستۆر دەکات، بە ئاوێتەکردنی ئەو دیدەی کە پاستۆر پێشکەشی کرد لەگەڵ ئەو زانیارییەی کە ترشی کاربۆلیک (فینۆڵ) بەسەرکەوتوویی بەکاردەهێنرێت بۆ پاکژکردنەوەی ئاوی ئاوەڕۆکان، برینپێچی کاربۆلیکی بەکارهێنا لە بەستنی برینەکاندا بەتایبەتی بەستنی ئەو برینانەی (لە ئەنجامی شکاویی ئاڵۆزەوە، مەبەست لەوەی ئێسکەکان ماسوولکەو پێستەکەیان دڕیوەو بەدەرکەوتوون) لەڕێگەی ئەم چارەسەرەوە چارەسەری ئەلتەرناتیڤ لە دۆخی شکاویی ئاڵۆزدا، بڕینەوەیە؛ ئەگەر هەوڵ درا برینەکان دابخرێن، چونکە لەم دۆخەدا ڕزگارکردنی پەلە تووشبووەکە زۆر سنووردارە. ئەو لۆجیکەی لیستەر پشتی پێبەستبوو، زۆر ئاڵۆزبوو، لەبەرئەوە پێداچوونەوەیەکی تری کرد بۆ قۆناغی داهاتوو تاکو وا دەربکەوێ ئەو سیستەمی پاکژکردنەوەیەی داوای دەکرد پشتی بە تیۆری میکرۆب دەبەست لە پیسبوونی برینەکاندا، بەڵام لە ڕاستیدا پشتی بەو باوەڕە بەستبوو گەردەکانی تۆز کە بە هەوادا


FIG. 21.—TO SHOW THE ARRANGEMENT OF TOWELS, ETC., IN A LARGE OPERATION.

شێوەی (٢١) ئامادەکردنی نەخۆشێک بۆ بڕینەوەی مەمکی، ئەو دۆخە شڵۆق و نالەبارەی جۆزیف لیستەر لە پاکژکردنەوەی نەشتەرگەرییەکەدا لەبواری پراکتیکییەوە ڕووندەکاتەوە. ئەم وێنەیە لە کتێبێک لە ساڵی ١٨٨٢ لەلایەن یەکێک لە قوتابییەکانییەوە وەرگیراوە، ئەویش سێر (ویلیام واتسۆن چین)ە.

هەڵواسراون سەرچاوەی پیسییەکان دەگوازێتەوە (لە ئەزمونی خۆدروستکردنەوەدا پاستۆر تۆزی لە کەمۆڵەکانی دوورخستبووەوە)، برینەکانی بەو لەفافانە دەبەست کە بە ترشی کاربۆلیکدا تەڕی دەکرد، چونکە ئەو ترشە ڕێگر بوو لە هەوکردنی برینەکان.

سیستەمەکەی لیستەر سەرکەوتنی بەدەستهێناو دەستی کرد بە فێرکردنی خوێندکارەکانی، بەڵام هەندێ لە

نەشتەرگەرەکان ڕەتیان کردەوە، بەتایبەتی ئەوانەی لەبواری نەشتەرگەریدا سەرکەوتنی باشیان بەدەستهێنا، ئەویش تەنها لەڕێگەی پێڕەوکردنی پاکوخاوێنییەوە. جەنگی پروسی – فەرەنسی ئەزموونێکی بەراوردکاری گونجاوی پێشکەش کرد کاتێک نەشتەرگەرە ئەڵمانەکان پشتیان بەو ڕێوشوێنە دەبەست کە لیستەر بانگەشەی دەکرد بەڵام هاوتا فەرەنسییەکانیان ڕێگرییان دەکرد، لەبەرئەوە ئەزموونی ئەڵمانی زۆر بەڕوونی بەسەر ئەزموونی فەرەنسیدا زاڵبوو، ناوی لیستەر بەجۆرێکی دیاریکراو بە تەکنیکە نەشتەرگەرییەکانەوە بەسترایەوە. بەڵام لیستەر خۆی نەشتەرگەرێکی خۆپارێز بوو و تا ڕادەیەکی زۆر کارەکەی لەبوارە ئاساییەکانی نەشتەرگەریدا، دەستکورت بوو، واتە لە پەلەکان و جومگەو میزڵدان و چەند بەشێکی ڕووکەشی لەشدا چڕبوو بووەوە.لیستەر بەردەوام بوو لە پێشخستنی سیستەمە پاکژکارییەکەی ، سپرای کاربۆلیکی بەکارهێنا لە چاودێری ئاسایی ئەو برینانەی لە نەشتەرگەریدا دەردەکەون، بەردەوام بوو لە بەدەستهێنانی دەرەنجامی نوێ، لە ئاستی نێودەوڵەتی ناوبانگێکی زۆری پەیداکرد.خۆی و پاستۆر زۆر ڕێزی یەکترییان دەگرت، لە پلاتفۆرمی کۆڕی پزیشکیی نێودەوڵەتیدا چەند جارێک چووە سەر هەمان مینبەر دوای ئەوەی لە چەند دەیەی دوایی سەدەی نۆزدەدا، ناوبانگی پەیداکرد. لەگەڵ زیادبوونی ڕۆڵی بەکتریا لە پیسبوونی برین، پاساوە تیۆرییەکانی بەرەبەرە گۆڕانکارییان بەسەردا هات و زیاتر دەیبەستەوە بە زانستی

بەکتریای نوێوە. بەهەرحاڵ تەمەنی مادەی پاککەرەوە antisepticی نەشتەرگەری کورت مەودا بوو؛ زۆر بەخێرایی پاکژکاری نەشتەرگەری aseptic جێی گرتەوە، کە ئامانجی کوشتنی میکرۆب نییە بەڵکو کار لەسەر دوورخستنەوەی میکرۆب دەکات، پرۆسەی پاکژکاری لەڕێگەی پاکوخاوێنی کەلوپەل و ئامێرەکانەوە، گۆزو برینپێچ و دەست وپلی نەشتەرگەرەکان و پێستی نەخۆشەوە بوو، ئەویش بە پشتبەستن بە پرەنسیپی گشتی کە پووختەکەی ئەوەیە، دەبێ هەر لەسەرەتاوە شانەکانی جەستە خاڵی بێت لە میکرۆب ، ئەگەر توانرا بەکتریا لەکاتی نەشتەرگەریدا دووربخرێتەوە، ئەوا برینەکان زوو سارێژ دەبن بەشێوەی سروشتی، بەپێی ئەوەی نەشتەرگەرەکان ناویان ناوە "مەبەستی یەکەم" واتە سارێژبوون بەبێ بوونی کێم و زوخاو، لە کۆتاییدا پرسی پاکژکاری بۆشاییەکانی ناو لەشی گرتەوە وەکو ورگ و سینگ و کەللەسەر- بۆ نەشتەریش، لەم سێیەی دوایی سەدەدا، نەشتەرگەری بووە، پسپۆرییەکی سەرنجڕاکێش، ئەو تەکنیکانەی کوخ وئەوانیدی لە تاقیگەی بەکتریۆلۆجیدا دایانهێنا، وەکو پراکتیکێکی سروشتی لەلایەن ئەوانەوە، لەسەر شانۆی نەشتەرگەری هاتە بەرهەم، وردە وردە بووە شوێنێکی دابڕاو وپتەو لە ناو سیستەمی نەخۆشخانەکاندا.

کاتێ پزیشکە نەشتەرگەرەکان لەسەرەتادا دەستیان دایە کاری نەشتەرگەری لە ناو هەناوی مرۆڤدا، (پێشتر ئەمجۆرە کارانە تەحریم و قەدەغەکراو بوو)، ڕێژەی سەرکەوتنیان لە

ئاستێکی زۆر نزمدا بوو، ئەمە جگە لەوەی تووشی کێشەی لاوەکی دەبوونەوە وەکو خوێن بەربوونی بەهێز و تەشەنە کردنی میکرۆب و هەوکردن (بۆنموونە لە کرداری هەرسدا، لەسەرەوەو لەخوارەوە بەڕووی جیهانی دەرەوەدا کراوەیە، هەروەها ریخۆڵە پاکوخاوێن نییە وەکو ئەندامەکانی تری جەستە) ئەو پزیشکانەی پەرۆشبوون بۆ بەکارهێنانی چەقۆ باوەڕیان بەو وتەیە هەبوو کە دەڵێ: "دڕین، فرسەتێکە بۆ چاکبوونەوە" چونکە زۆر حاڵەتی ئەوتۆ هەبوو، پزیشکەکان نەخۆشییەکەیان دەدۆزییەوە، بەڵام دەستەوەستان بوون لەوەی چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەن، بەڵام لەپڕێکدا توانرا لەڕەگەوە ئەو نەخۆشییە چارەسەربکرێت، لێرەدا پێویستە ئەو مردنانە لە زەمەنی پێشوودا بێنینەوە یاد، کە بەهۆی چاندنی دڵەوە ڕوویدەدا، پێشئەوەی سەرکۆنەی سەردەمی کۆن بکەین، بەڵام ئەو لێپرسینەوەیەی لەکاتی ئێستادا هەبوو لەو کاتەدا نەبوو، پەیوەندییەکی بەتین لەنێوان نەخۆش و نەشتەرگەرەکاندا وەک تاک هەبوو، لەو کاتانەدا چەقۆ بەکارهاتووە کە شایستەی نەشتەرگەری بێت، هێلکەدانیان لادەبرد کاتێ نەخۆشەکە تووشی حاڵەتی هستیریا یان ئازاری سووڕی مانگانە ببووایە، بەهۆی بێتاقەتی درێژخایەن و قەبزییەوە بەشێکی زۆری ڕیخۆڵەیان فرێدەدا، ئاڵوویان بەشێوەیەکی ڕۆتینی فرێدەدا، بەهۆی ئەوەی لە منداڵییەوە هەر گازندەیەکی هەبووبێ لە قورگ ئێشە. ڕێبازی "سەنتەری هەوکردن" لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا ڕەواجێکی زۆری هەبوو، وەکو پاساوێک

بەکارهاتووە بۆ لابردنی چەند بەشێک لە ڕیخۆڵە، دان، ئاڵوو وئەنـدامەکانیتر بەهەر دەردێـک بـووایە، تەنـانەت شـێت بوونیش.لەسـەردەمی نوێـدا، پەیوەنـدیی نێـوان نەخـۆش و پزیشـک چـووە قۆنـاغێکی تـرەوە، چوارچێـوەی کـاری پزیشکەکان فراوانتر بووەوە، دەبوایە نەخۆشەکان متمانەیان بە پزیشکەکانیان هەبووایە، لە ئەدەبیاتی مێژووییدا جەخت لەسەر نەشتەرگەرییە نامۆکان کراوەتەوە، یان باسکردنی ڕێـژەی ئەو مردنـانەی کەمتـرین چانسـی سـەرکەوتنیان هەبـووە. بە تێـڕوانین لەو گەشـەکردنە هـونەرییەی کە نەشتەرگەری لە نیوەی یەکەمی سەردەمی جەنگی جیهانی یەکەمـدا بەخـۆیەوە بینیـوە، زۆر خێراتـر بـووە لە تـۆڕە پاڵپشـتەکان (گواسـتنەوەی خـوێن، دژەتەنەکـان لە بەرەنگـاربوونەی هەوکـردن، چـاودێریکردنی ژووری چـاودێریی ورد)، ئەو پێـوەرە ئەخلاقییـانەی بەزۆری لە جێبەجێکردنی کرداری پزیشکی و نەشتەرگەریی نوێدا هەیە، ئەودەم نەبووە. جیاوازیی زۆر لە شێوازی دەستنیشانکردنی نەخۆشـی و توانـا هونەرییەکـان لەنێـو پزیشـکاندا هەبـووە. بـۆیە ئەوسـاو ئێسـتاش نەخۆشـەکان ئـازادن چـی نەشتەرگەرێک هەڵدەبژێرن.

دووەم میراتـی پراکتیکـی لە زانسـتی بەکتریازانیـدا کە توانای تێگەیشتنی لە سەرچاوەکانی نەخۆشی و نەخۆشییە درمی و شێوازەکانیدا هەبێت و وەڵامێکی قایلکەری پێبێت، کـاری پزیشـکی لەتـاقیگەی فـابریکەدا بـوو، وەکـو ڕێبەرێکـی پزیشکیی ناو کۆمەڵگە چاوی لێدەکرا.



وێنەی (٢٢) جیهانی پزیشکی: وەکو قارەمانێک یادی حەفتا ساڵەی تەمەنی لویس پاستۆر لە ساڵی ١٨٩٢ دەکاتەوە، ئاهەنگێکی نێودەوڵەتییە لە بەردەم هەزاران کەسدا، جۆزێف لیستەر بەخێرهاتنی مامۆستاکەی دەکات.

پسپۆرانی بەکتریۆلۆجی، کەسانی "کارامە" بوون زۆر باڵاتربوون لە نەوە کۆنەکەی پسپۆرانی تەندروستی گشتی؛ ئینجا پسپۆرانی بەکتریۆلۆجی بارستاییەکی گەورەتریان لای حکومەت و سیاسەتمەداران هەبووە، چادویک بانگەشەی "ئاوی پاک"ی دەکرد، بەڵام چەمکی پاکوخاوێنی گۆڕانکاری بەسەردا هات کاتێک زانرا جۆرێک لە بەکتریای دیارکراو لەڕێگەی ئاوەوە دەگوێزرێتەوە، کە دەبێتە هۆی نەخۆشی. بۆیە پێویستە ئاوەکە پێش خواردنەوەی پشکنینی بۆ بکرێت، بەهەمان شێوە خۆراک، کوالیتی گۆشت، هەوای پاکژ و

هەمــوو ئەو شــتانەی دەخــوورێن. زانایــان ســەرقاڵەی دیــاریکردنی ئەو توخمــانەن، چەنــد بنەمایەکیــان بــۆ ئەو مەبەستە لە بواری تەندروستی گشتیدا داناوە.

## فسیۆلۆجیا: ئیرادەیەکی نوێ

بەکتریــازانی زانســتێکی پزیشــکییە، زۆرتــرین کــاریگەری لەســەر ژیــانی ئاســایی تــاک، لەســەدەی نــۆزدەدا هەیە، فســیۆلۆجی ئەزمــونگەری نــارەزایی زۆری هەســتپێکراوی وروژانــد، کــاتێ پســپۆرانی زانســتی جەســتە بەشــێوەیەکی سیستماتیک نەشــتەرگەرییان لەســەر گیانەوەرە زیندووەکان جێبەجێکــرد. بەکتریۆلۆجییەکــانیش گیــانەوەری زۆریــان بەکارهێنــا، بەڵام تاقیکردنەوەکــانی ئەمــان هێنــد کــاریگەر نەبوون وەکو ئەوەی لە فسیۆلۆجیای ئەزمونگەریدا هەستی پێکــرا. بەتــایبەتی لە بەریتانیــا زانســتی فرمانەکــانی جەســتە (فســــیۆلۆجیا) لە بەکتریـــــازانی (بەکتریۆلـــۆجی) زیـــاتر پەرەیسەند.

ئەمانەکــان لە هەمــوو لقەکــانی زانســتی پزیشــکی پەیمانگایــان دامەزرانــد، دیــارترین پەیمانگــای فســیۆلۆجیا پەیمانگای کــارل لۆدڤیــگ[٦٣] (١٨١٦ -١٨٩٥) بــوو لە زانکۆی لایپزیــک، لە هەمــوو لایەکی دونیــاوە فێرکار ڕووی تێدەکرد بە ئامــانجی خوێنــدن. لۆدڤیــگ یەکــێ بــوو لە ئەنــدامانی گروپێکــــی چـــــوار کەســــی لەو فســــیۆلۆجییە لاوانەی ڕاگەیەنراوێکی شۆڕشگێڕانەیان لە ١٨٤٨ بۆ پەتاکە دەرکرد،

---

63 Karl Ludwig.

ئەوەیـان ڕاگەیاند کێشـەی فسـیۆلۆجیا دەتوانرێت لەڕێگەی جێبەجێکردنـی پرۆگـرامە زانسـتییەکانی فیزیـاو کیمیـاوە بەشێوەیەکی ڕێکخراو ئەنجام بدرێت.

دوان لە ئەنـدامانی گـروپەکە، کە مـابوونەوە بەڕێگەوەبـوون تـا سـەرۆکایەتی پەیمانگـا فسـیۆلۆجییەکانی بەرلـین وڤییەنـا بـکەن، بەڵام چوارەمیـان هێرمـان ڤـۆن هیلمهۆلتز، لە کۆتاییدا گواستییەوە بۆ فیزیـا. جگە لە کـارە گرنگەکەی لە بواری کارەبای موگناتیسی ئەمبارکردنی وزە، پسپۆر بوو لە فسیۆلۆجیای ئەندامە هەستیارە تایبەتەکان وفیزیای بیستن. هەرچوار ئەندامی گروپەکە لە فسیۆلۆجیادا بە ئاراسـتەی بنەمـایەکی فیزیکـی هەنگاویـان نـا. گرنگیـی لێکـۆڵینەوە سـەرەکییەکانی لۆدڤیـگ لە فرمانەکـانی دل و گورچیلەدا چڕبووبووەوە، کتێبە سەرچاوەییەکەی لە هەموو ئەو شـوێنانەی بە ئەڵمـانی دەدوێـن لە نـاوەوەو دەرەوە، لەڕێگەی وەرگێڕانەوە بڵاوبـووەوە. لەو سـەردەمەدا زمـانی ئەڵمـانی زمـانی زانسـتی پزیشـکی بـوو، بۆیە چانسـی چاپە ئەڵمـانییەکە خـۆی خـوێنەرێکی زۆری هەبـوو لە ئاسـتی جیهانـدا. ئینجـا تـاقیگەی ئەو فسـیۆلۆجیانە وفسـیۆلۆجییە ئەڵمانییەکـان بە دیدێکی مۆدێرنـانە ڕەنگڕێژ بووە، زاناکـان خۆیان سوودیان لە کەرەستە تەکنۆلۆجییە یارمەتیدەرەکان بینی، هلمهۆلتس چاویلکەی چاوی داهێنا، لۆدڤیگ کیمـۆگرافی (شـەپۆلە هێڵکارییەکـان)ی داهێنـا، کە بـریتییە لە تەپڵێکی خڕ بە ئـامێرێکی تۆمـارکردنەوە بەسـتراوە، ئەو گۆڕانکـارییە وەزیفییە بەردەوامـانەی جەسـتە دەپێـوێ وەکـو لێـدانی

دەمـــــاری دەســـــت، گرژبـــوونەوەی ماســـــوولکە و ئەو گۆڕانکارییـانەی بەهـۆی گرژبـوونەوە ڕوودەدەن. تۆمـاری هێلکاری بۆ ڕوداوە زیندووەکان تایبەتمەندییەکە بە زۆری لە بـواری تـوێژینەوە پزیشـکییە زینـدەگی و بـوارە پزیشـکییە کلینییەکان دەردەکەوێت.

فسـیلۆجیای ئەڵمـانی گەشـەی کـرد هەرچەنـدە فەرەنسـا پێشـڕەوی سـەدە بـوو: کلـۆد بێرنـارد[64](١٨١٣- ١٨٨٩) لە کۆلێژی پزیشکیی پاریس دەیخوێند، پێیوابوو ناکرێت کاری کلینیکـی پزیشـکی بە دوور بێـت لە چەمکـی میکانیزمەکـانی نەخۆشـــی یـــان گەڕان بەدوای چارەســـەرە نوێیەکانـــدا. تاقیکردنەوەکـانی لەسـەر گیانەوەران لە ژنەکەی و کـچەکەی دووری خســـتەوە، بێرنـــار بە پـــلەی یەکەم بەهـــرەوەر و داهێنەربـــوو لە کاروبـــاری نەشـــتەرگەری لە تـــاقیگەکەی، لەسەرەتای کارەکەیدا ڕۆڵی جگەری لە میتـابۆلیزەی شـەکر، فرمـــانی پەنکریـــاس لە کـــرداری هەرســـی خســـتەڕوو. لە دۆزینـەوە گرنگەکانیـدا باسـی فرمـانی دەمـارە دەرەکییەکـان دەکـات، باسـی ژاراوی بـوون بە یەکەم ئۆکسـیدی کـاربۆن دەکـات، جۆرێـک لە نەخۆشـیی شـەکرەی بەرهەم هێنـا بە لە نـاوبردنی چەنـد خـانەیەکی مێشـک بەشـێوەی دیـاریکردن و هەڵبـژاردن، لەســەروو هەمـوو ئەوانەوە گرنگـی بە چـۆنێتیی کـــار پێکردنـــی ئەو میکـــانیزمە فســـیۆلۆجییانە دەدات، کە گیانەوەرێک بەتەواوی فرمانەکانی بەرهەم دێنێ. تێگەیشـتنی لە "ناوەنـدە نـاوەکییەکە" یارمەتیـدا بـۆ باسـکردنی فرمـانی

64 Claud Bernard.

ئەنــــدامەکان لەڕێـــگەی کـــارە فســـیۆلۆجییەکانەوە، لە چوارچێـوەیەکی دیـاریکراودا، وەکـو پـلەی گەرمـی لەش و ئەیۆنە کانزاییەکان لە بۆڕییەکانی خوێندا، وشەکری خوێن. واڵـــتەر کـــانون، فســـیۆلۆجیی ئەمەریکـــی بەم پێشـــبینییەی بێرناردا چووەوە و ناوێکی تری بۆ دانا (هاوسەنگی شەکر) تائێســـتاش ئەم تێگەیشـــتنە لە مەســـەلەکانی تەندروســـتی و نەخۆشی و گەشەکردندا ناوێکی گەوهەرییە.

بێرنارد گۆڕانکارییەکی فەلسەفی لە ئەقڵیدا هەبوو، ژیانی پیشـــەیی و لێکۆڵینەوەکـــانی، هەروا پێشـــکەوتنی لە بـــواری فەلســـەفەی تـوێژینەوەی پزیشـکیدا لە کتێبە کلاسـیکییەکەیدا چڕبۆتەوە بە ناوی "پێشەکییەک بۆ لێکۆڵینەوەی ئەزمـوونی پزیشـــکی"، لەو کتێـــبەدا بێرنـــارد دەڵـــێ، تـــاقیگە پەنـــاگەی ڕاســـــتەقینەی زانســـــتە پزیشـــکییەکانە، هـــیچ زانســـتێکی ئەزمـــــوونگەری لە نەخۆشـــــخانەدا گەشـــــە ناکـــــات، لە نەخۆشـــخانەدا مـرۆڤ پێویسـتی بە چـاودێرییە، دوای ئەوە کۆمەڵێک گۆڕانکـاری هەن بەشـێوەی جیاجیـا دەخرێنە ژێـر چـاودێرییەوەو دەبینرێن، زانستی ئەزمـوونگەری ڕاستەقینە نـــاتوانێ گەشـــە بکـــات، تەنهـــا لە تـــاقیگەدا ئەزمـــوونگەرەکە دەتـــوانێ گۆڕانکارییەکـــان بپـــارێزێ و تۆماریـــان بکـــات، لەبەرئەوە گۆڕانکارییەکـــان ڕوون و ئاشـــکران. جارێکیـــان پاسـتۆر وتـی، ڕێـکەوت ئەقڵـی ئامـادەی پێباشـە، بێرنـارد دەرکـی بە ڕۆڵـی چـاودێری کردبـوو، کە ڕێـکەوت دروسـت دەکـات و بەرەو ڕێـگەی لێکـۆڵینەوەی بەسـوودی دەبـات. بـۆ نمـوونە میـزی کەروێشـک هەمیشـە لێـڵ و ئەلکـالینە، بەڵام کاتێـک بینـی میـزەکە گـۆڕا بە ئەسـید ئەوکـاتە بـوو کە

کەروێشکەکە خواردنی لێبڕابوو، گەدەی بەتاڵ بوو، لەوەوە بۆی دەرکەوت شانەکانی خۆی میتابۆلیزە دەکات، دەرەنجامی ئەمەش گەیشتە ئەوەی لێکۆڵینەوە لە مادە خۆراکییە جیاوازەکاندا بکات لە کرداری هەرسکردندا. بەدۆزینەوە فەلسەفییەکەی دەوترێ میتۆدی گەیشتن بە دەرەنجامی وادانراو: کاتێک زانایەک تیۆرێک دەربارەی دیاردەیەک دادەنێ، ئینجا ئەو دەرەنجامەی لە وادانراوەکە دەکەوێتەوە، تاقیکردنەوەی لەسەر ئەنجام دەدات تا بزانێت تیۆریی یان وادانراوەکەی ڕاستە یان نا، لە ئەنجامی تاقیکردنەوەکەدا بۆچوونەکەی خۆی دەخاتە لاوە. بێرنارد ئەو بۆچوونانەی خۆی بەو شەپقەیە شوبهاند کە وەسیلەیەکە بۆ بیرکردنەوە، زانای ڕاستەقینە شەپقەکە لەسەر ڕەفێک دادەنا لەکاتی تاقیکردنەوەکەدا، بەڵام لەبیری ناچێ کاتێ لە تاقیگەکە دەرچوو جارێکیتر بیکاتەوە سەری تا بزانێت چی بینیوەو واتاکانی چی دەگەیەنێت. لەسەر بنەمای ئەزموونەکەی سەرکەوتن و شکست یان ڕاستکردنەوەی وادانراوەکەی جێگیر دەکات، ئینجا ئەگەر پێویست بکات تاقیکردنەوەی تر ئەنجام دەدات.

بێرنارد پێیوایە پزیشکی ئەزموونگەری لە سێ کۆڵەکە پێکهاتووە: فسیۆلۆجیا، پەیوەندی کردن بە وەزیفەی سروشتییەوە، لەگەڵ زانستی نەخۆشی. لەڕێگەی وەزیفەی ناسروشتی و شێوازەکانی چارەسەرکردنەوە، تەرکیزی کردۆتەسەر چارەسەرە کاریگەرەکان. لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەکانییەوە لە هەر سێ بوارەکەدا کاری کردووە، بەڵام ئەو خاڵەی مایەی گرنگی پێدانە ئەوەیە، پێویستە هەر

بوارێـک لەو بـوارانە پشـت بە ئەزمـوونی پـتەو ببەسـتێت، ئەمەش ئەو ئامانجەیە لە تاقیگەدا نەبێت بەدەستنایەت. دەکرا لە ڕێـگەی کـاری مەیـدانی و توێـکـاری لاشـەو چـاودێری نەخـۆش و سـەردانی نەخـۆش لەسـەر جـێگەکەی، زانیـارییە سـەرەتاییەکان بە دەسـت بهێنـرێن، ئەو پرسـیارانەی پەیوەنـدییان بە بـابەتەکەوە هەیە ئاراسـتە بکـرێن، بەڵام ئامـانجی بنەڕەتیـی زانسـت ڕوونکـردنەوەی هۆکـار و میکانیزمەکـانە. پاسـتۆر و بیرنـارد هـاوڕێ بـوون، بێرنـارد گرنگیی هەموو کارەکانی پاستۆری دەزانـی، تەنانەت کۆچی دوایـی کـرد پـێش ئەوەی تەواوی تواناکـانی ئاشـکرا بکـات، بەڵام پاستۆر لە بێرناردا ئەوەی دەبینی کە داکۆکی کارێکی زمـان پـاراوە لە ڕێبـازی ئەزمـوونگەری پزیشـکی و هیـوای ئایندەیە.

هەرچەنـدە فسـیۆلۆجیای ئەزمـونگەری قورسـایی ئەو بزووتنەوەیەی هەڵگرت کە دژی توێکاری گیانەوەران بـوو، هـیچ یاسـایەک بـۆ ڕێکخسـتنی ئەزمـونی گیـانەوەران لە بەریتانیا نەبێت لەهیچ شوێنێکی تردا دەرنەچوو. لەسـەرەتادا یاسای توندو تیژی بەرامبەر گیانەوەران لە ١٨٧٦ نیگەرانیی تـوێژەرانی بـواری پزیشـکیی لـێکەوتەوە، بەڵام لە ڕاسـتیدا چوارچێوەیەکی ماقووڵیان دارشت بۆ ئەنجامدانی توێژینەوە لەسـەر گیـانەوەران، ئەمەش ڕێخۆشـکەربوو بـۆ دوورخسـتنەوەی توێژینەوەکـان لە کـارگە تـایبەتەکەی مـاڵی زانایان، ئەم مۆرکە دامەزراوەییە گواسترایەوە بۆ دامەزراوە گشـتییەکان و زانکۆکـان. گرنگتـرین ئـامرازی

فسیۆلۆجیستەکان کاری سڕکردن بوو. تاقیکردنەوەی سڕکردن لە گیانەوەراندا نەک تەنها کۆنترۆڵی ئازار دەکات، بەڵکو کاری نەشتەرگەرییەکە زۆر ئاسان دەکات. هەردوو تەکنیکی پاک وخاوێنی پێش نەشتەرگەری و پاکژکردنەوەی دوای نەشتەرگەری خزمەتی فسیۆلۆجی کردووە، ئەمە نموونەیەکی ترە لەسەر ئەو ڕۆڵەی پزیشکی کلینیکی و زانستی ئەزمونگەری، لە پتەوکردنی یەکتریدا دەیگێڕن.

ژمارەیەکی زۆر لە لێکۆڵینەوە فسیۆلۆجییەکان سوودیان بە پسپۆرییە پزیشکییەکان گەیاندووە، بۆ نموونە پزیشکی دەمارەکان (نیورۆلۆجی) کار لەسەر مێشک دەکەن. پزیشکەکانی دڵ لەو لێکۆڵینەوانە سوودمەندبوون لەسەر گیانەوەران ئەنجامدراون لە هەردوو بابەتی گرژبوونەوەی دڵ و لێدانی دڵ. یەکێکی تر لەگەشە پزیشکییەکان دۆزینەوەی هۆرمۆنەکان بوو، ئەم دۆزینەوەیە ڕێخۆشکەربوو بۆ دامەزراندنی بەشی کوێرە گلاندەکان، لەسەردەستی هەردوو زانای فسیۆلۆجی: ئێرنست ستارلینگ[65] (١٨٦٦-١٩٢٧) و ویلیام بایلیس[66] (١٨٦٠-١٩٢٤). پسپۆرە پزیشکییە نەشتەرگەرییەکان بەشێوەیەکی ئاسایی 'سروشتی' بوون؛ سەرەڕای ئەوەش لەنێو گرووپەکاندا پشت بە هەوڵی ئەو تاکە کەسانە دەبەسترا کەسووربوون لەسەر خەمی پێگەو ئایندەی پیشەیی خۆیان. بەڵام لە کاتی بەرپابوونی جەنگی جیهانیی یەکەمدا، کاری

---

65 Ernest Starling.

66 William Bayliss.

پزیشکی نەشتەرگەری، پشتیان بەو مەعریفە کەڵەکەبووە دەبەست، کە سەرچاوەکەی تاقیگەی کارگە بوو، لەسەردەستی ئەوانەی لە بواری زانستی پزیشکیدا کاریان دەکرد، (نەک پزیشکی کلینیکیی جێبەجێکار) بەشێوەیەکی بەرفرەوان ئەم زانیارییانە کەڵەکەو بەرفراوان بوون.

# بەشی شەشەم

# پزیشکی لە سەردەمی نوێدا

## دواتر چی ڕوویدا؟

پێنج بەشی سەرەتای ئەم کتێبە بەشێوەیەکی زەمەنی، لە هیپـــۆکراتەوە بـــۆ کۆتـــایی جەنگـــی جیهـــانیی یەکەم ڕیزبەنـدکراوە. بەڵام ئەم دوابەشــە، باســی کــاری پزیشــکی لەسەدەی ڕابردوودا دەکات. لێرەدا بەکورتی باسی گرنگیی پزیشـکیی ئێستا دەکەین لە بەستنەوەی بە هەریەک لە پێنج "جــۆر" ەکەی کــاری پزیشــکیی ڕابــردووەوە: دیــدەنگەی پزیشــکی ســەرجێگا، کتێبخــانە، نەخۆشــخانە، کــۆمەڵگە و تاقیگەی کارگەکان. هەریەک لەو جۆرە پزیشکییانە شوێنێکی تایبەتیــان لە بــودجەی چــاودێری تەندروســتیی ســەردەمدا، دەســـتەبەرکردووە، کە پەیوەنــدی ڕاســـتەوخۆی بەژیـــانی پزیشک و نەخۆشەوە هەیە.

یەکێ لە هێزە جووڵێنەرەکان لە پشتی پزیشکیی نوێوە بـــڕی تێچـــوونە، ئەو پرســـیارەی بەردەوام لەڕێـــگەی نەوەیەکەوە یـــان دوو نەوەی ڕابـــردووەوە، ســـەبارەت بە چـاودێری تەندروســـتی کـراوە ئەوەبـووە، ئایـا خەرجـی پزیشـــکی ڕەوایە؟ ئەم پرســـیارە ســـنوورە نیشـــتمانییەکانی تێپەڕانـــد و بەســـەر ئەو سیســـتەمانەدا جێبەجـێ دەبێـت کە لەڕێگەی بـاجەوە بەڕێـوە دەچـن وەکـو لە پلانـی دەسـتەی خزمەتگوزاری تەندروستی نیشتمانی (NHS) لە بەریتانیادا هەیە، یان بیمەی چاودێری تەندروستیی تایبەت بەرامبەر بە پـارە لە وڵاتە یەکگرتووەکـانی ئەمەریکـا، بە هەمـان شـێوە بەجێگەیانـــدنی ئەرکە تەندروســـتی و یـــارمەتییە پزیشـــکییە بنەڕەتییەکـــان لە ئەفەریقـــا. مەســـەلەی "پێداویســـتییە" تەندروستییەکان بە هەرچی پێوەرێک بێت بێسنوور نەرمە، تا زیاتر دابین بکرێت، زیـاتر داواکاری لەسـەر دەبێت، بڕی تێچـــــــووی تەندروســـــــتیی هـــــــاوچەرخ بەردەوام لەبەرزبـوونەوەدایە. لەهەمـان کاتـدا کـاریگەری پزیشـکی بەشێوەیەک زیادیکردووە بەهیچ شێوەیەک بە خەیاڵیش لە ڕابردوودا بەو شێوەیە کاریگەری نەبووە. ئینجا گرنگیدان بە توانـاکان بـووەتە پێشـینەی کارەکـان. چاودێریی تەندروستی بووەتە بەشێک لە کاری بازرگانی و بەپێی چەند ستراتیجێک لە کۆمپانیـا نێودەوڵەتییەکانـدا کاردەکـات، تەنـانەت بەشـێکی زۆری بەڵێندەرەکان لە کۆمپانیا نێودەوڵەتییەکانن کە قـازانج دەیـانجووڵێنێ. سـەرکردە بزنیسـمانەکان ئامـاژە بەوەدەکەن ئەو کۆمپانیایـانەی نرخەکانیـان گـرانە و بەرهەمەکانیـان خراپە، ئەوا بەرامبەر ئەوانەی پێشبڕکێیان دەکەن دەدۆڕێن،

بەڵام ڕەخنەگرانی کۆمپانیاکانی خزمەتگوزاری تەندروستی نوێ بەشێوەیەک ئاماژە بە خۆپاراستن و چاکبوونەوە لەنەخۆشی دەکەن، کەنابێ هاوشێوەی چاککردنەوەی ئۆتۆمبێل و فرۆشتنی بووکەشووشە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت.

تائێستاش هیپۆکرات کەسایەتییەکە پەنای بۆ دەبرێت. چارەسەرکاران لەهەر شێوە و جۆرێکدابن، لە ڕەوتی پزیشکە ڕۆژئاواییە سەرەتاییەکانەوە بگرە بۆ ئەلتەرنەتیڤە پزیشکییەکانی تر، بە باوکی دامەزرێنەری پیشەکەیان دایدەنێن. لە دوولایەنەوە وێنای هیپۆکرات پەیوەندییان بەیەکەوە هەیە، وتائێستاش سەرنجڕاکێشن: دیدی گشتی بۆ تێکەڵە و گرنگیی نەخۆشییەکان.

لە ئێستادا دیدی گشتی بۆ نەخۆشی، دەبێتە دروشمی سەردەمی نوێ، زۆربەی شرۆڤەکاران وایدەبینن، کاردانەوەی ئەو داماڵینە بەردەوامەیە لە زانستی پزیشکیی نوێدا؛ سەرەتا جەستە، ئینجا ئەندامەکان، ئینجا شانەکان، خانەکان، ئێستا گەردەکان. ئێمە پەیمانگامان هەیە بۆ پزیشکی گەردی، هەرچۆن لەسەدەی نۆزدەدا، زانکۆ ئەڵمانییەکان پەیمانگای فسیۆلۆجی، بەکتریۆلۆجی یان پاسۆلۆجییان دامەزراند. ئەگەر بابەتیانە بۆ مەسەلەکە بڕوانین (کەم کەس لە تەندروستی خۆیان، یان مەسەلەی چاودێری تەندروستی بەدیدێکی بابەتیانە دەڕوانن)، پزیشکیی گەردی، ترۆپکی ئەو ئاراستەیەیە لەسەدەی حەڤدەدا پزیشکەکان هان دەدات، بەلای کەمەوە ئاستی شێکارە نەخۆشییەکان کەم بکەنەوە، ئەم بەشە بەشێکی

دانەبــڕاوەوە دەتــوانین بەڕاســتی بە پێشــکەوتنی پزیشــکی و زانستی پزیشکی ناوی بێنین.

ئەم ئاراســـــتە هەمیشــــەییە لە داگرتنــــی ئاســــتی شــــیکردنەوەکان لای هەمــــوو کەس پەســــەندکراو نەبــــوو، تەنــانەت لای پزیشــکەکان خۆشــیان، ئەو هەســتەی ئــێمە "خەڵک دەکوژین تاکو توێکاری بکەین" ئەم هەستە پێشتر هەرهەبوو، پێش دانانی ئەم دەستەواژەیە لەلایەن شاعیری ڕۆمـــــــــانتیکی ویلیــــــــام ۆردس ۆرس[٦٧] (١٧٧٠-١٨٥٠). ڕۆمانسییەکان شەڕێکیان بەرپاکرد دژی ئەوانەی بێڕەحمانە سووررن لە سەر پشکنینی بەشێک لە پێناو هەموو جەستە. دوای جەنگــی جیهــانیی یەکەم و گەشــەی خێــرای ســیمای پسپۆری لە پزیشکیدا، زۆرێک لە پزیشکەکان هەستیان بە پێویســتیی بنەمــایەکی نــوێ کــرد لە کــاری پزیشــکیدا. ئەو بــزووتنەوە گشــتگیرە ســەرهەڵداوە، هیپــۆکراتی بە هێمــای خــۆی دانــا، وە هەوڵیــدا لە ســـەرەتایەکی هەمەگیــرەوە لە نەخۆشــــی بڕوانێــت، وەکــو بونیــادی لەشــــی نەخــۆش وپێکهاتەکەی. پزیشکەکان نەخۆشەکانیان هاندا بگەڕێنەوە بۆ سروشت، خواردنی خۆراکی سادە، جلوبەرگی کۆنە لەبەر بــکەن (یــان دایمــاڵن و خۆیــان ڕووت بــکەنەوە، پرەنســیپی ڕووتگەری بەشێک بوو لەو بزووتنەوەیە)، ژیان ئەو ژیانەیە لەگەڵ ویستەکانی سروشتدا هەماهەنـگ بێـت. بـزوتنەوەکە ژمارەیەک پزیشکی ناوداری بەلای خۆیدا ڕاکێشـا، بەتـایبەتی ئەوانەی لە زانستە ئەزموونگەری و پسپۆرییە پزیشکییەکان

67 William Wordsworth.

بە گومانبوون، دەرهاویشتەی ئەم بۆچوونانەش چەند ئەزموونێکی کۆنکریتی بوو. لەبەریتانیا ناودارترینیان مەڵبەندێکی تەندروستی بوو لەگەڕەکی پیکهامی خوارووی لەندەن، ساڵی ١٩٢٨ کرایەوە، دامەزرێنەرانی ئەم ڕێبازە باوەڕیان وابوو، زۆر دەمێکە پزیشکی زیاد لەپێویست تەرکیزی کردۆتە سەر نەخۆشی، و پێویستە سیما بایۆلۆجییەکانی تەندروستی خاڵی یەکەمی گرنگیدانەکانی بێت. هاندەری ژیانی خێزانی بوو، خێزانەکانی هاندا بەردەوام وبەرێکوپێکی سەردانی مەڵبەندەکە بکەن، بەشداری چالاکییە جەستەیی و کۆمەڵایەتییەکانی بکەن، کە زۆر جیاواز نەبوو لەو چالاکییانەی لە سەنتەرەکانی لەشجوانی هاوچەرخدا ئەنجام دەدرێن.

بزووتنەوە هەمەکی holism یەکە لە بواری پزیشکیدا، گوزارشتی لە کەمینەیەک دەکرد، بەڵام بەخێرایی کاریگەرییەکەی دوای جەنگی جیهانی دووەم بووە بلقی سەرئاو، بەشێکی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ژمارەیەک پزیشکی نازی، و کۆمەڵێک ئامادەکراوی بایۆلۆجی و دەرمانە موجیزەییەکان، گرنگترینیان: ئەنسۆلین، پەنسیلین و کۆرتیزۆن بوون، پەیمان درا بەم لێکۆڵینەوە ئەزموونییانە تەواوی نەخۆشییەکان چارەسەر بکەن. چارەکی دووەمی سەدەی بیست، بە "سەردەمی زێڕین"ی پزیشکیی نوێ هاتە ئەژمار، شکۆو متمانەی پزیشکەکان لە هەموو سەردەمەکان زیاتر بەخت یاوەریان بوو، لەو باوەڕەدابوون نەخۆشییە تەشەنەکردووەکان بە نزیکی کۆتاییان پێهاتووە، نەخۆشییە دەروونییەکان بەهۆی دەرمانی نوێی 'توارزین'ەوە، لەگەڵ

چەند براندێکی تر بۆ چارەسەری نەخۆشییە ئەقڵییەکان بەکار دەهات، چارەسەری نەخۆشیی شێرپەنجەش ئاسۆی ڕوون بوو.

ئەم کارە (یان پزیشکیی خێزان) بەڕێکەوت نەگونجاوە، لەم چەند دەیەیەدا ئاستەکانی دابەزینی بەخۆیەوە بینی، لە بەریتانیا پزیشکی جێبەجێکاری گشتی، ئەو پزیشکەیە هێشتا تەواو کارامە نییە تاکو ببێتە ڕاوێژکار لەدەستەی خزمەتگوزاری تەندروستی نیشتمانیی نوێ، یان وەکو پسپۆڕێکی ڕاوێژکاری لەسەر گیرفانی خۆی لەشەقامی هارلی ستریت کاربکات، پسپۆڕە پزیشکی و نەشتەرگەرییەکان، هەموو قوتابییەک هیوای لەسەرهەڵچنیوە، کەواتە پسپۆڕەکان ئەو دەستەبژێرەن لەنێو تەواوی پیشە پزیشکییەکانەوە هەڵبژێرراون.

لە ١٩٦٠ەوە، مەسەلەکان گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە، پریشکی ئاگری شەڕی ڤێتنام نەوەی نارەزایەتییەکانی دژی هەموو فۆرمەکانی دەسەڵات جۆشدا، لەهەمان کاتدا هێرشکرایە سەر پیشەکان، بەو سیفەتەی ئەمانە یەکێتیی کرێکارانی شاراوەن (مەبەست لەو دەستکەوتە مادی و بڕی ئەو ئازادییەبوو بەپێی ئارەزووی ئەندامەکان ڕەفتاری لەگەڵ دەکرا). ڕەخنەگری کۆمەڵایەتیی نەمساوی ئیڤان ئیلیچ[٦٨] (١٩٢٦-٢٠٠٢) هێرشێکی توندی کردە سەرخاوەن پیشە پەروەردەیی و پزیشکی و پیشەکانی تر، دەیگووت پزیشکەکان نەخۆشی دروستدەکەن و بڵاوی دەکەنەوە (واتە: ئەو نەخۆشییانەی بنەمایەکی چارەسەرییان

---

68 Ivan Ilich.

لەگەڵدایە)، بە ئەندازەی ئەو نەخۆشییانەی چارەسەریان دەکەن. ئیلیچ خەڵکی هاندا (نەک "نەخۆش" یان "کڕیار" زاراوەی نەخۆش لەم دواییاندا پەیدا بوو) خۆیان بڕیار لەسەر جەستەو تەندروستی خۆیان بدەن. ئیلیچ کەسێکی وانەبوو، ئەو یەکێک بوو لەلایەنگرانی ئەو گروپەی لە کولتوری دژەباودا ڕەخنەگر بوون (لەبەریتانیا خاتوو تاتچەری ڕاستڕەو هێرشی کردە سەر خاوەن پیشەکان)، ئەوانەی پزیشکان و پیشەوەرانی تریان ناچار بە پاشەکشێ کرد. پەیوەندی نێوان پزیشک و نەخۆشیش گۆڕانکاری بەسەردا هات، لەم پێودانگەوە هێز بەلای نەخۆشدا شکایەوە.وەکو بەڵگەیەک دەتوانین لە چوار چێوەی پێشکەوتنە زۆروزەبەندەکاندا باسی دووپێشکەوتن بکەین. یەکەم: سروشتی دارشتنەوەی پزیشکی جێبەجێکاری گشتی زیاتر لەپسپۆرەکان گرنگی "تەواوی بەنەخۆش" دەدەن، مایکل بالێنت[69](١٨٩٦-١٩٧٠) لەنێو هەموو مەسەلەکاندا تیشکی خستەسەر شێواوییە دەروونییەکانی (وەکو خەمۆکی، ڕاڕایی و بێخەوی) کە پەیوەندی بە پزیشکە گشتییەکانەوە هەیەو ئەوان چارەسەری ئەم نەخۆشییانەیان دەکرد. بالینت ڕۆڵێکی سەرەکی هەبوو لە گرێدانەوەی پزیشکی خێزان بە ڕووە گرنگ و زیندووەکەی چاودێری پزیشکی، ئەمەی کرد بە پسپۆرییەکی ئەکادیمی، شوێنێکی باڵای لە زنجیرەی پایە پزیشکییەکاندا بەرکەوت. گاڵتەجارییەکە لەوەدا بوو پزیشکی گشتی (ممارس عام)، خۆی پلەی خۆی بەرزکردەوە بۆ (پسپۆری گشتی) هەندێ تایبەتمەندی وەرگرت، وەکو

69 Michael Balent.

پرۆتۆکۆلەکانی، ڕاهێنـان، تـاقیکردنەوە، کۆلێجی پادشـایەتی بەریتـــانی. ڕاســـتییەکان چاوپۆشـــییان کـــردو لەگەڵ پێداویستیەکانی سەردەمدا ڕاهاتن.

پێشــکەوتنی دووەم تەرکیــزی کردۆتەســەر چــاودێری تەندروستی لە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکاندا،

لەســەردەمی کــۆمەڵەی نەتەوەکانــدا، کە دوای کۆتــایی هــاتنی جەنگــی جیهــانی یەکەم دروســتبوو، بــۆ ڕێکخــراوی تەندروســـتی جیهـــانی WHO بـــۆ ئاژانســـی پەیوەنـــدی نێـودەوڵەتی کە دوای جەنگـی جیهـانی دووەم دروسـتبووە، هەموو ئەمـانە یـارمەتیە پزیشـکییە جیهانییەکانیـان بەشـێوەی پرۆگرامێکـی سـتوونی لەسـەرەوە بـۆ خـوارەوە دابەشـدەکرد وتەکنۆلۆجیـا هەڵسـووڕێنەری بـوو. مەلاریـا، ئـاوڵە، کرمـی ئەنگلسـتۆما[٧٠]، کوێریی ڕووبـار[٧١] و چەنـد نەخۆشـییەکی تـری دیاریکراو. کەمپینی بنبڕکردنی ئاوڵە بەسـەرکەتووی کۆتـایی هـات، پرۆگرامـی تـریش سـەرکەوتنیان بەدەسـت هێنـا، بەڵام مەلاریا زۆر خراپ شکستی هێنا.

WHO ، لە ١٩٧٨ کۆنفرانسـێکی نێـودەوڵەتیی لە ئەڵمـا ئاتـا، لە کازاخســتان بەســت، ســەرنجی ئامـادەبووان بەرەو پرۆگرامــی ئاســۆیی ڕاکێشــرا، واتە چــاودێری ســەرەتایی، فێرکـردن، و بنەمـای ژێرخـانی ئـابوری، لەجیـاتی پرۆگرامـی

---

٧٠ Hookworm ،کرمـی ئەنگلسـتۆما، کرمـی پێچـاوپێچ، کرمـی قـولایی، مـاری ناوسـک، کرمێکـی قولاپـدارە لە ڕیخـۆڵەدا دەژی، گەراکـانی لەپێسـتی دەست و قاچەوە دەچنە ژووری.

٧١ Blind River ،Onchocerciasis نەخۆشـییەکی مشـەخۆرە، بەهـۆی کرمێکـی دەزوولەیـی پێچـاوپێچی کلکدارە، لە نیشـانەکانی، خـوران، گرێـــی ژێرپێســـت و دوای تەراخومـــا ، دووەم گەورەتـــرین هۆکـــاری کوێربوونە.

ســتوونی کە ئامــانجی نەخۆشــیی نێــو تاکەکــانە. هێشــتا پرۆگــرامە ســتوونییەکە، تەواو دەســتبەرداری نەبووبــوون، بەڵام هەست بەو گۆڕانکارییە کرا کە لە شێوەی گشتییەوە بەرەو تـایبەت چـوو، لە ڕووی بەردەوامیـدان و تواناکـانەوە. ســەرەتا گرنگییــان بە پیشــە تەندروســتییەکاندا تــاکو ئەوان بەرپرســـیارێتی فێرکردنـــی تاکەکـــان لە ئەســـتۆ بگـــرن، دەستنیشانی نەخۆشییەکەیان بکەن، دواتر تـاکی نەخـۆش و خێزانەکانیان چارەسەربکەن.

هیپـۆکرات ئـایکۆنێکی تەواو متمـانە پێکـراو بـوو، هەمـوو کەسێک دەیتوانی بێ هیچ بەربەستێک خۆی پێ بناسێنێ، ، لەگەڵ ئەوەشــدا کۆمەڵێــک لەو بەهــا پزیشــکییانەی لەســـەر جێگای نەخۆش لە گروپەکەی هیپۆکراتدا ڕوویداوە، جارێکی تر گەڕاوەتەوە بۆ ڕەوتە سەرەکییەکە.

## پزیشکی کتێبخانە: نرخی زانیاری

هاتنی کتێبی چاپکراو لە سەدەی پازدەوە گۆڕانکارییەکی ڕیشــەیی بــوو لە شــێوازی مەعــریفەی پزیشــکی، دوای دوو ســەدەی زەمەنــی، گۆڤــارە پزیشــکی و زانســتییەکان خشــتە زەمەنییەکەیان گۆڕی، ڕەنگە هەنـدێ کتێب پەلەی چـاپکردنی کرابــێ بەمەبەســتی گەیانــدنی ئەو دۆزیــنەوەیە یــان هەر تیــۆرێکی کــاریگەری نــوێ، بەڵام هەنــدێ کتێــب بەرهەمــی چــاوەڕوانی تەمەنێکــی تەواو بــووە، لەبەرئەوەی گۆڤــار بە خشتەیەکی زەمەنی دیاریکراو بەڕێک وپێکی دەرچووە، بۆیە ئامـادەبووە لەگەڵ کـاروانی پێشـکەوتنە نوێیەکانـدا بەردەوام بێت. گۆڤارەکانی سـەرەتا زۆربەیـان لە بڵاوکراوەی کۆمەڵە زانستییەکانی سـەدەی حەڤدە بـوون، پزیشـکەکان بە بـابەتە

پزیشـــکییەکانیان بەختـــی خۆیـــان تێـــدا تاقیـــدەکردەوە، لەسـەرەتای سـەدەی داهـاتووەوە گۆڤـاری زانسـتیی تـایبەت دەرچـوو، سـاڵی ١٨٠٠ گەشـەی تـوان[٧٢] لەو گۆڤـارە سـاڵانە نـــوێیەدا بڵاوکـــرایەوە، کە ژمارەکـــانی کەمتربـــوون لەو ژمـارانەی لە ئێسـتادا دەردەچن؛ بەهـۆی ئەوەی لە ئاسـتێکی نزمـدا دەردەچـوو. سـاڵی ١٨١٢ گۆڤـاری هەفتـانە دەرچـوو وەکو ئەوەی ئێسـتاش دەردەچێ (The New England Journal of Medicine) هەروەهـا گۆڤـاری لانسـێت lancet لە ١٨٢٣ دەرچـوو، هەردووکیـان تائێسـتاش دەنگی بیسـتراوی بـواری پزیشـکین، کـرداری بڵاوکـردنەوەی زۆر خێـرایە، سـەروتار و هەواڵ و نـامەگۆڕینەوە، هەر هەمـووی پەیوەندییەکی بەهێزی بە دروسـتبوونی پیشـەی پزیشـکییەوە هەیە بەشێوەیەکی نوێ.

پێش دوو دەیە پێشـبینی ئەوە دەکرا، کە کتێب و گۆڤارە چاپکراوەکـان دەمـرن، کاتێـک کۆمپیـوتەر و ئینتەرنێـت و بڵاوکـراوە ئیلیکترۆنییەکـان گۆڕانکارییـان کـرد لە شـێوازی بڵاوکـردنەوەی مەعـریفە. بەڵام ئەو پێشـبینییانە جێبەجـێ نەبـوون، تـا ئێسـتا کتێـب و گۆڤارەکـان بەشـێوەیەکی زۆر دەردەچن. ڕاستە ئابوری بڵاوکردنەوە بەو واتـایەیە، دواجـار لەسـەرەخۆ گۆڕانکـاری بەدی دێـت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا " پزیشـکیی کتێبخـانە" لەگەڵ ئێمەدا لەسـەردەمی کۆمپیـوتەردا خـۆی گونجانـدووە، بەلای کەمەوە دوو کـاریگەریی گرنگیـان لە بواری چاودێری تەندروستیدا هەیە.

---

٧٢ Exponential growth گەشـەی تـوان کردارێکە، تێیدا ژمارەکـان چەنبارە دەبنەوە، ئەمە ڕوودەدات کاتێک تێکرای گۆڕانکارییەکە دەگونجێت لەگەڵ ئەو بڕەی لەگەڵ کاتدا ڕاستەوانە دەگۆڕێت. (و)

یەکەم: پەیوەندیی نێوان نەخۆش و پزیشکەکان گۆڕانکاری بەسەردا هات لەسایەی ئەو ڕاستییەی تاکەکان لەئێستادا بەئاسانی دەتوانن زانیاری پزیشکی بەدەست بێنن. ئەو نەخۆشانەی ئارەزوو دەکەن سەبارەت بە نەخۆشییەکەیان یان چارەسەرەکەیان شتێک بزانن، هەمیشە پرسیار لە پزیشکەکەیان دەکەن، یان دەچن بۆ کتێبخانە. بەڵام ئەم گەڕانە بە سەرهەڵدانی ئینتەرنێت ئاسانتربووەوە، چونکە نەخۆشەکانی هاندا زیاتر بەشداری لەو چاودێرییە پزیشکییەی بەدەستی دێنن بکەن.

ئەم دیاردەیە لە لایەن یەک دوو نەوەوە پێشوازی لێکراوە، ئەمەش لە لایەن کارمەندانی بواری پزیشکییەوە پێویستیی بە بەردەوامیدان هەیە، ئێستا (بەبڕی سەرکەوتنی جیاواز) ئەم تەکنۆلۆجیایە لە کۆلێجی پزیشکیدا دەخوێندرێت، دیارە ئەم شێوازەش بێ کێشە نییە چونکە سروشتی ناڕێکی ئینتەرنێت ئەوە دەگەیەنێ نەخۆشەکان لە بنەڕەتەوە زانیاری پچڕ پچڕو ناتەواو و هەڵە و لایەندار وەربگرن، لەسەردەمی نوێدا گرنگیدانەکە بەشێوەیەک گۆڕا مافی نەخۆش لەبەرچاو بگیرێ و زانیارییەکان بە ئاسانی بەدەست بهێنرێن. هاوسەنگیی هێز لە نێوان پزیشکان و زۆربەی نەخۆشەکاندا هەبێت. ئەم شێوازە زۆر بەسوودە، چونکە پزیشکەکان کاتێکی زیاتر دەبەخشنە نەخۆشەکانیان.

دووەم: بە هۆی شۆڕشی نوێی زانیارییەوە گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی لە تۆماری نەخۆشەکاندا ڕوویدا. لێرەدا چەند مەسەلەیەکی گەورە هەیە پەیوەندی بەگەیشتن بە زانیاری ونهێنییەکانی زانیاری و هەر پلانێکی نیشتمانییەوە هەیە (ئەو پلانەی بەریتانیا دەیەوێ جێبەجێی

بکات)، بودجەیەکی زۆری دەوێ و تائێستا سەرکەوتنی بە دەستنەهێناوە. لە ڕووی تیۆرییەوە بە هیواین هەر نەخۆشێک لەسەر پەڕەیەکی سۆفتی ئەلیکترۆنی فایلی تایبەت بەخۆی هەبێ، ئەم ڕێگایە کار ئاسانییەکە بۆ کارمەندانی کەرتی تەندروستی لە بەشی ئیمێرجنسی یان ڕووداوەکان، و یارمەتی پزیشکەکان دەدات هەر زانیارییەکیان دەربارەی نەخۆش بوێت، بەئاسانی دەستیان بکەوێت. لە ماوەیەکی کورتدا نەخشەکە لەلایەن ئەو نەخۆشانەوە کە گرنگی بە تەندروستی خۆیان دەدەن تا هاوکاربن سەرکەوتوو دەبێت. دەست ڕاگەیشتنی کۆمپانیاکانی بیمەو خاوەنەکانیان بە داتاو زانیارییەکان مەسەلەیەکە هێشتا چارەسەرنەبووە، لە ڕاستیدا ئامانجی باڵا هەمیشە بەردەمی بە دڕکوداڵ گیراوە.

کارمەندانی کتێبخانەکان کراون بە فەرمانبەری زانیارییەکان، پزیشکەکان لە جیاتی نەخۆش، چاویان بڕیوەتە شاشەی کۆمپیوتەرەکان، ڕەنگە مافی نەخۆشی دڵپەشێو بێت وابیربکاتەوە کە ئەم جیهانە ئەلیکترۆنییە نوێیە وەکو پێویست لە بەرژەوەندیی نەخۆشدا نییە.

## پزیشکی لە نەخۆشخانە: نرخی چاودێری کردن

هاوکات لە گەڵ شۆڕشی فەرەنسیدا گۆڕانکاری بنچینەیی بەسەر نەخۆشخانەکانیشدا هات لە هەردوو بواری فێرکردن و بیرکردنەوەی پزیشکییەوە. گۆڕانکارییەکان لە دوو سەدەی ڕابردووەوە دەستیان پێکردووە، لەڕووی شێوەی ئەندازەیی، ڕێکخستن، بودجە و هەردوو ئەرکە پزیشکی ونەشتەرگەرییەکەیەوە.

نەخۆشـخانە لەڕووە ئەنـدازەییەکەیەوە، خـۆی لە خۆیـدا بابەتێکی تایبەتە، لەگەڵ گۆڕانکاری لە پێویستییە کۆمەڵایەتی و ئابوری و پزیشکییەکانەوە گۆڕانی بەسـەردا دێ، زۆربەی نەخۆشـخانەکان لەسـەرەتای سـەدەی نوێـوە، بە ئەنقەسـت بەشـێوازێک دیـزاین کراون کە گوزارشـت لە ڕەسـەنایەتی و گۆشـەنیگا ئـاینییەکەی بکـات، زۆرجـار نەخۆشـخانەکان لە شـێوەی خـاچ دروسـت دەکـران هاوشـێوەی کڵێسـاو شـوێنی قوربـانی کردنـی تێـدا بـوو هەر لە نـاو نەخۆشـخانەکەدا کڵێسایەکی بچووکی تێدا دروست دەکرا. لە بەشێکی زۆری ئەورووپـا کەنیسـەی کاسـۆلیکی ڕۆمـانی بەپێـی پێداویسـتییەکانی ڕۆژانە شـێوازە ئەنـدازەییەکەی دیـزایین کردبـوو و دەسـتەی پەرستارانیشـی دابـین کردبـوو، بـۆ چاودێریی نەخۆش. لە ئەورووپای پرۆتستانتیشدا، بەفۆرمێکی زۆر سیکۆلار نەخۆشخانەکان دامەزران، زۆربەی بینایەکان کە بەمەبەستی چارەسـەرکردن دامەزرابوون، تۆزێ لە ماڵە لادێییەکان باشتر بوون. نەخۆشخانەی پسپۆرییە تایبەتەکان کە بۆ کاری منداڵبوون و نەخۆشییەکانی کۆئەندامی زاوزێ یان ئاوڵە، منداڵان، سییەکان و چاو دامەزرابوون، زۆر جار لە مـاڵی ئاسـاییەوە دەسـتی پێـدەکرد، تـایبەت بـۆ ئەوە دروستیان کردبوو. دواتر نەخۆشخانە سەرکەوتووەکانیان دەگواسـتەوە بینـایەی گەورەتـر، هەنـدێجار ئەو خـانووەی کرابـووە نەخۆشـخانە گەورەبـوو، بەڵام هەر دەیانگواسـتەوە بینـایە تـایبەتەکە، پێداویسـتییەکانی ئەو شـوێنە تـازانە زۆر جیـاوازنەبوو لە پێداویسـتییەکانی مـاڵ؛ چێشـتخانە، ئاودەستخانە، شوێنی تایبەت بە خاشاک، ژووری تایبەت بە

قەرەویڵەی نەخۆش و ژووری پزیشکانی تێدابوو. کاری نەشتەرگەری و منداڵبوون هەر لەسەر قەرەویڵەی ئاسایی نەخۆشەکە ئەنجام دەدرا، هەندێجار ئەو قەرەویڵەیە نەخۆشێکی تریش هاوبەشی دەکرد.

لە سەدەی نۆزدەدا، هەندێ مەرجیان بۆ دیزاینی رووکاری هەندێ نەخۆشخانەی تایبەت بە نەشتەرگەری و کاری پزیشکی، دادەنا. قاوشەکان شێوە لاکێش و لەسەردرێژی بە هەردوولادا پەنجەرەی لێکرابووەوە، ئەم دیزاینە شێوەیەک بوو لەشێوەی نەخۆشخانە سەربازییەکان. بزوتنەوەی نایتینگڵ[٧٣] لە پەرستاریدا ئەمجۆرە ستایلەی بۆ

٧٣ فلۆرەنس نایتینگڵ Floranse Nightingale (١٨٢٠- ١٩١٠)، لەشاری فلۆرەنسەی ئیتالیا لە ١٨٢٠ لە خێزانێکی بەریتانی دەوڵەمەند کە بڕوایان بە خستنەبەر خوێندنی ئافرەت هەبووە، لەدایک بووە، نایتینگڵ بە شێوەیەکی بەرفراوان و بەرچاو بە دامەزرێنەری پەرستاری نوێ و ئامارکار و ریفۆرمخوازێکی کۆمەڵایەتی دادەنرێت، وەنازناوی خاتونی روناکی یان چرا بەدەستی پێبەخشرا،باوکی فێری خوێندەواری کردووە، وە خەونی بەوەوە دەبینی کە خزمەتی کەسانی تر بکات و ببێتە پەرستار بەڵام خێزانەکەی لە سەرەتادا دژی بوون، چونکە لەو کاتەدا پیشەی پەرستاری بە پیشەیەکی بێڕێز وناشکۆمەند تەماشا دەکرا، سەرەڕای رێگری خێزانەکەی بەڵام ئەم هەر سووربوو لەسەر بەدیهێنانی خەونەکەی، تەنانەت هەلی هاوسەرگیریشی رەتکردەوە، چونکە پێیوابوو هاوسەرگیری کردن بە بەرپرسیاریتی ماڵەوەی دەبەستێتەوە. لە زەمەنی کۆلێراو گرانەتادا لەناو سەربازانی بەریتانی و لەشەڕی قەرم لە روسیا بە چراکەی دەستییەوە شەوان بەسەر هەزاران سەربازی بریندارو نەخۆشدا دەسووڕایەوە، فلۆرانس ژیانی هەزاران کەسی رزگارکردووە، دوای ئەوەی خۆی سەرپەرشتی ٣٨ پەرستاری ژنی کرد بۆ سکوتاری لە نەخۆشخانەی باراک لەسەر داوای وەزیری جەنگی بەریتانی سیدنی هیربیرت ساڵی ١٨٥٤. کۆتایی ژیانی زۆربەی بەنەخۆشی بردەسەر. بڕوای تەواوی بە گرنگی و پێویستی دانانی پرۆگرامی فێربوونی پەرستاری و پرۆگرامی

دروستکردنی قاوش لە نەخۆشخانە گشتییەکاندا کرد بە ستاندارد.

ئەوجۆرە قاوشە دوو تایبەتمەندی سەرنجڕاکێشی هەبوو، یەکەم، ئەو ڕیزە پەنجەرە دوولایە بۆ هەواگۆڕکێ بوو بەشێوەیەکی ئاسان، لەسەردەمێکدا تیۆری نەخۆشییە پیسەکان بەربڵاوە (فلۆرەنس نایتینگڵ بەگەرمی لەیەک کاتدا لایەنگری نەخۆشییە پیسەکان و تەندروستی گشتی بوو)؛ ئەم شێوازە وایکرد چاودێریی نەخۆشەکان لەلایەن پەرستارەکەوە ئاسان بێت. لەکاتی بنیادنانی نەخۆشخانەی جۆنز هۆپکینز لە کۆتایی ١٨٨٠ دا ئەمجۆرە شێوازە خرایە ناو دیزاینەکەوە.

لەوکاتەدا چەند مەرجێکی تر هەبوو، جەختی لەوە دەکردەوە، پێویستە نەخۆشخانەی زانکۆ ئەڵمانییەکان لەهەر قاوشێکدا تاقیگەیەکی بچوکی تێدابێت پزیشکەکان بتوانن پشکنینی کیمیایی و مایکرۆسکۆپی بۆ میز وخوێن و مادەکانی تر بکەن. لە زۆربەی نەخۆشخانەکاندا پاکوخاوێن ڕاگرتنی نەشتەرگەرییەکان دوابەدوای پاکژکردنەوەی پێش نەشتەرگەری پەسەندکراو بوو. تا دەگاتە دابینکردنی ژووری نەشتەرگەری، لەگەڵ هەموو پێداویستییەکی تایبەت بە پاکژکاری sterilizing. تیۆری میکرۆبی نەخۆشی، بەو مانایە دێت نەخۆشخانە پێشکەوتووەکان پێویستیان بە لابوری تایبەتە بە مەبەستی پشکنینی چاندنی بەکتریا

---

خوێندنی ئادابی پیشە هەبوو، بەهۆی هەوڵە بێوچانەکانییەوە یەکەم خوێندنگەی پەرستاری بە ناوی نایتینگلەوە لە ١٨٦٠ لە نەخۆشخانەی سانت تۆماس کردەوە، ڕۆڵی سەرەکی بینی لە مەشقی مامانی و پەرستاری نوێ، لە ١٩٠٧ نیشانەی قارەمانیی پێبەخشرا.

cultivating بۆ بەڵغەم، خوێن، میز و پیسی و پاسۆلۆجیای خانەیی بەو مانایەی پشکنینی شانە تایبەتەکان بە مەبەستی ئاشکراکردنی شێرپەنجە و نەخۆشییەکانی تر. زۆرجار پسپۆری هەمیشەیی نەخۆشییەکان لە کاتی نەشتەرگەریدا سامپلێک لە ریشاڵەکان بە مەبەستی پشکنین وەردەگرێت، وەدەیخوێنێتەوە و سروشتی نەشتەرگەرییەکە پشت بە خوێندنەوەی ئەو پاسۆلۆجیستە دەبەستێت. لەکۆتایی سەدەی نۆزدەدا ئامێری تیشکی ئێکس لەنەخۆشخانەکاندا دەرکەوت، ئەمەش وای پێویست دەکرد ڕووبەرێکی بۆ تەرخان بکرێت، تەکنیک کاریشی بۆ دابین بکرێت لە پێناو کاری وێنەگرتن بە تیشکی ئێکس و دابینکردنی یەکێک بۆ خوێندنەوەی تیشکی ئێکسەکە. هەروەها کلینیکە دەرەکییەکان لە ساڵی ١٨٧٠ یەکێک بوو لەتایبەتمەندییە گرنگەکانی نەخۆشخانەکان.

هەر داهێنانێک لەو داهێنانە پزیشکی و نەشتەرگەرییانە، یان هەرداهێنانێکی تر پێویستی بە چاکسازی و راستکردنەوە هەیە لەشێوازی ڕێکخستنی ئەندازەیی ئێستا، لەڕووی بیناسازییەوە یان بیناکان پێویستیان بە گرنگی پێدانی تایبەت هەیە، لەگەڵ دروستکردنی نەخۆشخانەی نوێ بەشێوەیەکی بەردەوام. پێویست ناکات مرۆڤ لە لێکچوونەکانی داهاتوو زۆر وردبێتەوە، بەڵکو سەدایەک هەیە لەنێوان شێتخانە و بەندیخانەی سەدەی نۆزدە لەلایەک، لەگەڵ نەخۆشخانە وهۆتێلەکانی سەدەی بیست لە لایەکی ترەوە. بەندیخانە و پەناگەکان لەسەردەمی ڤیکتۆریدا هەردووکیان لەدەرەوەی شار دروستکراون، لەپێناو دڵنیایی

و دابـــڕین. نەخۆشـــخانە نوێیەکـــان کـــاریگەریی هۆتێـــل و دامەزراوە کارگێڕییەکانیـــان لەســـەرە، هەمووشـــیان بەڵێنیـــان داوە خـــۆراک و پۆشـــاکی خـــاوێن بـــۆ مـــاوەی جیاجیـــا بـــۆ میوانەکـــانی دابـــین بـــکەن، لەگەڵ دابینکردنـــی شـــوێنی جـــل شووشتن و حەمام، سەرەڕای ئەوەی بازرگانەکان خۆراکی پێویســـتیان بـــۆدەنێرن بـــۆ چێشـــت لێنـــان. داڵان و ڕێـــڕەوە مەرکەزییـــە درێژەکـــان کە بەهەردوو لای ڕیـــزە ژوورەکانـــدا دەکرێنەوە، یەکێکە لە تایبەتمەندییە هاوبەشـــەکان، بەتـــایبەتی لەڕووی ڕێکخســـــتنی هـــــاتووچۆو چـــــوونە ژوورەوەوە، ســـەرەڕای ئەوەش شـــێوازی وەرگرتنـــی کـــرێ بەشـــێوەیەکی ئاســـان ڕێکدەخات. نموونەی ئەمەش لەوڵاتە یەککرتووەکـــان و هەمـــوو نەخۆشـــخانە تایبەتەکانـــدا لە هەر شـــوێنێک بێـــت هاوشێوەیە.

لەســـەرەتای ســـەدەی بیســـتەوە، ئیدارەی نەخۆشـــخانەکان لەڕووی ڕێکخســـتنەوە، برەویـــان دا بە شـــێوازی کەرتـــی بازرگـــــانی، لەپێشکەشـــــکردنی خزمەتگوزارییەکانیانـــــدا. کـــارگێڕیی نەخۆشـــخانەکان بە ئەنقەســـت، لە گۆشـــەنیگای شـــێوازی بەرهەمهێنـــانی پیشەســـازییەوە، چاویـــان بڕیبـــووە زیادبوونی تواناکان، بەرهەمـــی زۆر، کەمترین بڕی تێچـــوون و پێشکەشکردنی خزمەتی گونجاو بە کڕیار، کە هاوتـــای ئەو پـــارەیە بێـــت کە دەیـــدات، ئەمـــانە ئەو مەســـەلە لۆجیکییـــانەن لەدیدی بەڕێوەبەرەکانەوە پەسەندکراون، واتە دامەزراوەکان لەســـەر بنەمـــای قـــازانج بەڕێوە دەبرێن. لە ئەورووپا زۆربەی نەخۆشـــخانەکان تائێســـتاش دامەزراوەی خێرخـــوازین، بەڵام زۆر بەئاســـانی بەهـــای قـــازانج لە نەخۆشـــخانەکانی ئەمەریکا

دەست وەردان دەکات، چونکە هەمیشە بوودجە سنووردارە، وەکو ئاشکرایە لەماوەی سەدەو نیوێکی ڕابردوودا یەکێ لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی نەخۆشخانە بودجەی زۆرە. لە بەرکەوتەی نێوان بەهای پزیشکی و بەهای ئابووریدا، بەهای ئابووری هەمیشە زاڵە، بەچاوپۆشی لەسەرچاوەی پارمەتییە داراییە سەرەکییەکە.

کەواتە بوودجە تایبەتمەندییەکی گەوهەری نەخۆشخانەکانی سەردەمە، ڕێگەی جیاواز لە دابینکردنی ئەو پارەیەدا گیراوەتەبەر، کاتێک نەخۆشخانەکان لەلایەن ڕێکخراوە ئاینییەکانەوە یان لایەنە خێرخوازییەکانەوە پاڵپشتی مادی دەکرا (شێوازی خۆبەخشی ئەهلی، شێوازی سەرەکی بوو لە پاڵپشتیکردنی مادیی نەخۆشخانەکانی بەریتانیا تا ئەو کاتەی لەچوارچێوەی دەستەی خزمەتگوزاری تەندروستی نیشتمانیدا NHSS خۆماڵی کرا)، هەمیشە بوودجە بەرپرسیارێتی ئەوانە بوو پاڵپشتی ماددی دەکەن، بەڵام خۆیان بۆیان نەبوو سوودی لێ وەربگرن، نەشتەرگەری سەردەم و تیشکی ئێکس و هۆکارەکانی تری دەستنیشانکردنی نەخۆشی، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە، دەوڵەمەندەکانیش بۆیان هەبوو ڕووی تێبکەن. یەکێ لەو چارەسەرانەی نەخۆشخانە خێرخوازە بەریتانییەکان گرتبوویانەبەر دروستکردنی قاوشی تایبەت بوو بەکرێ بۆ دەوڵەمەندەکان، ئەو پارەیەی لە دەوڵەمەندەکان وەریان دەگرت، قاوشی خێرخوازییان پێدەکردەوە بۆ هەژارەکان. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا پێشتر بەشی چارەسەر بە کرێیان کردەوە، نەخۆشخانەی تایبەتی وەکو نەخۆشخانەی مایۆ کلینیک

هەبوو، کە خێڵی مایۆ لە مینیسۆتا لە ١٨٨٠ دروستیان کرد، ئەم نەخۆشخانەیە چاودێری تەندروستی و نەشتەرگەری پێشکەش بەو کەسانە دەکرد کە دەیانتوانی کرێی چارەسەرەکە بدەن، یان ئەوانەی بیمەی تایبەتیان هەبوو. ڕۆڵی کۆمپانیاکانی بیمە لە سەرەتای سەدەی بیستەوە تا ئێستاش لەمێژووی پزیشکیدا ڕۆڵێکی ئەوتۆیان نەبووە کە مایەی ڕێز و بەرز نرخاندن بێت، هەرچەندە هەندێ لە کۆمپانیاکانی بیمە سەرەتا ئامانجیان خێرخوازی بوو، بەڵام هەمیشە پاڵنەری سەرەکییان سوود وقازانج بووە.

سیستەمی چاودێری تەندروستی هەرچییەک بێت، هاوکاری کردن لەلایەنی سێیەمەوە، لە نەخۆشخانەی کۆمەڵگە ڕۆژئاواییەکاندا، بووەتە نەریت، لەبەرئەوەی ئەم سیستەمە پێویستی بە بودجەیەکی گەورە هەیە. خەرجی دامەزراندن و سیستەمی گەرما و ڕوناکی و چاککردنەوەو دابینکردنی دەستی کار و ئامراز و کەرەستەی تایبەت بەو دامەزراوە ئاڵۆزە، سەرچاوەی نیگەرانی بووە لەسەدەی ڕابردوودا. ئەو لایەنانەی دەستەبەری بودجە تایبەتەکان دەکەن هەمەجۆرن وەکو دەوڵەت، شارەوانی، ڕێکخراوێکی ئایینی، کۆمپانیایەکی دڵنیایی، بەرپرسێکی دەسەڵاتدار، گروپێکی خێرخواز، چاکەکارێکی دەوڵەمەند، یان تێکەڵەی هەموو ئەمانەی باسکران. هەمیشە ئەو نەخۆشخانانەی بە مەبەستی سەرمایەگوزاری دامەزراون، وەکو ئەوانەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، دەکەونە بەر تانەو تاشەر و ڕەخنەی توونـد، لەبەر ئەو سیاسەتە خراپەی لەهەمبەر وەرگرتنی نەخۆشدا گرتوویانەتەبەر، چونکە بەهای سیاسەتی بیمەیی، زۆر گرنگترە لایان لە

دەستنیشانکردنی نەخۆشی و پێویستییە پزیشکییەکان. گەڕان بە دوای توانا وگرتنەبەری شێوازی کار وپیشە لە خەسڵەتە زۆر جیاکارەکانی بەنزیکی هەموو نەخۆشخانەکانی سەردەمە. لەسەدەی نۆزدەدا ترس لەسەرچاوەی دەرامەت لە ئەنجامی نەخۆشییەکی درێژخایەندا، نائارامی و دڵەڕاوکێی سەرەکی بوو لە ناو چینی کرێکاردا، ئێستا نەخۆشییە هەڵپروکێنەکان کە پێویستی بە مانەوەیە لە نەخۆشخانە بۆ ماوەیەکی درێژ بۆ ئەو نەخۆشانەی بیمەیەکی پێویستیان نییە، لەجیاتی ئەوەی هەست بە ئارامی وخۆشبەختی بکەن مادامەکی تەندروستییان باشە، مانەوەیان مایەی ترس و دڵەڕاوکێیە لە نەخۆشانە، چونکە فاتورەی مانەوەیان لەنەخۆشخانە پێویستی بە خەرجێکە کە نییانە.

دۆزینەوە تەکنۆلۆجییە نوێیەکان، هەروەها فشارە داراییەکان تێکڕایی ماوەی مانەوەی نەخۆشیان لە نەخۆشخانە کەمکردەوە، تەنانەت لە دوای ئەنجامدانی نەشتەرگەری گەورەش نەخۆش زۆر بەخێرایی لە نەخۆشخانە دەردەکرا، کەئامانجی ئێستای کاری نەشتەرگەرییە. بەڵگەیەکی پزیشکی ئاراستەکراو هەیە ڕەوایەتی ئەو بۆچوونە دەسەلمێنێ، چونکە بەپێی ئەو بۆچوونە ئەگەری تووشبوون بە جەڵدەو برینی سەرجێگە و پووکانەوەی ماسوولکە کەمدەبێتەوە، بەڵام ئەو ستراتیجە پشت بە لۆجیکی ئابووری دەبەستێت، مەبەست کەمکردنەوەی ئەو ماوەیەیە کە نەخۆش لە نەخۆشخانە بەسەری دەبات. ئەو ماوەیەی نەخۆش لە پێناوی دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکەدا لە ڕابردوودا لە

نەخۆشخانە دەمایەوە، ئێستا ئەو ماوەیە خراوەتە سەر کلینیکەکانی دەرەوە.

ئەو کەموکورتییانەی لە نەخۆشخانەدا هەبووە، ئێستاش هەر ماوە، چونکە سێ تایبەتمەندیی دیاریکراو هەیە دەستبەردار بوونی کارێکی مەحاڵە، ئەوانیش دەستنیشانکردنی پێشکەوتووی نەخۆشی، چاودێری دۆخە کتوپڕەکان و کرداری نەشتەرگەرییە. دەستنیشانکردنی نەخۆشی ئەو تایبەتمەندییەیە کە نەخۆشخانە فەرەنسییەکانی لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا تا ئێستا پێی جیادەکرێتەوە، بە هۆکاری جیاواز. تا ئێستاش ڕۆیشتن بۆ نەخۆشخانە بۆ ئەنجامدانی چەند پشکنینێک لەسەردەمی ئێستادا ئەزموونێکی بەربڵاوە. زانست و تەکنۆلۆجیا لەو پشکنینانەدا یەکدەگرنەوە، وەکو: قەستەرەی دڵ بۆهەڵسەنگاندنی فرمانەکانی دڵ، یان وەرگرتنی سامپڵێک لەجگەر یان گورچیلە بە مەبەستی پشکنینی ڕیشاڵە شانەییەکانی ئەو بەشانە لە ژێر گەردبیندا، یان بەکارهێنانی شەپۆلەکانی سەرووی دەنگ بۆ چاودێری کردنی گەشەی کۆرپەلە، لە کاتی سکپڕیدا، یان گرتنی تیشکی بڕگەیی ملیمیی بە ئاسۆیی یان ستوونی CAT scan و هەروەها وێنەگرتن بە ئامێری لەرەی موگناتیسی MRI ئەم دوو ئامێرە بۆ وێنە گرتنی بەشە شاراوەکانی ئەندامەکانی جەستەیە. ئەم دوو تیشکە پشت بە پرەنسیپە تەکنۆلۆجی و زانستییە جیاوازەکان دەبەستێ، جۆری یەکەمیان لە ناوەوە وێنەی جەستە لەڕێگەی زنجیرەیەک وێنەوە دەگرێت و لەڕێگەی کۆمپیوتەرێکەوە هەموو پێکەوە خشتەیی دادەنێت،

بەلام جۆری دووەمیان بوارێکی موگناتیسی زۆر بەهێز بەکاردێنێ، شەپۆلە لەرەلەرێکی تیشکۆیی کۆنترۆڵی دەکات.

هەردوو تەکنیکەکە لەزۆر ڕووەوە هاوشێوەن، هەردوو داهێنانەکە خەلاتی نۆبڵیان وەرگرتووە، هەریەکەیان وێنەی سێ ڕەهەند 3D ی ڕوون بۆ شانە نەرمەکانی جەستە دەگرێت زۆر ڕوونتر لە تیشکی ئێکسی ئاسایی، هەردووکیان گۆڕانکارییەکی ڕیشەییان لە دۆزینەوەی نەخۆشی وچارەسەرکردندا ئەنجامدا، بوارییان ڕەخساند لەشوێنە داواکراوەکان پارچەی بچووک لەڕێگەی نیدڵی تایبەتەوە بۆ پشکنینی بایۆپسی وەربگیرێت، لە شانە نەرم و ڕەقەکان، کەپێشتر لەڕێگەی نەشتەرگەریی بەرفراوانەوە ئەنجام دەدرا، بەلام هەردوو ئامێرەکە خەرجی دروستکردن و بەکارهێنان و چاککردنەوەی زۆر گرانە. لەبەر ئەوەی زیانی لەرەی موگناتیسی زۆر نزمە لەسەر نەخۆشەکان، هەروەها وێنەکانی بۆ بەشە ڕیشاڵییە نەرمەکان زۆر ڕوونترە، بۆیە تیشکی موگناتیسی MRI جێگەی تیشکی ئێکسی برگەیی CT-scan ی گرتەوە، بەلام هەردووکیان لە ١٩٨٠ ەوە بوونە هێمای هێزی پزیشکیی نوێ کە تەکنۆلۆجیاو بودجەکەی، پاڵنەری بوون. شانبەشانی لێزەر، کێبڵی ڕیشاڵی (لە بەستنەوەی کۆمپیوتەر و ئینەرنێت و هاوشێوەکانی)، لەگەڵ کۆمەڵێک داهێنانی تری نوێ، ئەم تەکنیکانە سیمای کاری پزیشکییان لە نەخۆشخانەکاندا گۆڕی، چوارچێوەی کاری پزیشکییان بەرفرەوان و چالاکتر کردەوە، بەلام تا ڕادەیەکی زۆر نرخی چاودێری پزیشکی لەسەر نەخۆش گران کەوت.

تایبەتمەندیی دووەمی پزیشکی لە نەخۆشخانەدا، چاودێری کوتوپڕە. ئەم چاودێرییە تەنها تایبەت نییە یان بەشێک نییە لە پزیشکی سەربازی بەڵکو لە کاروباری مەدەنیشدا پێویستە وەکو ڕووداوەکانی هاتووچۆ و برینی چەقۆ، تفەنگ، سووتاوی و ئەو مەترسییانەی بێ ئەژمارن و کۆمەڵگەی نوێ ئەیان ورووژێنێ. دیاردەی تیرۆریزم ئەو پسپۆرییەی دەوڵەمەندتر کرد. لە جەنگی جیهانیی دووەمدا جیهان خۆی ئامادەکرد لەڕیزی خەڵکی سیڤیلدا، ڕەفتار لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری قوربانیدا بکات، ئێستاش پلانی هاوشێوە دادەنێت بۆ هەڵسوکەوت کردن لە گەڵ کارەساتە بەرفراوانەکاندا، ئەو کەسانەی قوربانیێ ڕووداوەکان ونەخۆشییە کوتوپڕەکان بوون هەمیشە بەشێک بوون لە بەرپرسیارێتی نەخۆشخانەکان.

هێواش هێواش لە نەخۆشخانەکاندا، شوێنی تایبەت دامەزرا بە ئامانجی چاودێری کردنی نەخۆش یان تووشبووە کوتوپڕەکان. دوای ئەوەی نەشتەرگەرییە گەورەکان لەئەنجامی داهێنانی پاکوخاوێنی پێش نەشتەرگەری و پاکژی بەمادەی کیمیایی دوای نەشتەرگەری کە لیستەر هێنایە کایەوە، ژووری بە ئاگاهێنانەوە خرایە سەر هۆڵی نەشتەرگەری، هەروەها پەرستاری تایبەت بە چاودێری نەخۆشەکانی نەشتەرگەری خرایەسەر دەستەی کارمەندانی نەخۆشخانە. لەسەدەی بیستدا توانرا چاودێری فشاری خوێن و نیشانە زیندووەکانی تر بکرێت. لەگەڵ داهێنانی شلەمەنییەکان لەڕێگەی دەمارەوە، تەکنیکی خوێن گواستنەوە لە ساڵەکانی نێوان هەردوو



**وێنەی (٢٣) زۆر بەخێرایی تیشکی ئێکس لەهەردوو بواری دەستنیشانکردنی نەخۆشی و چارەسەرکردندا وەکویەک بەکارهات، ئەم وێنەیە کاتی چارەسەرکردن بە تیشکی ئێکس لە ساڵی ١٩٠٢ پیشان دەدات، هیچ وەسیلەیەک بۆ خۆپاراستن لە تیشک لەدەوروبەردا بەدیناکرێت وەکو دیواری قورقوشم و بەروانکەو بەربەستی قورقوشم، تەنانەت پزیشکەکە پارێزراو نییە، تەنانەت سەدرییەی سپی ئاساییشی نەپۆشیوە، کە هێمای پیشەکەیەتی.**

جەنگی جیهانیدا، چارەسەری کاریگەرییە لاوەکییەکانی نەشتەرگەری زیادیان کرد. لە ساڵی ١٩٥٠ بۆ چاودێریی بەردەوامی لێدانەکانی دڵ، تەکنۆلۆجیای مۆنیتەری لە ژووری چاودێریی وردا بەکارهات، وەکو باوە نەخۆشییەکانی دڵ وەکو نۆرە دڵی وەکو دۆخێکی کوتوپڕ تەماشاکرا، یەکەی تایبەت بۆ چاودێریی ورد لە دۆخە

مەترسیدارەکاندا دروستکرا. ئەم یەکانە شوێنێکی ئارام نەبوون بۆ نەخۆش یان "ستافەکە". لەساڵی ١٩٧٠ گفتوگۆی جدی کرا لەسەر ئەوەی باشتروایە نەخۆشی دڵ لە ماڵدا بمێنێتەوە، تەنها بە مەبەستی پشوودان نەک زیاتر، یان بچێتە نەخۆشخانە؟ ئەوەی یەکەی چاودێری وردی پێ جیادەکرێتەوە ئەوەیە دەتوانێت کێشەی نارێکی لێدانەکانی دڵ کۆنترۆڵ بکات (کە هۆکارێکی سەرەکییە بۆ مردن، لە قۆناغە مەترسیدارەکانی بوونی نەخۆشی ماسولکەی دڵدا myocardial )، جگە لەوە تەکنیکەکانی بووژانەوەی نوێی دڵ، سەرەڕای ژینگە نامرۆڤانە و کولفە زۆرەکەی، گەرەنتیدا هەر بەردەوام بێت. لە ڕوویەکی ترەوە یەکەی چاودێری ورد چارەسەری ئەو کەسانەی دەکرد کە تووشی جەڵدەی مێشک دەبوون، هەروەها بوورانەوەی شەکرە و دۆخەکانی تر کە لە چاودێریی ورددا چارەسەر دەکرێن.

نەشتەرگەریی مۆدێرن شوێنێکی گرنگی لە ناو نەخۆشخانەدا گرتووە، ئەو دۆخانەی بەلای کەمەوە پێویستیان بە کاری نەشتەرگەری بێت، ڕیزێک پشکنینی تریان بۆ دەکرێت لای پسپۆرانی تیشک و نەخۆشییەکانی دڵ و کۆئەندامی هەرس و پسپۆرەکانی تر کە پەیوەندییان بە نەشتەرگەرییەوە نییە، هەندێجار لەڕێگەی بەکارهێنانی دەستوپەنجەوە، پشکنینەکان ئەنجام دەدرێن، بەڵام هێشتا پسپۆری نەشتەرگەری پێگەیەکی باڵای لە هەرەمی پزیشکیدا هەیە. ئەگەر خەڵاتی نۆبڵ پێوەر بێت بۆ داهێنانە پزیشکییەکان، ئەوا بەشی نەشتەرگەری شایانی لەوە زیاترە، بەتایبەتی لەسەردەمی ئێستادا، لە قۆناغەکانی پێشوودا،

تیۆدۆر کۆخەر[٧٤] (١٨٤١-١٩١٧) خەلاتی نۆبلی وەرگرت لە بواری نەشتەرگەریی گلاندی دەرەقیدا، هەروەها ئەلیکسیس کاریل[٧٥] (١٨٧٣-١٩٤٤)، پێشڕەوی دووریینەوەی موولوولەکانی خوێن بوو، لەڕاستیدا بەرامبەر توێژینەوەکەی دەربارەی چاندنی شانەکانی جەستە ئەو خەلاتەی وەرگرت. هەروەها چارلز هۆگینز[٧٦] (١٩٠١-١٩٩٧) بەڕەگەز کەنەدییەو پسپۆری میزو میزەڕۆیە، وەکو ڕێزلێنانێک بۆ کارەکەی کە سەلماندی وەرەمی پرۆستات پەیوەندیی بە هۆرمۆنەکانەوە هەیە، هەمان خەلاتی لە ساڵی ١٩٦٦ وەرگرت، ئەم دۆزینەوەیە چارەکە سەدەیەک پێش خەلاتەکەی بوو. پزیشکی پورتوگالی ئەنتۆنیۆ ئیگاس مۆنیز[٧٧] (١٨٧٤-١٩٥٥) وەکو ڕێزلێنانێک بۆ داهێنانەکەی بۆ کردنەوەی بەشی پێشەوەی ناوچەوان لە ساڵی ١٩٤٩ هەمان خەلاتی نۆبلی وەرگرت، بەلام دواتر دەرکەوت ئەم خەلاتە تا ڕادەیەک شەرمئامێز بووە، لەبەرئەوەی هەندێجار نەشتەرگەرییەکانی بوونەتە هۆی مردن. لەڕووی خزمەتی مرۆییەوە نەشتەرگەری ئێسکی بەریتانی جۆن چارنلی[٧٨] (١٩١١-١٩٨٢) شایانی خەلاتی نۆبل بوو، لەبەرئەوەی پێشڕەو بوو لە لە تەکنۆلۆجیای گۆڕینی جومگەی ڕان و پێینەدرا. ساڵی ١٩٥٦ قەستەرەی دڵ چەند کەسێکی کۆکردەوە بۆ خەلاتی نۆبل، بەلام هیچ یەکێک لەوانە پسپۆری نەشتەرگەری

---

74 Theodor Kocher.

75 Alexis Karrel.

76 Charles Huggins.

77 Antonio Egas Monis.

78 John Charnley.

نەبوون، ئەمەش جەخت لەوە دەکاتەوە، کاری نەشتەرگەری لە ئێستادا ئەو پزیشکانە ئەنجامی دەدەن کە پسپۆری نەشتەرگەری نین.

لە نەشتەرگەریی مۆدێرندا تاکە خەلاتێک بەخشرابێت، بەخشراوەتە سێ پێشڕەوی چاندنی ئەندام کە لایەنێک لە لایەنە گرنگەکانی نەشتەرگەریی هاوچەرخە، کە ئەویش بڕێکی زۆر لە توێژینەوەی لەخۆگرتبوو دەربارەی بەرگریی بنەڕەتی بەمەبەستی زاڵبوون بەسەر جەستەدا کاتێک جەستە مەیلی ڕەتکردنەوەی ئەو بەش و ئەندامانەی هەیە کە بە "نامۆ" دەیانبینێت. ئێستا بەشێوەیەکی ڕۆتینی گورچیلە ودڵ وجگەر دەچێنرێت (لەلایەن ئەو کەسانەی دوای مردنیان دەیبەخشن، یان کەسێک بە ویستی خۆی لە دوو گورچیلەی ساخ یەکێکیان دەبەخشێت) ڕەنگە لە وەسفێکی وردی چاندنی ئەندامەکاندا بە موجیزەیەکی زانستی و نەشتەرگەری دابنرێت، بەلام لە هەمان کاتدا هێمای کێشەیەکی نوێیە لە چارەسەری تەندروستیدا. ئەو کەسەی ئەندامی جەستەی یەکێکی تری پێدەبخشن، وەرگر دەبێت بە درێژایی ژیانی پەیوەندی لەگەڵ ئەو لایەنە پزیشکییانە نەبچڕێت کە چاودێری دەکەن، لە هەمان کاتدا دەبێت بۆ ماوەیەکی زۆر ئەو دەرمانانە بە کار بێنێت کە کار لەسەر بەهێزکردنی بەرگری لەشی دەکات، ئەمەش جێی داخە کاریگەری لاوەکی خراپ لەسەر وەرگر بە جێدێڵێ، بەخشەر توانای تووشبوونی بە هەوکردن زیاد دەکات. لە هەمووی ترسناکتر ئەوەیە گۆڕینی ئەندامەکانی جەستە لە لایەن بازاڕی ڕەشەوە کۆنترۆڵ دەکرێت، ئەو کەسانەی هەژارن و تووشی نائومێدی دەبن لە ولاتانی تازە

پێگەیشتوو، ئەندامەکانی جەستەی خۆیان دەفرۆشن تا لە وڵاتە دەوڵەمەندەکاندا بەکاری بێنن.ڕاستە نەخۆشخانەکان ژیانی مرۆڤ ڕزگار دەکەن، تائێستاش سەنتەری فێرکاریی پزیشکی و توێژینەوەی کلینیکی گرنگیی خۆی هەیە، بەڵام تووشی کێشەی ستراکچەری مەترسیدار بوون، چونکە سەرمایە کێشەیەکی هەمیشەییە بۆ کەرتی تەندروستی، هەرچەندە زۆرجار بە وتار کاری خێرخوازی دەکەن و لە خزمەتی خەڵکدان، بەڵام لە لایەن دامەزراوە ئاڵۆزەکانەوە بەڕێوە دەبرێن، ڕاستییەکان شتێکی ترن، بەرگری کردنی دەرمانە دژە تەنەکان لەلایەن بونەوەرە وردە زیندووەکانەوە کە دەبنە هۆی نەخۆشی ئەمڕۆ شتێکی زۆر بڵاوە، بەڵام ژینگەی نەخۆشخانە کە دەوڵەمەندە بەو دژە تەنانە، دەبێتە مەیدانی گەشەکردن و ئاشکراکردنی ئەو دیاردەیە. ئەم بەرگرییە کاتێک ڕوودەدات کە زیندە تەنە وردەکان جیناتی خۆیان دەگۆڕن، بەو کارە تایبەتمەندییەکیان تیا دروست دەبێت، دەتوانن بەرگری دژە تەنەکان یان دەرمانەکان بکەن. بەو شێوازەی کە داروین باسی دەکات، بەو تایبەتمەندییە بۆ ماوەییە لە لایەن زیندە تەنەکەوە هێزێکی پێدەبەخشیێ کە بتوانێت گەشە بکاو بڵاوبێتەوە سەرەڕای بوونی ئەو دەرمانە دژە لە نەخۆشخانەکاندا، میکرۆبە هێشووییەکان staphylococcus بەکتریایەکی بەربڵاون ودەبنە هۆی تلۆقەیەک لە هەوکردنی.مەترسیدار، پێشتر بە پەنسیلین ئەم بەکتریایە چارەسەر دەکرا، کە بە دەرمانە موعجیزەکە لەساڵی ١٩٤٠ ناوی دەبرا. بەڵام زۆر بە خێرایی بەکتریاکە توانی خۆی لەگەڵ ئەو دەرمانە بگونجێنێ و بەرگریی بکات، لەگەڵ گەشەکردن و پێشخستنی دەرمانەکەو دروستکردنی

بەشێوەی جیاواز ئەویش خۆی دەگۆڕی وبەرگریی زۆربەی ئەوانەشی دەکرد. ئێستا ئێمە بە پیتی سەرناوی MRSA دەیناسینەوە، واتە (بەکتریای هێشوویی بەرگریکەری میتیسیلین)[79]. ئەم کێشەیە کێشەیەکی مەترسیدارە لە نەخۆشخانە و لە ناو کۆمەڵگەش، چونکە بەردەوام جوولەیەک هەیە لەنێوان نەخۆشخانە و تەواوی جیهاندا. هۆکاری یاریدەدەر بۆ مەلاریا، سیل، وڤایرۆسی HIV ، هەموو ئەمانە دژی زۆرێک لە شێوازی چارەسەرە ئاساییەکان بەرگری دەکەن، بۆیە ئەم نەخۆشییە جیهانییە گەورانە تەواو زاڵ بوون. نەخۆشخانەکانِ هۆکاری ئەو دیاردەیە نین، بەڵکو ئەم دیاردەیە دەستکردی مرۆڤە، بەلام هۆکارەکانی نەخۆشی کە دژایەتی دەرمان دەکات، ئێستا زۆر بەربلاوە، تەنانەت هەندێجار نەخۆشخانە نازناوەکەی خۆی لە یاد دەکات کە "خانەی چاکبوونەوە" بێت، دەگەڕێتەوە سەر نازناوە کۆنەکەی "دەروازەکانی مەرگ."

**پزیشکی لە کۆمەڵگەدا: تەندروستیمان لە دەستی خۆماندایە**

لەسەدەی نۆزدەدا لە هەموو ئەوروپای ڕۆژئاوا داواکارانی تەندروستی گشتی بەشێوازی جیاجیا ژێرخانێکی سەرەکییان دروستکرد، ڕێزی ئایدیۆلۆجیا نەتەوەییە هەمەجۆرەکانیان دەگرت. وەکو بینیمان ئەو بزووتنەوەیە بە ڕادەیەکی زۆر چالاک بوو دوای ئەوەی زۆر باش لە

79 Meticillin Resistant Staphylococcus Aureus.

هۆكارەكانی نەخۆشی گەیشت و ئەو ژێرخانە تەندروستییە گرنگی خۆی هەبوو.

ئەوانەی لە بواری تەندروستیدا كاریان دەكرد (بەرپرسە پزیشكییەكانی تەندروستی، شیكەرەوەكانی ئاوو خۆراك، پشكنەرانی تەندروستی، كارخانەكان، پشكنەرانی مەوادی بیناسازی و سەردانی تیمەكانی پەرستاران) و دەستەی ڕێكخەرانی گەشەكردن بۆ دەسەڵاتی جێبەجێكردن، هەموو ئەمانە زۆر پێویستن بۆ ئەو چاكسازییانەی حكومەتی ناچاركردووە، زیاتر هەست بە بەرپرسیارێتی بكات. وا پێویست بوو تەندروستی گشتی شایانی ناوەكەی خۆی بێت، هەموو ئەندامێكی كۆمەڵگە سوودی لێ ببینێ. بە گشتی مەسەلەكە بەو شێوەیە بوو، بەڵام گروپە لاوازەكان- هەژاران، منداڵان، بەتەمەنەكان و ژنانی دوو گیان، كە سوودمەند بوون لە بواری تەندروستی، زۆر جار بە ئامانج دەگیران، دیارە ئەم خزمەتە تەندروستییە بەو توێژانە یەكێ بوو لەو سیفاتە چاكەخوازییەی لە كۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستدا بواری تەندروستی گشتی بەخۆیەوە دەبینێت، یەكێ لەمێژوونووسەكان دەڵێت جەنگ لە بەرژەوەندی منداڵی ساوا و منداڵانی بچووكدایە، چونكە باوكان لەڕێگەی سەربازییەوە مووچەیەكیان دەبێت بۆ مناڵەكانیان بەسوودە. جەنگی پەیوەندیدار بەو مەسەلەیەوە جەنگی بۆیەرە[٨٠]، بەڵام ئەم جەنگە دوودڵییەكی زۆری لەگەڵ

---

٨٠ جەنگی بۆیەری دووەم یان جەنگی بۆیەر، یان جەنگی ئەنگلۆ-بۆیەر، یان جەنگی خوارووی ئەفەریقیا كێشەیەك بوو لە نێوان هەردوو ئیمپراتۆرییەتی بەریتانی و هەردوو كۆمارەكەی بۆیەر دەربارەی

خۆیدا هێنا، چونکە زۆربەی ئەوانەی بە سەرباز کران لەگەڕەکە هەژارنشینەکانەوە هاتبوون، بەهۆی نەخۆشییەوە لە خزمەتی سەربازی دەرکران، چونکە ترسی ئەوە لە ئارادا بوو، بەریتانیا نەتوانێ بە سەربازی نەخۆش پارێزگاری لە ئیمپراتۆرییەتەکەی بکات، ئەمەش دەرەنجامێکی پەسەندکراو نەبوو، چونکە دەوڵەت خۆی بەرپرس بوو لەو نەهامەتییەی بەسەر تەندروستی و لەشولاری گەلەکەیدا هاتووە. ترسێکی لەم شێوەیە بزاوتی تەندروستی گشتی جۆشدا تاکو وڵاتە ئەوروپییەکان هانبدات وەچە بخەنەوە. تەنانەت تارمایی توانەوەی نەژادی لەئارادابوو (ڕەچاوی ئەوەشیان دەکرد ڕێژەی لە دایکبووان لە ناو چینی پرۆلیتار وهەژاراندا زیاتر دەبێت لە چینە مامناوەندە پتەوەکە) بزوتنەوەی تەندروستی گشتی هانی باشترکردنی بنەچە و نەوەیەکی بەهێزیان دەدا.

هەمیشە تەندروستی گشتی ئاراستەیەکی ژینگەیی هەیە، ڕێنماییەکانی بەم شێوەیەیە : خۆتان لە پیسی ڕزگار بکەن، لە قەرەباڵغی دوورکەونەوە، لەڕووی مۆراڵیەوە دەبێت خۆت پاکوخاوێن ڕاگری وبا جل وبەرگت پاکوخاوێن بێت، ئەو کاتە گەلێکی تەندروستترت دەبێت، هەوڵ بدە ئەو دروشمە کۆنە کاڵبکەیتەوە کە تەرکیزی کردۆتە سەر تایبەتمەندییە بۆماوەییە خراپەکان، ئەو سیناریۆ تازە نەخوازراوەی گوایە وڵاتە ڕۆژئاواییەکان ناتوانن بەردەوام بەسەر جیهاندا زاڵبن هەوڵی گۆڕینی بدە، لە زۆربووندا وەچەو نەوەی خراپ ڕاگرن. هەروەکو ئاشکرایە جوڵانەوەی باشکردنی وەچە لە ئەڵمانیای نازیدا گەیشتە لووتکە. بیرکردنەوەی نازییەکان

---

دەسەڵاتی ئیمپراتۆری بەسەر خوارووی ئەفەریقیادا لە ۱۸۹۹ تا ساڵی ۱۹۰۲. وەرگێڕ

سـەبارەت بە چارەنووسـی نەژادی و ڕیشـەکێش کردنـی قەرەج و جووەکان و دەستەو گرووپە تەفروتوونا کراوەکان کە بەڵگەی بەربەرێتی وئەوپەڕی دڕندەیی نازییەت بوو بۆ ئەم مەبەسـتە بـوو. ئایـدۆلۆژیای نـازییەت بیروبـاوەڕێکی تەواو دۆگما پاڵنەری بوو. بەڵام ئەوەی مـایەی گاڵتەجاڕی بـوو، باسـی هەوای پـاکژو وەرزشـی سیسـتماتیک بـوو بـۆ پاراستنی تەندروستی لەش، باوەڕیان وابوو کهول و جگەرە زیـان بەتەندروسـتی دەگەیەنـن، باسـی زۆر ڕێـگەی تریـان دەکرد کە پەیوەندیی بە ستایلی ژیانەوە هەبوو، زۆربەیـان شایسـتەی بەدواداچـوون نـین

نازییەکان ئەوپەڕی زیادڕەوییان لە هەرەمی ڕەگەزپەرستیدا ئەنجامـدا، لەو مـاوەیەدا ڕاسیزم لەوپەڕی بەرفراوانیـدا بـوو. لەکاتێکـدا لە وڵاتە پێشـکەوتووەکاندا کـۆنترۆڵ کـردن و چـاودێری کردنـی تەندروسـتی گشـتی کـارێکی گرەنتیکـراو بـوو، بەڵام لە شکسـت هێنانـدا خـراپ دەشـکایەوە، دیـاردەی بـزووتنەوەی تەندروسـتی گشـتی کـۆن لە وڵاتە تـازە پێگەیشـتووەکاندا هێشـتا بەدیـدەکرێت. گومـانی تیـانییە زۆر شت گۆڕاوە بەڵام ئەو کێشـانەی لەئێسـتادا وڵاتە هەژارەکان بەدەسـتییەوە دەنـاڵێنن، لە سـەدەی نـۆزدە لە ئەورووپـا لەسـەردەمی ئیـدوین چادویـک وئەوانـی دیـدا کە خوازیـاری تەندروستی گشتی بوون بەرەنگاری شتی وا نەبوونەتەوە. مەسـەلەی مردنـی دایـک ومنـداڵ ، نەخۆشـییە درمییەکـان، هەژاری و خراپـی دۆخـی پاکوخـاوێنی، هێشـتا بەردەوامـی هەیە. لە کاتێکدا ڕۆژئاوا دژی قەڵەوی و نەجووڵان بەهـۆی شـێوازی ژیـانەوە دەجەنگـێ، کەچـی زۆربەی دانیشـتوانی جیهان بەدوای خۆراکی پێویسـتدا ئەودانن تا سکی خۆیانی

پێ تیژ بکەن، هێشتا پیادەکردنی سیستەمی تەندروستی کۆن لە زۆر ولاتدا ڕەواجی هەیە، چادوێک باوەڕی وابوو ئاوی پاک وئامادەکاری بۆ ڕزگاربوون لە پاشەڕۆی مرۆڤ، زۆربەی کێشەی نەخۆشییە پیسەکان چارەسەر دەکات، بیرۆکە تەندروستییەکانی ساکاربوون، بەلام ئامانجەکانی مایەی سەرسوڕمان بوون و تائێستاش لە زور ولاتدا لەسەر ئاستی جیهان بە دینەهاتوون.



وێنەی (٢٤) لە سالی ١٩٣٠ پشکنین بە تیشکی ئێکس بۆ قەلاچۆکردنی نەخۆشی سیل دەست پێشخەرییەکی نەگۆڕی تەندروستی گشتی بوو، ئەم ترامە لە گلاسکۆ لە ١٩٥٧ ، وێنەیەکی تیاترۆیی لە گەشتێکی زەمینی هاوچەرخ دەخاتە پێشچاو، پشکنین بە تیشکی ئێکس لە کردەیەکی داوێن پاکیدا دەخاتەڕوو (جلەکانت دامەکەنە، لەسنوورێکی ئاسان وخێراو نهێنی دایە).



IF YOU FIND

**DIRT**

AT THE BOTTOM OF YOUR **MILK JUG**

TELL YOUR

**Medical Officer of Health**

AND COMPLAIN TO YOUR

**MILKMAN.**

*Health Slogan Lantern Slides.*

(٢٥)شیری پیس سەرچاوەیەکی ئاشکرای بلاوبوونەوەی نەخۆشیی سیل بوو پێشئەوەی پرۆسەی پاستۆریزە (کولاندنی شیر)، ببێتە زۆرەملێ. باسی هەندێ سەرچاوەی شاراوەی تری مەترسیدار لەم سلایدە چراییە لە ١٩٢٩ دا هاتووە، تەواوی خەڵک هاندەدات، هاوبەشی لەو بەرپرسیارێتییەدا بکەن، بەوەی هەر گازندەیەکیان لەشیر فرۆشەکان هەبوو، هەواڵ بگەیەننە لایەنە بەرپرسە تەندروستییەکان.

هێـزە ئیمپریالییەکـان هەنـدێ دەسـکەوتیان لەبـواری تەندروستی گشتیدا هەبوو لەو وڵاتانەی لەودیوی دەریاوە داگیریـان کردبـوون، بـۆ نمـوونە بەریتانیـا لەهیندسـتان، لەڕاسـتیدا گرنگیـی زۆری بە کـۆلێرا و مەلاریـا دا، هەریەک لەم نەخۆشـییانە تـایبەت نەبـوون تەنهـا بە نـاوچەی هێڵـی گەرمـی "ئیسـتیوائی"یەوە بەڵکـو هەردوو نەخۆشـییەکە لە ئەورووپادا هەبوون. بەڵام ڕۆناڵد ڕۆس[٨١] (١٨٥٧- ١٩٣٢) کە لە یەکەی خزمەتگوزاری پزیشکی هیندی کاری دەکرد، ڕۆڵی مێشوولەی ئەنۆفیلسی لە گواستنەوەی نەخۆشی مەلاریادا ئاشـکرا کـرد، هەروەهـا هـانی دامەزرانـدنی پسـپۆرییەکی پزیشکی تایبەتی لەو ناوچە گەرمەدا، تووشبوون بە مەلاریا لە ناوچە نیمچە گەرمەکان و ناوچە گەرمەکان ڕووی دەدا، بەڵام لە زۆر لایەنەوە لەگەڵ ئەو نموونەیە دەچووە پێش کە پاتریـک مانسـۆن[٨٢] (١٨٤٤-١٩٢٢) – مامۆسـتای ڕۆس، گەشەی پێدا، بۆ گوزارشـت کـردن لە تایبەتمەنـدییەکانی ئەو نەخۆشـییانەی ئەو پسـپۆرییە گرنگـی پێـدەدا، بەتـایبەت گواستنەوەی نەخۆشییەکە بەهۆی مێشێکەوە، ئینجا سووڕی ژیان و شێوازی بڵاوبوونەوەی، ئەم نەخۆشییە لەنەخۆشییە بەکترياییەکانی جیهانی کۆن زۆر ئاڵۆزترە. جگە لەوەش ئەو بـوونەوەرەی دەبێـتە هـۆی ئەم نەخۆشـییە مشـەخۆری مەلاریـا، پلازمۆدیۆم[٨٣] بـوو، نەک بەکتریـا، مانسـۆن بـاوەڕی

---

81 Ronald Ross.

82 Patrick Manson.

٨٣ پلازمۆدیۆم یان مشەخۆری مەلاریا، ئەم مشەخۆرە، تاک خانە ئەمیبییە، لەڕێگەی مێشولەی ئەنۆفیلسەوە دەگوازرێتەوە بۆ گیانەوەرە بڕبڕەدارەکان لەوانە مرۆڤ، یەکسەر تووشی خانەکانی جگەر دەبێت، لەوێوە دزە دەکاتە

پتەو بوو بەوەی کرم ومێروو ومشەخۆرەکان و چەند جۆرە بوونەوەرێکی تر، دوژمنی سەرەکیی دانیشتوانی ناوچە گەرمەسێرەکانی هێڵی کەمەرەیی گۆی زەوین. مانسۆن رێگەکەی رۆسی گرتەبەر کە لە ١٨٩٧، ١٨٩٨ رایگەیاند، بە رازیکردنی حکومەتی بەریتانی بە دامەزراندنی کۆلێجێکی پزیشکی لە لەندەن لە ١٨٩٨ و یەکێکی تر لە لیڤەرپۆل چەند مانگێک پێش ئەوە دامەزرا، کە دیراسەی ئەو نەخۆشییانەی هێڵی کەمەرەی زەوی بکەن. جگە لەوەش بەلێشاو کۆلێجی پزیشکی و پەیمانگەی تایبەتیان بە "کاری پزیشکی لە ناوچە گەرمەسێرەکان"، لەتەواوی جیهان لە پێش جەنگی جیهانیی یەکەم کردەوە.

دیارە ئامانجی ئەم کۆلێجانە راهێنانی پزیشکان بوو لەسەر ئەوەی چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ ئەو نەخۆشییانەدا بکەن کە بەرەو رووی ئاسیاو ئەفەریقا و ناوچە گەرمەسێرەکانی تری کەمەری زەوی دەبنەوە. مەسەلەکە وای دەخواست لەرێگەی کاری پزیشکییەوە ئەو ناوچانە بکەنە ناوچەی ئارام بۆ ئەوروپییەکان، تاکو بتوانن هەوڵەکانیان سەرخەن لە کۆنترۆڵ کردنی گەلانی ئەو ناوچانە تا بییان کەن بە کریستیان، شارستانی، هەروەهان بییان کەن بە بازاڕێکی بازرگانی بۆ کاڵاو شومەکەکانیان و خەڵکەکە بەتەواوی لەژێر رکێفی خۆیاندا بن. هەندێ لە

---

ناو خڕۆکە سوورەکانی خوێنەوە، خڕۆکەکان خاپوور دەکات و دەبێتە هۆی تا، کەمخوێنی، ئاوسانی سپڵ. ئەم مشەخۆرە کە دەبێتە هۆی مەلاریا لە ١٨٨٠ لەنەخۆشخانەی سەربازیی فەرەنسی لەجەزائیر لەلایەن ئەلفۆنس لاڤیرانەوە دۆزرایەوە لە ١٩٠٧ خەلاتی نۆبلی لە پزیشکی و فسیۆلۆجیا لەسەر ئەم دۆزینەوەیە وەرگرت، وەرگێڕ.

مێژوو نووسـان ئەوە ڕەتـدەکەنەوە کە ئەم هەوڵانەی دراوە بۆ خزمەتی داگیرکەران خۆیـان بێت، ئەمە سـووکایەتییە دان بەوەدا نەنرێـــــت ئەو بەرپـــــرس و حکومەتـــــانەی ئەم کاروبارانەیـان جێبەجێ کـردووە هـیچ هەسـتێکیان بەرامبەر خەڵکە ڕەسـەنەکەی ئەو ناوچـانە نەبـووە، بەڵکو ویستوویانە نـاوچەی ئـارام بـۆ سـەربازە ئەوروپییەکـان، بازرگانـان، کشــتیاران و فەرمــانبەرانی خزمەتگــوزاری شارســتانی دامەزرێنن. ئەگەر مرۆڤ بابەتیانە بۆ پاڵنەری سـەرەکی ئەو کەسانە بڕوانێت کە بەشداری کاروانی پیشـەی تەندروسـتی و هەوڵەکـــانی تـــر دەبـــن، ئەوا وەک ڕۆژی ڕوون بـــۆی دەردەکەوێ ئەم سیناریۆ وردە بە مەبەستی زاڵبوون بەسەر نەخۆشـییەکاندا، لە نـاو هەمـوو چینەکانـدا وەکـو یەک، بەلای کەمەوە بەرژەوەنـــدی تـــایبەتی کەســـەکانە، نەک خزمەتـــی مرۆڤایەتی. بە تایبەتی لە ئاسـیا، زۆرجـار ئەوروپییەکـان ئەو وڵاتانەی داگیریان کردوون و بەسەریدا زاڵبوون، توانیویـانە کولتورەکانیان دەوڵەمەند بکەن. لە ئەفەریقاش لە خـوارووی بیابـانی گەورە، کۆمەڵێ هەلـومەرجی جیـاواز هـاتە کـایەوە، دڵڕەقـی و بێبەزەیـی شـێوازی نەخۆشـییەکان لە ڕۆژئـاوای ئەفەریقـا بە دیـاریکراوی و نەبـوونی ڕۆشـنبیریی نووسـراو ئەو هەلومەرجـانەی سـەپاند. بەڵام لە گەڵ ئەوەشـدا ئەگەر ئەو هەوڵە پزیشـکی و هەوڵەکـانی تـری بـواری تەندروسـتی گشـتی پشـتگوێ بخـرێن و تەنهـا وەکـو هەوڵـی داگیرکـاریی ئیمپریـالیی ڕووت چـاوی لـێ بکرێت، ئەوا شـێواندنی ڕەوتـی ڕاستەقینەی مێژوو و زوڵمێکی گەورەیە.

پـێش جەنگـی جیهـانیی یەکەم زۆربەی کـارە "پزیشـکییە ئیســـتیوائی"یەکان لەســـەر دەســـتی هێـــزە کۆلۆنیـــالییە

داگیرکەرەکـان ئەنجامـدراون، جـگە لە پزیشـکی تەبشـیری خۆیـان و پزیشـک و کارمەنـدو پەرسـتارانیان بە ئامـانجی بڵاوکـردنەوەی پەیامی بەهـای پزیشـکیی ڕۆژئـاوایی لە گەڵ پەیـامی ئـاییني، لەوێ ئامادەییـان هەبـووە. تەبشـیرییەکان بەرپـرس بـوون لە دامەزرانـدنی نەخۆشـخانە و بـنکەی تەندروسـتی و دابینکردنـی کەرەسـتەو ئـامێرو پزیشـک و کارمەنـد بۆیـان، لە زۆر شـوێنی دونیـا، لە کاتێکـدا ئەم بزووتنەوە تەبشیرییە شوێنکەوتەی ئەو سنوورە جوگرافییە بوون کە ئیمپریالیزم شوێن پێی خۆیانیان تیا قایم دەکرد، هەنـدێ لە چالاکییەکانیـان لەدەرەوەی دەسـەڵاتی وڵاتە سـەرەکییەکەی خۆیانـدا بـووە. بزووتنەوەیەکی تەندروسـتی کۆرپەلەی نێودەوڵەتی لەسـەردەمی دروسـتبوونی کۆمەڵەی نەتەوەکاندا، دوای جەنگی جیهانی یەکەم دەستی بەکارەکانی کرد. زۆربەی کارەکانیان لەبواری تەندروستیدا تایبەت بوو بە ئەوروپـای ڕۆژهەڵات وبەشـەکانی تـری کیشـوەرەکە کەجەنـگ وێرانـی کردبـوو. هەرچەنـدە حکـومەتی وڵاتە یەککگرتوەکان دوودڵ بوو لەوەی پشتگیری کۆمەڵەکە بکات، بەڵام دامەزراوەی ڕۆکفـیلەر و ئاژانسـی نێـودەوڵەتی سـەر بەو دامەزراوەیە بەشـێوەیەکی بەرچـاو لەنێـوان هەردوو جەنـگەکەدا چـالاک بـوون. بەرپرسـەکانی ڕۆکفـیلەر سـووربوون لەسـەر دامەزرانـدنی دامەزراوەکـان لەسـەر سـتایلی ڕۆژئـاوایی (کـۆلێجی پزیشـکی، دامەزراوەی تـوێژینەوەی زانسـتی، و نەخۆشـخانە فێرکارییەکـان) لەو ناوچانەی توانای بەردەوامبوونی یارمەتی نـاوخۆیی هەبوو، هەروەها لە ئەوروپا ومەکسیک وئەمەریکای لاتینی، نـاوچەی سـەرەکیی چالاکییە نێودەوڵەتییەکانی ئەو دامەزراوەیە بـوو.

هەرچەنـدە گرنگیـدانی دامەزراوەکە بە مەلاریـا، بەلهارزیـا و کرمـی ئەنکلسـتۆما بەرپرسـەکانی دەزگـاکەی هانـدا بەرەو بەشەکانی تری جیهان بڕۆن.

دوای کۆتـایی هـاتنی جەنگـی جیهـانی دووەم، دواجـار نێونەتەوەیەتی بـوون وێنـای خـۆی لەڕێـگەی ڕێکخـراوی نەتەوە یەکگرتووەکان ورێکخراوە پاشکۆکانییەوە بەرجەستە کرد، بە تایبەتی ڕێکخراوی تەندروسـتی جیهانی. هەرچەندە ئامانجەکـانی ڕێکخـراوی تەندروسـتی جیهـانی سەرسـامکەر بوون، بەڵام کۆسـپی زۆری هـاتە پێش لە پەیوەنـدیی لەگەڵ کێشـە ئاڵۆزەکـان کـاتێ هەوڵیـدا بەرپەرچـی ئەو کێشـانە بـداتەوە؛ شـێوازی بـاو بـۆ قەڵاچـۆکردنی نەخۆشـی لەنێـوان هەردوو جەنـگەکەدا سـتوونی بـوو: لە کاتێکـدا هەنـدێ لە نەخۆشـییە تاکەکـان شـێوازی گواسـتنەوەی دیاریکراویـان هەبـوو لە چارەسـەری تەندروسـتیدا لە وڵاتە هەژارەکـان. ئـاوڵە ومەلاریـا لە ١٩٥٠ و دوای ئەوەش دوو ئامـانجی گەورەی کەمپینـی ڕێکخـراوی تەندروسـتی جیهـانی بـوون. پرۆگرامـی مەلاریـا لە کۆبـوونەوەی گشـتی WHO دا لە ساڵی ١٩٥٥ بڕیاریدا، سوود لە لە مـادەی DDT وەربگرێت، کە لە سـەردەمی شـەڕی دووەمـی جیهانیـدا لەو ناوچـانەی شـەڕی تیـا بەرپـابوو، گەشـەیان پێـدا، زۆر چالاکـانە بـۆ قەڵاچۆکردنی مێروو بەکاریان دەهێنا (بەتـایبەتی ئەسپێ) کە دەبووە هۆی گواستنەوەی مەلاریا و گرانەتا.

لەوکـاتەی ڕۆس و جـی بـی گراسـی (١٨٥٤-١٩٢٥) لە ئیتاڵیـا ڕۆڵـی مێشـوولەی ئەنۆفیلسـیان ئاشـکرا کـرد لە گواسـتنەوەی نەخۆشـی مەلاریـادا، وسـووڕی ژیـانی پلاسمۆدیۆمیان شیکردەوە، لێرەوە ئەو بیرۆکەیە سـەریهەڵدا

کە ئاسانترین چارەسەر بۆ نەهێشتنی ئەم نەخۆشییە لە ناوبردنی مێشوولەکە و سووڕی زۆربوونییەتی لە ڕێگەی ئاوەڕۆکان و ڕژاندنی زەیت بەسەر ڕووی ئاوەڕۆکاندا، وە خستنەگەڕی "تیمی قەلاچۆکردنی مێروو" بە سووڕانەوە لەو ناوچانەی زیان دەگەیەنن، بە مەبەستی نەهێشتنی نەخۆشییەکە. جگە لەوەش دەرمانی کینین توانی چارەسەری نەخۆشییەکە بکات، زۆر دەمێکە ئەوە سەلمێنراوە ئەگەر بەڕێکوپێکی بەکاربێت لە نەخۆشییەکە دەتپارێزێ. ڕۆس سێ دەیەی دوایی لە ژیانی خۆی تەرخان کرد بۆ لایەنگیری بیرۆکەی خۆپاراستن لە مەلاریا، بوودجەی تایبەتی بۆ تەرخان کرا، حیکمەتەکە لێرەدایە، هیچ شتێک وەکو ئیرادە و (پارە) لە بەدەستهێنانی ئەو ئامانجەدا گرنگ نییە.

بەبۆچوونی ڕۆس جێبەجێ کردنی پلانی ستوونی(سەرەوە بۆ خوارەوە)و بنبڕکردنی نەخۆشییەکەو تەفروتووناکردنی، دەستی هێزی کار والا دەکا، بۆی هەیە تەندروستییەکی باش گەشەی ئابووری بڕەخسێنێ، ئەمەش مەحاڵە ئەگەر نەخۆشییەکە بەربڵاو بێت، بەلای پسپۆرەکانی تری نەخۆشی مەلاریاوە، تەنها پرۆگرامی ئاسۆیی بەسوودە. ئاماژەیان بەوە کردووە، ئەگەر ئاستی بژێویی خەڵک لە ئەورووپا گونجاو نەبێت، فێرکردن و گەشەی ئابوری لە ئارادا نەبێ، ئەوا بەرە بەرە نەخۆشییەکە دەگەڕێتەوە. بیانووی ئەو پسپۆرانە سەبارەت بە مەلاریا ئەوەیە، لەو ناوچانەی ڕێژەی تووشبوون بە مەلاریا زۆرە (لە بەشێکی گەورەی ئەفەریقیا، بۆ نموونە) خەڵک لە دایکبوونەوە تا ئەو دەمەی بەتەواوی بەرگری لەشی بەهێز دەبێت، بەرکەوتەی ئەو نەخۆشییەیە، ئەگەر ئەو بەرکەوتنە

نەبێت ئەوا نەخۆشییەکە خۆی دەگۆڕێ و بەشێوەی پەتایەکی بالآتر بڵاودەبێتەوە.

وا دەردەکەوێت ئەو ڕاو بۆچوونانە بوونەتە مێژووی ڕابردوو دوای هاتنی مادەی قەلاچۆکردنی مێرووی بە مادەی DDT ، لەلایەک هەرزان بەهایە، لەلایەکی ترەوە تا ماوەیەکی زۆر دوای ڕژاندنی شوێنەوارەکەی دەمێنێت، ئەمەش موژدەیەک بوو بۆ چارەسەری کێشەیەکی پزیشکی ئاڵۆزو بەرفرەوان کە چەند بەشێکی زیان پێکەوتووی ئەفەریقا ژیانی تیا وەستابوو، نزیکەی دوو دەیە بە نزیکی تەواوی جیهان خاڵی بوو لە مەلاریا. دوای جەنگ کەمپینەکە لە ئاهەنگێکی گەشبینانەدا پەسەند کرا، بەڵام ئەو کێشانەی لەسەرەتاوە تووشی بوون، ئەو ئامێرانەی دەیاننارد دەرمانی مێروو کوژی لەگەڵ نەبوو، یان دەرمانەکە هەبوو ئامێرەکان ئامادە نەبوون، هەروەها مەشقی کارمەندە مەیدانییەکان پرۆسەیەکی قورس و لەسەرەخۆ بوو، دەرەنجامەکانیشی لە ناوچە جیاوازەکانی جیهاندا جیاوازبوون. پێشکەوتنی جولانەوەیەک لە جولانەوەکانی پاراستنی ژینگە، دەستپێکی بڵاوکردنەوەی کتێبێک بوو بە ناوی "بەهاری بێدەنگ" لە نووسینی ڕاچیل کارسۆن (١٩٦٢) سەبارەت بە کاریگەرییە هەمەلایەنەکانی دی دی تی، جولانەوەکە گوزارشتی لە نارەزاییەکانی شەستەکانی سەدەی بیست دەکرد لە بەرامبەر کەمپینی ڕێکخستنە بەرفراوانەکەی قەلاچۆکردنی مێروو بە دی دی تی، بڕی ئەو قازانجەی کۆمپانیا ئەمەریکییەکان لەسەرەتاوە کردیان دواتر گەیشتە ئەوەی دەرکەوت مێشوولەکە بەرگری پەیدا کردووە بەرامبەر مێروو کووژی دی دی تی.

سەرەتا بنبڕکردنی مەلاریا بە بێ کێشە لە ١٩٦٩ چووە پێشێ، چەند سەرکەوتنێکی باشی بەدەست هێنا چونکە تەنها تەرکیز خرابووە سەر لایەنی نەهێشتنی نەخۆشییەکە، بەڵام دواتر دەرکەوت ئەم پرۆسەیە بێ هەڵەو کەموکورتی نەبووە، کاریگەرییە خراپەکانی ئەم مادەیە بووە ئامانجی لێکدانەوە ڕەخنەییەکان، لەو وڵاتە ئەوروپییانەی بەسەر دەریای ناوەڕاستدا دەڕوانن بۆ نموونە؛ کاتێ لەگەرمەی شەڕی دووەمی جیهانیدا مەلاریا دەرکەوتەوە. لەماوەی ساڵانی کەمپینەکەدا کۆتایی هاتن بە مەلاریا لە ئیتاڵیا وئیسپانیا وپورتوگال ڕاگەیەندرا؛ ئەوەی مایەی سەرنجە لە شوێنێکی وەکو یۆنان کە ڕێژەی گەشەکردنی کەمترە لەچاو وڵاتانی تر، لە ماوەی ساڵانی کەمپینەکەدا بە نزیکی کۆتایی هێنان بە مەلاریای ڕاگەیاند، وە سریلانکا لە ئامانجەکە نزیک بووەوە، بەڵام لە هیند بە تەواوی ڕیشەکێش کرا.

بە پێچەوانەی ئەوەوە، هێشتا دەستپێشخەرییەکەی ڕێکخراوی WHO بۆ قەڵاچۆکردنی نەخۆشی ئاوڵە بە سەرکەوتنی پزیشکیی نوێ دادەنرێت، ئەو کاتە جاڕی سەرکەوتنەکە درا کە دوا کەیسی نەخۆشییەکە لە ١٩٧٧ تۆمار کرا، لە ١٩٨٠ ئەوە پەسەندکرا کە نەخۆشییەکە لە مرۆڤدا کۆتایی هاتووە. ئەمەش بەرهەمی نیازپاکی و هاوکاری نێودەوڵەتی بوو نەک بەرهەمی زانستی پزیشکی، بەڵام پشتبەستوو بوو بە دۆزینەوەی ڤاکسین لە کۆندا، شێوازی بەدواداچوونی کەیسەکان لە کاتی گونجاودا، دابڕین و کەرەنتینەی نەخۆش، و کوتانی بەکۆمەڵی دانیشتوان کە بەرەنگاری مەترسی بوو بوونەوە. لێرەدا چارەسەرکردن لەنێودا نەبوو جگە لە گرتنە بەری

ڕێوشوێنەکانی پشتیوانی کردن. نەخۆشییەکە بنبڕکرا چونکە سەرچاوەی نەخۆشییەکە گیانەوەران نەبوون، بەڵکو لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر دەگوێزرایەوە، ئەمەش پێویستی بە جیاکردنەوەی کەسەکان لە یەکتری و کوتانیان هەبوو. کەمپینەکە کەمپینێکی ئیداری بوو، زیاتر لەوەی تەندروستی بێت، بەڵام بەڕاستی کەمپینێکی سەرکەوتووبوو.




26. Preventative medicine played an important part in the campaigns of World War II. Here, soldiers are encouraged to take their regular doses of atebrin, the most commonly used antimalarial drug of the period. Malaria was still an important disease in the Middle East, southern Europe, and the Asian theatres of war

شێوەی (٢٦) پزیشکی خۆپاراستن ڕۆڵێکی گرنگی گێڕا لەو کەمپینانەی لە کاتی جەنگی جیهانیی دووەمدا سازدرا. ئەم بڵاوکەرەوەیە سەربازەکان هاندەدا دۆزی تەواو لەدەرمانی Atebrin وەرگرن کە دەرمانێکی باو بوو دژی مەلاریا بەکار دەهێنرا لەو ماوەیەدا، تا ئێستاش مەلاریا نەخۆشییەکی گرنگە لە مەیدانەکانی جەنگدا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و خوارووی ئەورووپا و ئاسیا.

تائێستاش کەمپینە ستوونییەکان بۆ یەک نەخۆشی سەرنج ڕاکێشن، هەندێکیان سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە، ئیفلیجی منداڵ بە نزیکی بنبڕکراوە، بۆ کرمی گینیا، کرمی کوێریی ڕووبار Onchocerciasis بە کاریگەر دادەنرێن. جگە لە ئەفسوون Glamour، خۆی لە ستراتیجی نەخۆشییە تاکەکاندا دەبینێتەوە (تەنانەت ئەگەر کارەکەی ڕۆتینی بێت)، بەوە ناسراوە چاودێری سەرەتایی بۆی گرنگە. کۆنفرانسی ئەلما ئاتا بە فەرمی ڕایگەیاند پرۆگرامی ئاسۆیی ئامانجێکی پێویستی چاودێری تەندروستیی نێو نەتەوەییە. لە جەوهەردا دانی بەو ڕاستییەدا ناوە کە بنیادنانی ژێرخانێکی پزیشکی و کۆمەڵایەتی مەرجە بۆ دابینکردنی تەندروستی گشتی و چاودێری تەندروستیی نوێ بەشێوەیەکی بەردەوام. بەدەستهێنانی ئەو ژێرخانە لەسەرەخۆیە، جیاوازی ئابووری نێوان هەژار ودەوڵەمەندەکان لەم چەند دەیەی دواییدا زیادی کردووە، دەرکەوتنی ڤایرۆسی کەمبوونی بەرگریی لەش، جەنگەکان، زنجیرەی مەلاریا، سیل و بەرگری لەش بەرامبەر دەرمانەکان، کێشەکەی ئاڵۆزتر کردووە. لەچەند دەیەی دوایی سەدەی ڕابردوودا شکستەکان زۆرتر بوون دەستکەوتەکان کەمتر، ناشتوانین کەمترین پێشبینی کۆسپەکانی ئایندە بکەین.

کێشەی وڵاتە زۆر هەژارەکان تەنها ڕەنگدانەوەی ئەو کێشانەیە کە لە ڕۆژئاوادا هەن وەکو ئالوودەبوون بە کحول، بەکارهێنانی مادەی هۆشبەر، بەرگرییەکانی سیل و ڤایرۆسی بەرگری لەش، قەڵەوی دەبێتە کێشەیەکی تەندروستی گەورە. نەریتێکی تر لە ڕۆژئاواوە گواسترایەوە

بۆ ئەو وڵاتە هەژارانە، وەکو هەرەشەو بۆمبێکی تەوقیتکراو لەچەند دەیەی داهاتوودا دەرکەوت، ئەویش جگەرە کێشانە. دەرکەوت پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆ لەنێوان شێرپەنجەی سییەکان و جگەرە کێشاندا هەیە، لە سەدەی ڕابردوودا ئەم نەخۆشییە لە وڵاتە هەژارەکاندا دەگمەن بووە، وەکو توێژینەوە ژینگەییە نوێیەکان دەریان خستووە. ئامارییەکان و پزیشکانێکی زۆر سەرنجی ئەوەیان داوە لەساڵەکانی نێوان هەردوو جەنگی جیهانیدا ڕێژەکەی بەرەو زیادبوون ڕۆیشتووە. لە ساڵی ١٩٤٠ ەوە دەرک بەوە کراوە نەخۆشییەکە یەکێکە لە نەخۆشییە نوێیەکان، سەنتەری توێژینەوەی بەریتانی دوو کەسی ڕاسپارد، کە پزیشکێک ئارەزووی وەرزشی هەبوو لەگەڵ پسپۆرێکی بواری ئامار ، لێکۆڵینەوە لە هۆکاری بڵاوبوونەوەی ئەم نەخۆشییە بکەن، پزیشکەکە ڕیچارد دۆڵ[٨٤] (١٩١٢- ٢٠٠٥)بوو، بەڵام پسپۆری ئامارەکە ئۆستین برادفۆرد هیڵ[٨٥] (١٨٩٧- ١٩٩١) بوو. لەڕووی پراکتیکییەوە گەیشتنە ئەو ئەنجامەی شێرپەنجەی سییەکان، نەخۆشییەکە سەرەنجامی دیاردەی پیسبوونی ژینگەی سەردەمی نوێیە، کە خۆی لە دووکەڵی ئۆتۆمۆبێل و ئەو قیرەدا دەبینێتەوە کە ڕێگەکانی پێ قیرتاو کراوە.

کار لەسەر دارشتنی ڕاپرسییەک دەکرێت بۆ ئەو نەخۆشانەی لە نەخۆشخانەکانی لەندەن دەستنیشانی کەیسەکانیان کراوە کە شێرپەنجەی سی یان جگەر یان ڕیخۆڵە بووە، دەرەنجامی سەرەتایی کوتوپڕ بوو بەوەی کە

84 Richard Doll.

85 Austin Bradford Hill.

جگەرەکێشـانی زۆر هۆکـار بـووە لای ئەوانەی شـێرپەنجەی سییەکانیان هەیە بێئەوەی باسی شێوەی شێرپەنجەکانی تر بـکەن، سـالّی ١٩٥٠ لێکـۆڵینەوەیەکی ئەمەریکـی لەوانەی مردوون و توێکاری بۆ لاشەکانیان کراوە ئەوەی دەرخست، ئەوانەی بە شـێرپەنجەی سـییەکان مـردوون، لەنێـو قوربانییەکانـدا جگەرەکێشـان بە شـێوەیەکی بەربـڵاو بـوونی هەبووە. بە پشتبەستن بەو دەرەنجامە پێشنیار کراوانە، دۆل و هیـڵ لێکۆڵینەوەیەکی مەیـدانییان ئەنجامـدا بۆ دەرەنجـامی چـاوەڕوانکراو، خۆشـبەختانە ٣٤ هەزار پزیشـکی بەریتـانی بەشـدارییان تێداکرد، لەبەرئەوەی پێویسـت بـوو پزیشـکەکان هەموو ساڵێک لە تۆماری پزیشکیدا گۆڕینی ناونیشـانەکەیان پێشـکەش بـکەن، فـۆرمێکی سـالآنە بـۆ ئەو کەسـانەی بە پراکتیکـی کـاری پزیشـکی پیـادە دەکەن، دۆل و هیـڵ بەدرێژایی چەنـد سـاڵ چاودێری گرووپەکانیـان دەکرد، لەو لێکـۆڵینەوەیەدا نەخۆشـی شـێرپەنجەیان بە خـووی جگەرەکێشـانەوە گرێـدا. لەبەر ئەوەی ژمـارەیەک لە پزیشـکەکان وازیـان لە جگەرەکێشـان هێنـابوو لە بەر مەترسـییەکەی (لەنێویانـدا دۆل خۆشـی) لێکـۆڵینەوەکە ئەو هەلەشـی ڕەخسـاند، بە ئامـار ئایـا مـرۆڤ بەچەنـد سـاڵ دەتـوانێ واز لە جـگەرە کێشـان بێنێـت. بەشـی دوایـی لێکـۆڵینەوەکە لە سـاڵی ٢٠٠٤ بڵاوکـرایەوە واتە دوای ٥٠ سـاڵ لە مێـژووی بڵاوکـردنەوەی یەکەم ڕاپـۆرتی لێکۆڵینەوەکە، دۆل خۆی بە هاوکاری هـاوەڵەکەی نووسـی. ڕاستوایە بڵێین ئەوە یەکەم ئەزموونی "کۆمەڵایەتی" بوو لە بواری پزیشکیدا ئەنجام درابێت، لەڕووی دیزاینەوە ئاسان

بوو لە جێبەجێ کردن و دەرەنجامەکەی کاریکی سەخت و قورس بوو، دەرەنجامەکەی لە ڕێگەی زنجیرەیەک لێکۆڵینەوەوە دوای نیو سەدە ئاشکرا کرا. بەڵگەی تر زۆرە تایبەت بە زیانە تەندروستییەکانی جگەرەکێشان، بەڵام دەتوانین بڵێین دۆل و هیل یاسای ئەو بزووتنەوە نوێیەی پێیدەڵێن "پزیشکیی ستایلی ژیان"، بە تەواوی چەسپاندیان.

بەزۆر تەمەنی ئەو گوزارشتە دەگاتە دوو دەیە، بەڵام وەکو دەردەکەوێ ماوەتەوە. گرنگترین شت لە پزیشکیی کۆمەڵگەدا چاودێری کردنە، بەستنەوەی لەگەڵ تۆمارکردنی تێبینییەکان دەبێتە هۆی دروستکردنی وێنەیەک، تاکی ئاسایی تێیدا بەشدارییەکی گەورە لە دۆخی تەندروستی خۆیدا دەکات؛ هەڵبژاردنەکانمان کاریگەریی لەسەر خۆشبەختیمان هەیە. لەسەردەمی زێڕینی پزیشکیدا لە ١٩٤٠ ەوە بۆ ١٩٧٠، باوەڕی تەواومان بەوە هەبووە پزیشکەکان چاودێری و چارەسەرمان دەکەن. لەنێوان نەشتەرگەری، دژەتەنەکان، هێورکەرەوەکان، هۆرمۆنەکان، دژە سکپڕی (کاریگەری پزیشکی لەسەر شێوازی ژیان باڵادەست ترە لە شێوازی ژیانی پزیشکی)، ڕیزێک دەرمان و چارەسەری نوێ، مۆژدەی ئەوەیان داینێ کە سەردەم، لەهەموو گۆشەیەکی دونیا سەردەمی تەندروستییە. بەڵام ئێستا هەرچەندە کاری پزیشکی پێشکەوتووترە، بەڵام متمانەمان کەمتر بووە لەئاستی؛ ئێستا دەرەنجامی زۆر ترسناک دەرکەوتووە لە ڕێگەی ئالوودەبوون بە کحول و جگەرەکێشان، بەکارهێنانی مادەی هۆشبەر، نەخۆشییەکانی کۆئەندامی زاوزێ، و قەڵەوی، خواردنی ژەمە







شێوەی (٢٧) ستایلی ژیانی پزیشکی لە ١٩٩٢ لە پۆستەرێکدا، بە دوو ئامـــانجی هاوشـــێوە دروســـتکراوە، قەڵەوی وکـــاریگەرییە زیانبەخشەکانی، زیادڕەوی لە خواردنەوەی کحولدا.

خێـــراو چەورو ســـــوێرەکان، بەرهەمە کشـــتوکاڵییە دەســتکردەکان، و چەنـد ڕەهەنـدێکی تـری ژیـانی نـوێی ئەوروپـــی. هەنـــدێ لەم ڕەفتـــارە هەڵشــــەییانە کـــۆنن هەندێکیشـیان تـازەن. پەیوەنـدی نێـوان پزیشـک و نەخـۆش گـۆڕاوە، هێـزی نەخـۆش لەوەوە سـەرچاوەی گرتـووە کە هەست بەرپەرسیارێتی دەکات.

جەخت کردنەوەی هیپۆکرات لەسەر میانڕەوی، ئەوەمـان بیـر دەخـاتەوە پزیشـکەکان لە پـێگەی پۆلیسـی ئەخلاقیـدان، ئیتر چی ئەخلاقـی بن یـان بێ ئەخـلاق بێنە ئەژمـار، مەیلی گۆڕانکارییــــــان هەیە بە جیـــــــاوازی چوارچێــــــوە ڕۆشـنبیرییەکەیان. لە سـەرەتای سـەردەمی نوێدا، نەخۆشـی سیفیلیس جۆرێک بوو لە نیشانەی شەرەف لە نێو هەندێ لە تـــوێژە کۆمەڵایەتییەکانـــدا، لەنێـــوان هەردوو جەنـــگەکەدا، خۆراکی تەندروست خواردنی بڕێکی زۆر گۆشـتی سـوور و قەیماغ و هێلکە بوو، جگەرەکێشان هێمایەک بوو بۆ ئـازادیی ژنـــان. کۆمەڵگەکـــان دەگـــۆڕێن بە هەمـــان شـــێوە ڕێنمـــاییە پزیشکییەکانیش دەگۆڕێن. هەندێ هۆکار هاندەرن بۆئەوەی وا بیر بکەینەوە، ئامۆژگـارییە پزیشـکییەکانی ئەمڕۆ باشـترن لەوانەی ڕابـــردوو، تەنـــانەت ئەو کەســـانەی باوەڕیـــان بە پزیشـــک و زانســـتی پزیشـــکی نیـــیە، هێشـــتا دڵخۆشـــن بە ســوودەکانی چـاودێری نەخۆشـییە درمییەکـان ولێکـۆڵینەوە زانستییەکان دەربـارەی بڵاوبوونەوەی پەتاکـان هەوڵـدان بۆ جیاکردنەوەی زیـان لە سـوودەکان، کـاتێ گومانت هەیە، ئەو

ئامۆژگارییەی هیپۆکرات لە گوێ بگرە، کە دەڵێ بواری پزیشکی بەزۆری لە ناوەڕاستدایە.

## پزیشکیی تاقیگە: بەردەوام موژدەی نوێی پێیە

تاقیگەی پزیشکیی بایۆلۆجی مۆدێرن، زۆر نزیکە لە هاوڵاتی هۆشیار و هاوڵاتی ئاساییەوە. زۆرجار زاناکان داوای کۆنفرانسێکی ڕۆژنامەنووسی دەکەن کاتێ باوەڕیان وایە شتێکی گرنگیان پێیە دەیانەوێ ڕای بگەیەنن، هەموو ئاژانسەکانی هەواڵ بەشێوەیەکی ڕێکوپێک هەواڵی زانستە پزیشکییەکان دەگوێزنەوە، تۆڕەکانی ئینتەرنێتیش ڕێگە بە زانیارییە پێشکەوتووەکان دەدەن، بۆ ئەوانەی بە دوایدا دەگەڕێن. هەرچەندە هۆشیاری تەندروستی نوێمان پڕ لە زانیارییە، بەڵام لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونەکان، زۆر زانیاری شاراوەو نیگەران ئامێز سەبارەت بە مەسەلە تەندروستییەکان ئاشکرا دەکەن. ڕەنگە هەمیشە مەسەلەکە بەم شێوەیە بووبێت، ڕەخنەکەی فیزیاوان و ڕۆماننووس سی.پی. سنۆ، لە هەردوو کولتوورەکە دەنگدانەوەیەکی باشی هەبوو پێش ئەوەی لە ١٩٥٩ ڕوونکردنەوەیان لەسەر بدات، سنۆ وای دەبینێت زۆربەی ئەو کەسانەی کە لە زاناکان نین، کەمتر زانیارییان سەبارەت بە بیرکردنەوە سەرەکییەکەی زانست هەیە، بە بەراورد لەگەڵ ئەو زانایانەی کە زانیارییان سەبارەت بە ڕۆشنبیری گشتیی ئەوان هەیە؛ کەواتە نەزانین لە هەموو شوێنێکە، بەڵام لە نێو زانست و بواری پزیشکیدا زووتر ماسکی ڕووی ئەوانە دادەماڵرێ، کە نازانن.

ئەگەر رێگری کرا لەوەی خەڵک وردەکارییەکان بزانن، زۆربەیان ئەوە دەزانن ئەو کردە پزیشکییەی لە سەدەی بیست و یەکدا پێڕەو دەکرێت، کاریگەرییەکی بەهێزی بە زانستی پزیشکییەوە هەیە. لە هەمووی گرنگتر دۆزینەوەی دەرمانە تازەکان، مشتومڕی بەردەوام لەسەر پرۆژەی جینە مرۆییەکان، توێژینەوەی نوێ سەبارەت بەخانە ڕیشەییەکان Stem Cell Research ، هەموو ئەمانە بوونە هەواڵی نێو شاشەکان. ڕاستە ئەم دوو دۆزینەوەیەی دوایی لەدەرەوەی گێڕانەوە مێژووییەکەدایە، بەڵام پزیشکیی هاوچەرخ بە کاریگەریی هێزی دەرمانەکان گۆڕانکاری گەورەی بەسەردا هات. ڕێکەوت لە دۆزینەوەی هەندێکیاندا ڕۆڵی بینی، بەڵام تاقیگە، ئەو شوێنە سەرەکییە بوو کە توانای چارەسەرەکانیان بۆ یەکەمجار تێدا تاقیکردەوە. تا ئێستاش لێدوانەکەی کلۆد بێرنارد بەکارە کە لەسەدەی نۆزدەدا وتی، تاقیگە میحرابی تاقیکردنەوە پزیشکییەکانە.

لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا هەندێ دەرمانی کاریگەر هاتنە مەیدانەوە، تا ئێستاش بەتەواوی هێزی خۆیان لەدەست نەداوە، وەکو ئەسپرین، فیناسیتین، هیدراتی کلۆرال و باربیتۆرات، هەموویان بەشێوەیەکی ڕێژەیی پێکهاتە کیمیاییەکەیان سادە، گونجاو ولە ڕێگەی شیکردنەوەوە، بۆ ئەو دەمە ڕێگە پێدراو بوو. ئەسپرین زۆرجار وەکو دەرمانێک باسدەکرێت، لە پێوەرە ستانداردە نوێیەکاندا دەرناچێت، چونکە دەبێتە هۆی ورووژانی گەدە و دەکرێ بۆ خۆکوشتن بە کاربهێنرێت. مایەی گاڵتە جاڕییە، کەسەلمێنرا (ئەگەر بە بڕی کەم بەکاربهێنرێت) کاریگەرە لە ڕێگری

کردن لە مەیینی خوێن، بۆ خۆپاراستن لە جەڵدەی دڵ و سەکتەی مێشک بەکار دەهێنرێت، بەکارهێنانی لەم دوو حاڵەتەدا زۆر دوورە لەو مەبەستەی لەسەرەتاوە ئەم دەرمانەی بۆ داهێنرا. کاریگەری لەسەر تاک کەمە بەلام لەچوارچێوەی گرووپی گەورەدا بە نرخە، میکانیزمی کارکردنەکەی لەسەر ڕێگری لە مەیینی خوێن تا ئەم نەوەیەی دواییش زانراو نەبوو، لە ڕاستیدا، وەکو دەرمانی دژە هەوکردن، ئازار شکێن و بۆ داگرتنی تا بەکار دەهات و بۆ ئەو مەبەستە دروست کراوە نەک مەبەستێکی تر.

لەنێوان ئەم کۆمەڵە دەرمانە و ساڵی ١٩٢٠، چەند مادەیەکی کیمیایی و هەندێ مادەی بایۆلۆجی گەشەی پێدرا، بە تایبەتی ڤاکسین و دژە سیرەم. بەلام هیچیان هاوتای ئەنسۆلین نەبوون کە زانایەکی فیزیکی گەنج دۆزییەوە، ساڵی ١٩٢١ ئەم دۆزینەوەیەی لەشێوەی لێکۆڵینەوەیەک لە بواری فسیۆلۆجیادا، خستە بەرچاو، ئەو کاتەی خوێندکاری پزیشکی بوو لە زانکۆی تۆرنتۆ. فریدریک بانتینگ[٨٦](١٨٩١-١٩٤١) زانایەکی فسیۆلۆجی بوو، بۆی ڕەخسا لەپشووی هاویندا تاقیگەیەک بکاتەوە، کاتێک پرۆفیسۆرەکەی لە پشوودا بوو. بەلام چارلز بێست[٨٧] (١٨٩٩-١٩٧٨)، خوێندکارێکی پزیشکی بوو هەر خۆی دواتر بووە پسپۆڕێکی فسیۆلۆجی ناودار، بەشداری کرد لە دابڕینی ئەو هۆرمۆنە چالاکەی کە پەنکریاس دەریدەدات. مایەی سەرسوڕمان بوو ئەو مادەیە ئاستی شەکری لە خوێنی ئەو

---

86 Frederick Banting.

87 Charles Best.

کەسانەدا دابەزاند کە تووشی نەخۆشی شەکرە بوون، بانتینگ و پرۆفیسۆر جەی.جەی.ئار. ماکلیۆد[88](١٨٧٦-١٩٣٥) ڕاستەوخۆ هاوبەش بوون لە وەرگرتنی خەڵاتی نۆبل، بەڵام دواتر لەگەڵ بێست و کیمیاگەر جەی. بی. کۆلیب[89] (١٨٩٢-١٩٦٥)بە یەکسانی بەشی خۆیان وەرگرت، جەی بی کۆلیب کە بەشداربوو لە پاکژکردنەوەی ئەو مادەیەی دەبوایە تاقیبکرێتەوە. ئەو ئەزموونە، تاقیکردنەوەیەکی نموونەیی بوو لە تاقیکردنەوە کلاسیکییە زۆر دەگمەنەکان، ئەم تاقیکردنەوەیە وەکو چارەسەرێکی بەربڵاو شایستەی ئەو خەڵاتە بو، زۆریش بەخێرایی خەڵاتەکە وەرگیرا. لە ماوەی ساڵێکدا ئەنسۆلینی بازرگانی کەوتە بازاڕەوە، بۆ ئەوانەی نەخۆشی شەکرەیان هەیە ڕەنگە بە ڕزگارکەری ژیانیان دابنرێت. ئەنسۆلین نموونەیەکی باڵا بوو بۆ هەریەکە لە پزیشکی ئەزموونگەری و چاودێری پزیشکیی نوێ؛ شەکرە کۆنترۆڵ کرا، ئەوانەشی بە هەمیشەیی تووشی نەخۆشییەکە بوو بوون پێویستیان بە چاودێری ڕۆژانە بوو. هەرچەند وەسیلەی باش بۆ پێشکەشکردنی ئەو دەرمان و ئامادەکراوە دەرمانییە جیاوازانە هەیە، بەڵام نەخۆشی شەکرە کە پشت بە ئەنسۆلین دەبەستێ، هێشتا بە کێشەیەک دادەنرێت کە تا مردن بەردەوامە، جگە لەوەش کێشەی لاوەکی تووشی نەخۆشەکە دەکات، هەر کاتێ ئەو کێشانەش دەرکەوتن پێویستە جار لە دوای جار چاودێری بکرێنەوە، هیوای چارەسەری بنەڕەتی گۆڕا بەو چارەسەرەی کە

88 J. J. R. Macleod.

89 J. B. Collib.

چاودێری پزیشکیی درێژخایەنی لەسەر بنیات نراوە، ئەو هیوایە باشترە لەوەی هیچ ئەلتەرناتیڤێک نەبێت، لێرەدا ڕاستییەکی تاڵ هەیە، ئەویش ئەوەیە جەستەی مرۆڤ ئامێرێکی زۆر سەرسامکەرە، لەگەشەی بەردەوامدایە، زۆر سەختە بواری پزیشکی بتوانێ خۆی لە قەرەی سروشتی جەستە بدات.

هەرچەندە کێشەی بەردەوام هەبوو لە کۆنترۆڵ کردنی نەخۆشی شەکرەدا، لەگەڵ ئەوەشدا ئەنسۆلین داهێنانێکی گەورەبوو، نەخۆشەکانیش هەمان بۆچوونیان هەبوو، ئەم دۆزینەوەیە ئاستی پێشبینییەکانی خەڵکیان بەرزکردەوە، چاوەڕوانی ئەوە بوون تاقیگە بتوانێ توێژینەوەی زیاتر ئەنجام بدات، ئەم چاوەڕوانییە زۆر درێژەی نەکێشا تا توانرا لەچارەسەری کەمخوێنیی پیسدا سەرکەوتووبن، دەرەنجامی ئەم دۆزینەوەیە وەکو دەرەنجامی ئەو نەخۆشانەی شەکرە سەرسوورهێنەر نەبوو کە لەدۆخی بێهۆشییەوە بە پێدانی ئەنسۆلین یان گلوکۆز چاودەکەنەوە و بەهۆش دێنەوە، بەڵام ئەنیمیا- کەمخوێنیی پیس لە ناوەکەیەوە دیارە، ئازار بەخشە، بێزارکەرە، تاقەت پرووکێنە، و لە کۆتاییدا کوشندەیە. بەڵام هاوشێوەی ئەنسۆلین بنەمای لۆجیکیی چارەسەرەکە لە ڕێگەی تاقیگەوە سەری هەڵداوە، لەڕێگەی پێدانی خۆراکەوە وەکو لەسەر سەگ تاقیگرایەوە، خواردنی بڕێکی زۆر لە جگەری ئاژەڵ بە کاڵی چارەسەر نییە، زۆربەی نەخۆشەکان خۆشیان ئەوە بە چارەسەر دەزانن، بەڵام زۆربەیان پێیانوایە جگەری کاڵ

سـوودێکی ئەوتـۆی نیـیە بەڵام هـیچ نەبـێ لە ئەنجـامی نەخۆشییەکە باشترە.

نموونەی ئەم داهێنانە تاقیگەییانەو جۆرەکانی تری وەکو دیاریکردنی گروپەکانی خوێن، کە بەهۆیەوە گواستنەوەی خوێن بێ مەترسییە، ڤاکسینە جۆربەجۆرەکان، تێگەیشتن لە سروشـتی ڤایرۆسـەکان، زانسـتی پزیشـکی لە چوارچێـوە گشتییەکەیدا هێشتەوە. دەسپێکی ئەم زانستە لە سەروەختی جەنگی جیهانی دووەم و دوای جەنگەوە بووە لەکۆتاییدا بەو شـێوەیە گەشـەی کـردووە کە ئێسـتا بەرچـاوە. دەرمانەکانی سولفا، بۆ نموونە سەلماندی دژی زۆر جۆری بەکتریا کـاریگەریی باشـی هەیە، یەکـێ لە سـوودەکانی کەمکـردنەوەی ڕێـژەی مردنـی ئەو ژنـانە بـوو کە بە تـای زەیسـتانی دەمـردن (ئەو هەوکـردنەیە دوای منـداڵبوون تووشـی ژنـان دەبێت). ئەم دەرمـانە پـێش جەنـگ گەشـەی پێدرا، (نازییەکان ڕێگربوون لەوەی دۆزەرەوەکەی گێرهارد دۆمـاک[90] (١٨٩٥- ١٩٦٤) گەشـتی سـتۆکهۆڵم بکـات بە مەبەسـتی وەرگرتنـی خەڵاتـی نۆبـڵ)، جەنـگەکە خۆیشـی سیسـتەمی داهێنـانی لە ئاسـتی جیهانـدا پەکخسـت، بـۆیە دەرمـانی سولفا ڕێگەی بۆ خۆشکرا لە دەرەوەی سنووری ئەڵمانیا دروست بکرێت. لە ساڵەکانی یەکەمـی جەنگدا ئەم دەرمـانە بەشێوەیەکی بەرفرەوان بەکارهـات، دوای کۆتـایی هاتنی جەنگ، پەنسیلین جێگای دەرمانی سولفای گرتەوە.

لە ڕاسـتیدا پەنسـیلین بە درێژایـی هەمـوو سـەردەمەکان باشترین دەرمان بووە، چیرۆکی دۆزینەوەی بەم شێوەیە؛

90 Gerhard Domagk.

ئەلیکساندەر فلیمینگ[91](١٨٨١- ١٩٥٥)، بەرێکەوت ساڵی ١٩٢٨ لە ڕێگەی کەڕوویەکەوە، لەسەر دەفرێکی پیتری[92] سەرنجیدا وەکو پەڵەیەکی کەڕوویی گەشەی کرد بەڵام بۆ ماوەی دەیەیەک هیچ گرنگییەکی ئەوتۆی پێنەدرا (چەند هەوڵێکی تاکلایەنە بە مەبەستی بەکارهێنانی لە چەرەسەرکردندا درا). لەگەڵ بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهانی، پرۆفیسۆری زانستی نەخۆشییەکان لە زانکۆی ئۆکسفۆرد هاوەرد فلۆری[93] (١٨٩٨-١٩٦٨) و تیمەکەی راسپێردران بەدوای ئەو فاکتەرە چارەسەرییە نوێیانەدا بگەڕێن کە دژی هەوکردنە بەکترییەکانە. پەنسیلین لە نێو ئەو مادانەدا بوو کە هەڵیانبژارد بە بەکارهێنانی کەرەستە سەرپێییەکان لە بارودۆخی جەنگدا، بڕێکی پێویستیان لەو کەڕووە گرانبەهایەیان جیاکردەوە، بە مەبەستی سەلماندنی کاریگەرییە سەرسووڕهێنەرەکەی. یەکەم نەخۆش چارەسەریان کرد، پۆلیسێک بوو لە ئۆکسفۆرد تووشی هەوکردنێک بوو بە میکرۆبە هیشووییەکان staphylococcus ، دوای ڕووشان و هەوکردنی بەهۆی دڕکی دارگوڵەوە، ئەو چارەسەرەی پێدرا، دۆخی تەندروستی زۆر باش بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی پەنسیلینەکە ئەوەندە نەبوو بەشی کۆرسێکی چارەسەر

---

91 Alexandar Fleming.

٩٢ دەفری پیتری بە ناوی داهێنەرەکەیەوە زانای بەکتریۆلۆجی ئەڵمانی، یۆلیۆس ریچارد پیترییەوە ناونراوە، دەفرێکی زۆر تەنکی شووشەیی ڕوونە، زانایانی زیندەزانی وەکو ناوەندێک بۆ چاندن وگەشەی خانە بەکتیری و کەڕوو و قەوزە وردەکان بەکاریان هێناوە. وەرگێر.

93 Howard  florey.

کـردن بکـات، ناچـار پەنسـیلینەکەیان لە میـزەکەی خـۆی دەپاڵاوتەوەو جارێکی تر لێیان دەدایەوە، ئەم دەستی دووە سوودی نەگەیاند و نەخۆشەکە کۆچی دوایی کرد.

لە کـاتی جەنـگەکەدا فلـۆری بە یـاوەریی یەکـێ لە هاوڕێکانی سـەردانی ئەمەریکـای کـرد، چـونکە لە پرۆسـەی دروستکردنی دەرمـانە ئامادەکراوەکانـدا، کێشـەکان کۆنترۆڵ دەکـرێن یـان کەمتـر ڕوودەدەن. فلـۆری بۆچـوونێکی کۆنەپەرسـتانەی هەبـوو لەمەڕ ڕاگەیانـدنی ئەنجـامی تـوێژینەوە زانسـتییەکان؛ هەروەهـا گرنگیـی بە سیسـتەمی داهێنانەکـان نەدەدا. بەڵام دروسـتکەری پێکهـاتە دەرمـانییە ئەمەریکییەکـان زۆر زیرەکـانە دەجـووڵانەوە، لە دووسـاڵی کۆتایی جەنگەکەدا بڕێکی زۆر لەو دەرمانەیان دروست کرد دەسـتکەوتێکی دارایـی گەورەیـان بەدەسـتهێنا. لەسـەرەتادا پەنسیلین تەنها بۆ بواری سـەربازی بەکاریان دەهێنا لەبەر پێویسـتیی جەنـگ (کـاریگەریی دەرمـانەکە دژی هەوکـردنە بەکتریاییەکـان بەزۆری بەکارهـات، وەکـو سـیفیلیس و سـوزەنەک[٩٤] جگە لە هەنـدێ حـاڵەتی پیسـکردنی برینەکـانی کـاتی جەنـگ و نەخۆشـی سـووتانەوەو ئاوسـانی سـییەکان pneumonia )، دوای جەنـگ لە ١٩٤٥، هەمەکییـانە بـۆ تەواوی خەڵکی سیڤیل بەکارهێنرا.

چیرۆکـی پەنسـیلین تەواو مـۆدێرنە، لەڕاسـتیدا شـێوازی دروسـتکردنی لە پرۆسـەی بەرهەم هێنـان و دابەش کردنیـدا لەسـەر بنەمـای قازانجێکی بەرزە. سـەلماندی کـاریگەرییەکی

---

٩٤سـوزەنەک gonorrhoea، نەخۆشـییەکە بەهـۆی میکـرۆبێکەوە بڵاودەبێتەوە، تووشـی ئەنـدامی زاوزێ دەبێت، لە ئەنجـامی جووتبـوونەوە دەگوازرێتەوە.وەرگێڕ

گەورەی هەیە دژی ژمـارەیەک لە کارەسـاتە بەربڵاوەکـانی ئەو کـاتە، دواتـر نـرخەکەی دابەزی، ژیـانی خەڵکێکـی زۆری ڕزگـار کـرد، شـکۆی تـاقیگە و پزیشـکیی نـوێی بەرەو گشتگیری برد. دەرمـانێکی مـوعجیزەیی بوو، تەنانەت ئەگەر موعجیزەکـان درێـژەش نەکێشـن. پەنسـلین بەبـێ جیـاوازی دەدرایە نەخۆش بەڵام بە دۆزی ناڕێک و بە گۆترە بـوو بۆ دۆخە نەگونجاوەکـان، و ئەو کۆرسـانەی تەواو نەدەکـران. ئینجـا ئەو بەکتریایانەی بەرگرییان بەرامبەر پەیدا کردبـوو، لەڕۆژەکـانی سـەرەتادا ئەمە وەکـو کێشـەیەکی بچـووک بەدەرکەوت، لە کاتێکـدا چەنـد جـۆرێکی تـری لە پەنسـلین لە سـەروەختی دروسـت کردنـدا بـوو، چەنـد دژە تەنێکـی تـر کەوتـنە بـازاڕەوە، لەوانە ستریپتۆمایسـین کە کـاریگەریی لەسەر نەخۆشیی سیل هەبوو، کە نەخۆشییەکی بەکتریایی درێژخـایەنی کوشـندەبوو. ستریپتۆمایسـین لە وڵاتە یەکگرتوەکـانی ئەمەریکـا دروسـت دەکـرا، دوای وەسـتانی جەنـگ بڕێـک لەو دەرمـانە گەیەنـرایە بەریتانیـا، ئۆسـتن برادفـۆرد هیـڵ (یەکسـەر بیـری چـووە سـەر نەخۆشـی شـێرپەنجەی سـییەکان) ویسـتی هەلـی کەمیـی دەرمانەکـان بقـۆزێتەوە، ئەزمـونێکی وردو پـتەوی داڕشـت ئەویـش لێکـۆڵینەوە بـوو بە ئەزمـوونی "دەبـڵ-کـوێری double blind"[٩٥] لەم ئەزمـونەدا نە پزیشـکەکان نە بەشـداربووان چۆنێتی ئەو چارەسەرەی دەخرێتە ژێر ئەزموونەوە نـازانن،

٩٥ لەم ئەزمـوونەدا کـوێرانە چارەسـەرەکە دابەش دەکرێـت، تەنـانەت توێژەرەکان خۆشیان نازانن بە کێ دەدرێت، لەسەرەتادا نازانن کامەیان لە گروپی کۆنترۆڵ کراوە کام نەخۆش لە گروپی ئەزمونگەریدایە. (وەرگێڕ)

بەمجۆرە ڕێگری کرا لەلایەنگیری بۆ ئەنجامی پێشبینی کراو. دەرەنجامەکە کاریگەریی چارەسەری دەرمانی ستریپتۆمایسینی سەلماند، بووە ئەو سامپڵە ئەزموونییەی کە هێڵ وەکو پێوەرێکی زێڕین بۆ هەڵسەنگاندنی چارەسەرە نوێیەکان دایڕشت.

دەسپێکی دژە تەنەکان لەڕێگەی ستریپتۆمایسین و پەنسلین و ئەوانی ترەوە، سەردەمێکی زێڕین بوو، دەرمان و ڤاکسینە کاریگەرە نوێیەکان وەکو دەرەنجامێکی حەتمی توێژینەوە دەرمانی و زیندە-پزیشکییەکان دەرکەوتن. دواتر کۆرتیزۆن لە کۆتایی ۱۹٤۰ دەرکەوت، لەگەڵیدا فیلمی ئەو نەخۆشانەیان دەگرت کە تووشی هەوکردنی ڕۆماتۆیدی جومگەکان بوون تەواو گلۆڵە بوو بوون دوای وەرگرتنی چارەسەرەکە لەفیلمەکەدا دەبینرا لە سەرجێگە هەستاوە و خۆی ڕێ دەکات، دەرمانی نوێی تر دەرکەوت بۆ چارەسەری ئەوجۆرە شێرپەنجانەی لەدەرەوەی نەشتەرگەری یان چارەسەر بەتیشک بەکاردەهات و زۆر بە پێشکەوتوو دادەنران. هەروەها بەکارهێنانی دەرمانی دژە خەڵەفان دابەزینێکی بەرچاوی لە نیشانەکانی شیزۆفرینیا و خەمۆکی بەهێز و ئەو نەخۆشییانەی مێشک کە نەخۆشەکان لە نەخۆشخانە دەروونییەکان بەدەستییەوە ئازار دەچێژن هەبوو. ئاسۆی قوربانییەکانی نەخۆشیی هەوکردنی مێشک، پەتایەک بوو دەگەڕایەوە بۆ ساڵی ۱۹۲۰، نەخۆشەکە چەند دەیەیەک لە کۆمادا دەمایەوە، ٔلەکۆتایی ۱۹٥۰ دا دوای ئەوەی چەند دۆزێک دۆپامینیان لێدان، دۆپامین دەرمانێکە بەم دواییانە بۆ چارەسەری نەخۆشیی پارکینسۆن خرایە بەرباس (کاردانەوەیەکی کورتخایەنی هەبوو بەڵام زۆر

کاریگەر بوو). لەسەرەتای سالّی ١٩٦٠ەوە، پزیشکی دەروونی کۆمەڵگەیی باوی هەبوو؛ نەخۆشە دەرونییەکان وەکو نەخۆشی دەرەکی لە نەخۆشخانەکاندا چارەسەر دەکران، پزیشکەکان ئامۆژگاری نەخۆشەکانیان دەکرد، ئەگەر بە ڕێکوپێکی دەرمانەکانیان وەربگرن بەشێوەیەکی سروشتی ژیان بەسەر دەبەن، لیبریۆم و ڤالیۆم لە دەرمانخانەکاندا بۆ ئەو کەسانەی خەمۆکییەکی کەم یان ڕاڕایی و دوودڵییان هەیە بەردەست بوو، کردەی پزیشکی وای لە خەڵک دەگەیاند هەموو دەردێک دەرمانی هەیە.

پێش سالّی ١٩٤٠ زۆربەی توێژینەوە پزیشکییەکان لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکادا پشتیان بە دامەزراوە تایبەت و کۆمەڵە خێرخوازییەکان دەبەست، بەتایبەتی ئەو کۆمەڵە خێرخوازییانەی تایبەت بوون بە نەخۆشییەکانی شێرپەنجە، سیل، وئیفلیجی منداڵ. تەنانەت تووشبوونی فرانکلین ڕۆزفیلّت خۆی بە نەخۆشیی ئیفلیجیی منداڵ[٩٦] کەوتە چوارچێوەی گرنگی پێدانی ڕاگەیاندنەکانەوە.

---

٩٦ Franklin D. Roosfelt ، دوای سالێک لە پالاوتنی بۆ پلەی جێگری سەرۆکی دیموکراتی، لە تەمەنی ٣٩ سالیدا بەشێوەیەکی هەمیشەیی تووشی ڤایرۆسی ئیفلیجی منداڵ دەبێت، لە ١٩٢٨ دوای پێنج سال لە گەیشتنی بە کۆشکی سپی، یارمەتی دامەزراندنی دامەزراوەیەکی نیشتمانی دەدات تاکو ببنە سەرچاوەی دارایی بۆ ئەزموونی ئەو ڤاکسینەی " جۆناس سالک" (١٩١٤-١٩٩٥) دۆزییەوە، لە ١٩٥٢ ئەم نەخۆشییە لە لووتکەدا بوو، ٥٨ هەزار حالەت تۆمارکرا، ٣ هەزار منداڵیش مردن، زیاتر لە ٢١ هەزار منداڵیش ئیفلیج بوون.لە ئەزموونی ئەم ڤاکسینەدا شێوازی "دەبل-کوێری" بەکارهێنرا، لە ئەزموونەکەدا ٢١ هەزار پزیشک و بەرپرسی تەندروستی گشتی بەشداربوون، ٦٤ هەزار فەرمانبەری قوتابخانە و ٢٢٠ خۆبەخش و ، بەشداریکردنی یەک ملیۆن و ٨٠٠ هەزار قوتابی. بۆ پشتگیریی کەمپینەکە ناودارانی وەکو ئەلفیس بریسلی، مارلین مۆنرۆ، ئامادەبوون، ڕۆزفێلت

کاتێ ئەم نەخۆشییە وەکو پەتایەک ناسێنرا، گەورەترین ژمـــارەی منـــدالآن لە نێـــوان ســـالآنی ١٩٥١ و ١٩٥٥ ئیفلیجبوون، کە ڕێژەی ناوەندیی گەیشتە ٤٠ هەزار کەیس. لەبەر ئەوەی نەخۆشییەکە ڤایرۆسـی بـوو دەرمـانی دژەتەن هیچ سوودێکی نەبوو، لە دەرەنجامی ئەو پەتایەدا ئەوانەی نەدەمـردن تووشـی کەمئەنـدامیی جەسـتەیی هەمیشـەیی دەبـــوون. هەرچەنـــد نەخۆشـــییەکە لە ئەمەریکـــا زیـــاتر بڵاوبـــووەوە، بەڵام بەتەواوی جیهانـــدا بڵاوبووبـــووەوە( لەڕۆژئـاوا ڕێـژەکەی زیـاتر بـوو لە و وڵاتـانەی زۆر هەژار بـوون)، ئەو پەتـایەی لە ١٩٥٢ لە کۆبهـاگن بڵاوبـووەوە زۆر کـاریگەر بـوو، نەک تەنهـا لەبەر بەهێـزییەکەی، بەڵکـو لە ڕووی سۆزی مرۆڤـایەتییەوە، ئەوانەی بە قورسـی تووشـی نەخۆشـییەکە دەبـوون، بـۆ ئەوەی بتـوانن هەناسـە بـدەن، بە نەشـــتەرگەری بـــۆڕی هەناســـەیان بـــۆ کـــوون دەکـــرد، و هەناسەی دەستکردیان بەفشـار بۆ دەکرد، ١٥٠٠ خۆبەخش ١٦٥ هەزار کـاتژمێر بە دەسـت ئـامێری پەمپیی هەوایـان بـۆ هەناسـەدانی قوربانییەکـان بەکاردەهێنـا. جیـاوازی لەنێـوان هەژار ودەوڵەمەنددا نەدەکرا، ئەم نەخۆشـییە پەیوەنـدییەکی تەواوی بە ئاسـتی پاکوخـاوێنییەوە هەبـوو، لەو وڵاتـانەی منـدالآن ئـاوی پاکژیـان نیـیە منـداڵەکان هەر لە قۆنـاغی شـــیرەخۆرییەوە تووشـــی ڤایرۆســـەکە دەبـــن؛ لەیەکەم بەرکەوتنی ڤایرۆسەکەدا منداڵان و مێرمنداڵان تووشی زیانە

---

خۆشـی لەڕێـگەی پەخشـی ڕادیـۆوە هـانی خەڵکـی دەدا بـۆ کووتـانی منـداڵەکانیان. لە ١٩٥٥ ڤاکسـینەکە سـەرکەوتنی بەدەسـتهێناو لە تەواوی جیهانـدا کەمپینـی کووتـانی بـۆ کـرا، لە ١٩٧٩ نەخۆشـییەکە لە ئەمەریکـا بنبڕبوو.

دەمـــارە-ماســــوولکەییەکان نـــابن، بەڵکـــو بەرەبەرە بە تێپەڕبوونی کات دەمارە ماسوولکەییەکان دەپووکێنەوە.

ئەو ڤایرۆســـەی دەبێـــتە هـــۆی ئیفلیجـــی منـــداڵ، دوای چاکبوونەوەی ئەو منداڵانە جارێکی تر ڤایرۆسەکە ڕوویان تێناکـاتەوەو تووشـــی نەخۆشـــییەکە نـابنەوە، لەبەرئەوەیە بیـــرۆکەی ڤاکســـینی ئیفلیجـــی منـــداڵ زۆر مـــاقووڵ و ســـتراتیجییە. دامەزراوەی "March of Dimes" دامەزراوەیەکـــی دەوڵەمەنـــدبوو، بەڵام بەپێـــی پێوەرێـــک داواکارییەکـانی بـۆ کـۆمەک کـردن هەڵدەســـەنگاند، بەهـیچ جۆرێک لەم سەردەمەدا پەسەند ناکرێت. چەند ڤاکسینێک لە ساڵی ١٩٤٠ ئامادەکرا، بەڵام تەنها ڤاکسینەکانی سالک و ســـابین بەشـــێوەیەکی بەرفـــرەوان لە ١٩٥٠ بە پراکتیکـــی جێبەجێ کران. جۆناس سالک[97] (١٩١٤-١٩٩٥) ڤاکسینی لە ڤایرۆســـی کـــوژراو گـــرتەوە، ســـەرەڕای هەنـــدێ هەڵەی مەترســـیدار، بەڵام ڤاکســـینێکی کـــاریگەر بـــوو، دوای ئەم ڤاکســـینە زۆر بەخێرایـــی ئەلفرێـــد ســـابین[98](١٩٠٦-١٩٩٣) ڤاکسینێکی لە ڤایرۆسی نیوەمردوو دروستکرد، ڤاکسینەکەی سابین لەڕێگەی دەمەوە دەخـرایە سـەر کڵـۆیەک شـەکر و زۆر بەئاســانی بەســەر منداڵانــدا دابەش دەکــرا، لای منــداڵ پەسـەندکراو بـوو. یەکێ لە تایبەتمەنـدییەکانی ئەم ڤایرۆسـە نیـوە مـردووە ئەوەبـوو لەگەڵ پیسـاییدا دەردەچـوو، بـۆیە وەکـو پارێزەرێکی سروشـتی بە سـووری (دەم- پیسـایی) ، (پیسـایی- دەم) ناسـرابوو، هەر بەو شـێوەیەی نەخۆشـییەکە دەگـــوێزرایەوە، ڤاکســـینەکەش دەگـــوێزرایەوە. چیرۆکـــی

---

97 Jonas Salk.

98 Alfred Sabin.

سەرکەوتنی ڤاکسینی ئیفلیجیی منداڵ بەهەمان ئەو شێوەیەی نەخۆشی ئاوڵە، چیرۆکێکی تازەیە، لە هەموو دونیادا بە نزیکی توانی قەڵاچۆی نەخۆشییەکە بکات. چیرۆکی ئیفلیجی چیرۆکێکە پڕە لە کەسایەتی بەهێز، هەرچەندە پڕبوو لە کاری دووڕوویی و ساختە، بەڵام ئەنجامەکان سەرکەوتوو بوون.

سەرکەوتنی ڤاکسینەکان هاندەربوون بۆ زیاتر گەشەدان بە توێژینەوە پزیشکییەکان، ئەمانیش بوونە بەردی بناغەی ئەو زانستە پیشەسازییەی ئێستا لەبەردەستە. گەورەترین ڕێکخراوی توێژینەوەی پزیشکی لە جیهاندا، پەیمانگای تەندروستی (NIH) ە، لە بیسێسدا- ماریلاند، کە لایەنێکی سوودبەخشە. لە ۱۹۵۰، حکومەتی ئەمەریکی ڕۆڵێکی سەرەکی بینی لە پێشخستنی توێژینەوە پزیشکییەکاندا، کە پشت بەستوو بوو بە تاقیگە پێشکەوتووەکان لەگەڵ کتێبە زانستییەکان لەلایەن نووسەرانی ناسراوەوە. هەرچەندە پارامیتەر یەکێ بوو لە پێوەرەکان، بەڵام لەچەند دەیەیەکی ڕابردوودا، توێژینەوە پزیشکییەکان بەشێوەیەکی بەرچاو زۆردەبوون. هەربەوجۆرە هەندێ چاکسازی لە چاودێریی تەندروستی، بەلای کەمەوە لە ڕۆژئاوا ئەنجامدرا. پزیشکەکان لەسەرەتای سەدەی بیست و یەکدا توانییان دەستنیشانی نەخۆشییەکان بکەن بەشێوەیەکی ئەکتیڤ تر ئیدارەی بدەن، زۆر باشتر لە حەفتاکانی سەدەی بیست، چونکە پێش نەوەیەک نەخۆشییەکانی وەکو ڕەبوو، شێرپەنجە، برینی گەدە، نەخۆشییەکانی دڵ و بۆڕییەکانی خوێن و چەند نەخۆشییەکی تر، مانای مردن و

دەستەوەستانیی دەگەیانـد بـۆ ئەوانەی تووشـی ئەو نەخۆشـییانە دەبـوون. ئەگەر تەماشـەیەکی پرۆفـایلی نەخۆشـەکان بکەیـن دەبینـین، نەخۆشـییە درێژخایەنەکـان بەشـێوەیەکی بەرچـاو لە زیادبوونـدان، تەرجەمەکردنـی تـوێژینەوە پزیشـکییەکان بـۆ پراکتیکـی پزیشـکی، ئەوە دەگەیەنێ ژمارەیەکی زۆری دەستکەوتە پزیشکییەکان کاری لەسـەر چـاودێری تەندروسـتی کـردووە نەک چارەسـەری پزیشـکی. بەڵێنـدان بە پێشخسـتنی تەندروسـتی لەڕێـگەی زنجیرە جینییە مرۆییەکان و توێژینەوە لە ڕیشـەی خانەکـان، تائێسـتا وەکـو پێویسـت سـەرکەوتوو نەبـووە. تـاکو ئاسـتی توانـا زانسـتییەکان بەرەو سـەرەوە بکشـێت، ئاسـتی چاوەڕوانییەکـانیش بەرز دەبـنەوە، زۆربەی نەخۆشـەکان ڕانەهاتوون ئارام بگرن ئەوەندە پەیمانی درۆیان پێدراوە.

## پزیشکی نوێ: حەقیقەتی دۆزینەوە نوێیەکان

لەسـەردەمی نوێـدا هەڵوێسـتە کـردن بەرامـبەر واقیعـی پزیشـکی ڕەنـگە لەڕێـگەی تێبینـی و سـەرنجدانەوە بەدەسـت بهێنرێت، کارەساتی دەرمـانی سـالیدۆمید خـاڵی گۆڕانکـارییە. ئەم دەرمـانە دژی ئێڵنجـدانی بەیـانی ئەو ژنـانەبوو کە لە سـەرەتای دووگیانیـدابوون، خێـرا خـرایە دەرمانخانەکـانەوە بێئەوەی هیچ تاقیکردنەوەیەکیان لەسەر ئەنجام دابێت، یەکێ لە بەرپرسـەکانی دەرمـان کە زۆر وریـاو چـاوتیژو بە وردی سەرنجی شتەکانی دەدا، ڕێگر بوو لەوەی ئەم دەرمـانە بێتە نـاو ئەمەریکـاوە، بەڵام هەزاران ژن لە کـۆی ٤٠ وڵات دەرمانەکەیان بەکارهێنا بوو پێشئەوەی بزانن پەیوەندییەکی

ڕاستەوخۆ لە نێوان ئەم دەرمانەو سەقەتبوونی دەستوقاچی کۆرپەکانیان لە کاتی لەدایکبوونیاندا هەیە. هەرچەندە ئەو ڕووداوە بووە هۆی قەدەغەکردنی دەرمانەکە لە ڕووی پێوەرە دەرمانییەکانەوە، بەڵام متمانەی خەڵک بە کەرتی دروستکردنی دەرمان تەواو لەقبوو. ئیتر دوای ئەوە هیچ دەرمانێک بەو ئاشکراییە زیانبەخش بێت نەکەوتە بازاڕەوە، تەنانەت ئەو دەرمانانەش کە کاریگەریی لاوەکییان هەبوو زۆر بەخێرایی لەبازاڕ کێشرانەوە. پیشەسازیی نوێی دەرمان هاوشێوەی زۆرێک لە کۆمپانیا فرە ڕەگەزەکان بوو، کۆمپانیا گەورەکان کۆمپانیا بچووکەکانیان قووتدەدا، ئەو بوودجەیەی بۆ ڕیکلامی دەرمان و فرۆشی زیاتر بەرکارێت چەند قاتی ئەو بوودجەیە بۆ توێژینەوەو گەشەکردنی بواری پزیشکی تەرخان کراوە. ئەو دەرمانانەی لە ئەمەریکا ئەگەر بە ڕەچەتەی پزیشکی نەبێت نافرۆشرێت، کەچی ڕیکلامی ڕاستەوخۆی بۆ دەکرێت وەکو تۆخمێکی نوێی بێزارکەر لە کەرتی پیشەسازیی دەرماندا، دەرمانە "تەواوکەرە خۆراکییەکان" گۆڕانکارییەکی بچووکی لەلایەن کۆمپانیاکانی دەرمانی تێدا دەکرێت و بەشێکی زیاد لەپێویست لەکاتی خۆی بۆ فرۆشتنی بەکاردێنێت. هەمیشە توێژینەوەکان لەڕۆژئاوا، چاودێری ئەو فەوزایە دەکەن کە قازانج لەخۆدەگرێت، لەجیاتی ئەوەی بەدوای نەخۆشییە گەورەکانی نێو وڵاتە هەژارەکاندا بگەڕێن، کە پێویستی زۆریان پێیە و دەرفەتی قازانجی زۆری تێدا کەمە. نەخۆشە درێژخایەنەکان کە نەخۆش ناچارە بەدرێژایی ژیانی چارەسەر بخوات، ئامانجی سەرەکیی هەر دەرمانێکی نوێیە.



Inspection



Palpation



Auscultation



Contemplation

وێنەی (٢٨) پزیشکی دڵسۆز لە سەر جێگای نەخۆش: سێر ویلیام ئۆسلەر، یەکێک لەپزیشکە زۆر بەڕێزەکان لەهەموو سەردەمەکاندا، ئەرکی خۆی بەجێدێنێ لە دۆزینەوەی نەخۆشی و تێرامان و بیرکردنەوەدا سەبارەت بە پیشەکەی. ئەوە پراکتیکی کاری پزیشکییە بە بەڵگە نوێیەکەی.

ئایـدز HIV (ڤایرۆسـی لەدەسـتدانی بەرگریـی لەش) وانەیەکی پراکتیکییە بۆ دانانی چاودێری نوێی تەندروستی، کەخۆی لەو بـازاڕەدا دەبینێـتەوە کە هانـدەرییەتی، لە کـاتی سـەرهەڵدانی ڤایرۆسـەکە لەوێنەیەکـی نـوێی درنـدەدا لە هەشتاکانی سەدەی بیست، لە نێوان پیاوانی هاوڕەگەزباز و بەکـارهێنەرانی مادەهۆشـبەرەکان لەڕێـگەی دەرزیـیەوە، لەولاتە یەکگرتووەکـانی ئەمەریکـا، بـووە هێمـای هێـزی چاودێری تەندروستی هـاوچەرخ و کێشەکانی. لەبەرئەوەی یەکەم دەرکەوتنی لە ولاتێکی دەوڵەمەندەوە بوو، توێژینەوە پزیشـکییەکان بەخێرایـی خـرانەگەڕ، هەنـدێ لە پیـاوانی گەورەی ئـایینی سـووربوون لەسـەر ئەوەی ئەو نەخۆشـییە سـزایەکی خـواییە لەسـەر هاوڕەگەزبـازی وکـارە ناشـیرینە هاوشـێوەکانی، زۆری ویسـت تـاکو ڕۆناڵـد ڕیگـان کێشـەکە بەتەواوی ئاشکرا بکات، تەنانەت کەنیسە ڕەتیکردەوە بڕیار لەسـەر بەکارهێنـانی کوانـدەم بـدات وەکـو وەسـیلەیەک بـۆ بڵاونەبـوونەوەی ئەو نەخۆشـییە کە بە پەیوەنـدی سێکسـی بڵاودەبێـتەوە، تائێسـتاش ئایـدز بەپەڵەی نەنگی دادەنرێ بە ناوچەوانی مرۆڤایەتییەوە.

ئەوانەی تووشی ئەم نەخۆشییە بوون لە ڕۆژئـاوا ڕەخنە لە لایەنە فەرمییەکـان دەگـرن، کە وەکـو پێویسـت بە تەنگـی نەخۆشـییەکەوە نـین. بەڵام ئەگەر بەراوردی بکەیـن لەگەڵ ئەو کەمتەرخەمییەی ڕۆژئاوا بەرامبەر ئەو نەخۆشییانەی لە ولاتە هەژارەکاندا بڵاون (بەڵام هەڕەشـە نیین بۆسـەر ولاتە دەوڵەمەنـدەکان)، دەبینـین لە بەراوردی ئەم دوو کەیسـەدا زۆر زوو توانییـان ڤایرۆسـی ئایـدز دەستنیشـان بـکەن و

مەترسی لەسەر نەخۆشەکانی خۆیان کەم بکەنەوە، بەڵام نەخۆشییەکی وەکو سارکۆما کۆزی (کەجۆرە شێرپەنجەیەکی دەگمەنە) و لەوڵاتە هەژارەکاندا دەرکەوت، لە نێوان یەکەم کەیس و دۆزینەوەی هۆکاری نەخۆشییەکە لە ١٩٨٤ چارەکە سەدەیەکی خایاند. سەرەڕای ئەوەش نیشانەیەک لە نیشانەکانی ئەو سەردەمە ئەوەبوو دوو گرووپ دەستنیشان کران یەکیان لە ئەمەریکا و ئەویتریان لە فەرەنسا، لەیەک کاتدا، سەبارەت بەو ڤایرۆسە بەزێنەرەی کە بەرپرسە لەنەخۆشییەکە، هەریەکەیان بەجیا دەستکەوتیان هەبوو، کێبەرکێیەکی بەردەوام لەو سەردەمەدا هەبوو لەسەر ئەوەی کامیان لە بواری زانستدا خەلاتی گەورە وەردەگرێت.لەسەرەتادا نەخۆشییەکە بە نەخۆشیی سێ H ە ئینگلیزییەکە ناسرا واتە، هاوڕەگەزبازی homosexual ، ئالوودەی هێرۆیین heroin-useres و دانیشتوانی هایتی Haitians . هەژارانی هایتییان لەچوارچێوەی ئەو کەسانە تۆمارکرد کە دووچاری نەخۆشییەکە بوون، بەخێرایی هەژارانی ئەفەریقیشیان دایە پاڵیان، دیارترین مەسەلە و مەترسیدارترین دەرەنجامی کۆمەڵایەتی و ئابوریی ئایدز لە ئەفەریقا و وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان بوو، بەڵام لە ڕۆژئاوا نەخۆشییەکە لە نەخۆشییەکی کتوپڕ و مەترسیدارەوە بوو بە نەخۆشییەکی درێژخایەن، هەرچەندە ڕێژەی مردنی ترسناکە بەڵام چارەسەرەکان بە دژە ڤایرۆس لە ١٩٩٠ەوە بەردەوامەو کار لەسەر هێواش کردنەوەی خێرایی نەخۆشییەکە دەکات، هەرچەندە هێشتا نرخی گرانەو کاریگەریی لاوەکیشی هەیە.

کوالیتی چاودێری پەرستارانی نەخۆشییەکەو چارەسەری تووشبووەکان لە کەمکردنەوەی کاریگەریی نەخۆشییەکە، دوو فاکتەری گرنگن لەبەرزکردنەوەی کوالیتی ژیان و کەمکردنەوەی ڕێژەی نەخۆشییەکەو ڕێژەی مردن. بەڵام هاوشێوەی زۆربەی نەخۆشییە زیندە تەنەکانی تر ، کێشەی بەرگری کردن لەدەرمانەکان هاتە سەرەوە، باسکردنی مرۆڤ بەوەی تووشی ئایدز بوویێت بووە باسێکی مەترسیدار.لە هەندێ ناوچەی ئەفەریقا، ئایدز بەوە ناسراوە نەخۆشییەکە لەنێوان هەردوو ڕەگەزەکە لەڕێگەی سێکسەوە بڵاودەبێتەوە، ڕێژەی تووشبوونی تاکەکان بە ئایدز، هاوشانی هەندێ نیشانەی تری نەخۆشی کە زاڵە چارەسەری زۆر گرانە، ژێرخانی چاودێری تەندروستی لە کیشوەرەکە زۆر هەژارە. لە پاڵ نەخۆشی مەلاریاو سیل، ئایدز لە گۆڕەپانی تەندروستیی نێو دەوڵەتیدا لەچەند دەیەی ڕابردوودا، لە پێشی پێشەوە بووە. ئەم سێ نەخۆشییە لە وەچەی بەرگری کردنە لەچارەسەرە کیمیاییە ئاساییەکان، بۆیە کاریگەرییەکەی لەڕێژەی نەخۆشی و ڕێژەی مردن لە نێو گەنجاندا لە ئەفەریقا زۆر بەرزە. نەخۆشییەکە لە نێو هەژاران و دەوڵەمەنداندا زۆر جیاوازە، هەرچەندە دامەزراوەی گەیتس و ئاژانسە نێودەوڵەتییەکان هاریکاریی گەورە دەکەن لەو وڵاتانەدا.

ئایدز وەکو نەخۆشییەکی کۆمەڵایەتی چاوی لێدەکرێت، نەخۆشەکانی بەردەوام چاویان لەدەستی زانستی پزیشکییە چارەسەرێکیان بۆ بدۆزێتەوە. زانست و پراکتیکی پزیشکی کە لەسەری بنیادنراوە، لەگرنگترین ئەو دەستکەوتانەیە کە

ڕۆشنگەریی ڕۆژئاوایی بەدەستی هێناوە. ئێمە پێویستمان بەو زانست و پراکتیکییە پزیشکییەیە، بەڵام زانستی پزیشکی ناتوانێت کێشەکانی مرۆڤ بە تەنیا چارەسەر بکات؛ ئێمە ناتوانین لە جیهانێکدا بژیین، کە هەردەم چاوەڕوان بین لەوە زیاتر باوەڕمان بە پێشکەوتن هەبێ.

## سەرچاوەکان

**Chapter 1**

The quotations from the Hippocratic works 'On the Sacred Disease and 'Aphorisms' are taken from Francis Adams (ed.), *The Genuine Works of Hippocrates, 2 vols* (London: The Sydenham Society, 1849). Shakespeare's question about the seat of fancy comes from *The Merchant of Venice*, Act 3.

**Chapter 2**

Sydenham's famous comment about the constancy of symptoms in different persons suffering from the same disease was made in his *Medical Observations*. I have used R. G. Latham (ed.), *The Works of Thomas Sydenham*, 2 vols (London: The Sydenham Society, 1848).

**Chapter 3**

Antoine Foureroy's summary of the basis of Parisian medical education is quoted in Erwin Ackerknecht, *Medicine at the Paris Hospital, 1794-1848* (Baltimore: Johns Hopkins University Press, 1967); Bichat's ringing injunction also is quoted in Aekerknecht's monograph. The phrase gateways to death' as a description of bad hospitals originated with the physician and man of letters John Aikin (1747-1822), now better known as a writer than a physician, Francis 157

Racon's phrase 'Footsteps of diseases' comes from his *Advancement of Learning, originally published in 1605.*

**Chapter 4**

Edward VII's stirring directive, said of tuberculosis, is quoted in Thomas Dormandy, *The White Death: A History of Tuberculosis* (London: Hambledon Press, 1999), with the note that Edward was cribbing from William Withering, the physician who introduced digitalis into clinical medicine in 1785. Mr Gradgrind's insistence on 'Facts' is a recurring trope in Charles Dickens's *Hard Times*, first published in 1854.

**Chapter 5**

Robert Hooke used the word 'cell' in his Micrographia (1665). Löffler's summary of the steps we know as Koch's Postulates' is quoted in Thomas D. Brock, *Robert Koch: A Life in Medicine and Bacteriology* (Madison, Wisconsin: Science Tech Publishers, 1988).

**Chapter 6**

William Wordsworth's memorable phrase first appeared in his poem 'The Tables Turned, published in 1798. Ivan Illich elaborated his notion of 'iatrogenesis' in several works, most centrally in *Medical Nemesis: The Expropriation of Health* (London: Calder and Boyars, 1975). C. P. Snow's lecture on what he called *The Two Cultures* was published by Cambridge University Press in 1959.

ئەمە کتێبێکی بچووکە سەبارەت بە بابەتێکی زۆر گەورە، نووسەر هەوڵیداوە لەو سەردەمەوە دەست پێبکات کە گریکەکان بناغەی نەریتە پزیشکییە ڕۆژئاواییەکانیان دامەزراندووە. بۆ تێگەیشتن لە مێژووی پزیشکی کتێبەکەی بەسەر پێنج بەشدا دابەش کردووە، لەوانە پزیشکیی سەر جێگا، پزیشکیی کتێبخانە، پزیشکیی نەخۆشخانە، پزیشکیی کۆمەڵگە و پزیشکیی تاقیگە لەگەڵ بەشێکی تایبەت بە پزیشکیی سەردەم کە دوا بەشی کتێبەکەیە، زۆر بە تێرو تەسەلی لەسەر هەریەکەیان بەجیا دوواوە. لێرەدا کاری پزیشکی و ئامانجی پزیشکی، بەنووسراو و گێڕانەوەی قۆناغە جیاجیاکان تۆمارکراوە، لەهەمووی گرنگتر، کاری پزیشکی لە ڕێگەی ئەزموون و زانیاری کەڵەکە بووەوە تا بە ئەمڕۆ دەگات گەشەی کردووە. پزیشکی کلینیکی لەسەر جێگا، لە هیپۆکرات (٤٦٠- ٣٧٠ پ.ز)ەوە دەستی پێکردووە تائێستاش شوێنەواری لە چاودێری پزیشکیی سەردەمدا ماوەتەوە.

کتێبخانەی پزیشکی لە سەدەکانی ناوەڕاستەوە تائێستاش پەیوەندیی پتەوی بە تەقینەوەی ئەو زانیارییانەوە هەیە، کە جیهانی پزیشکیی سەردەمی ئێمەی پێ دەناسرێتەوە. لەسەدەی نۆزدەیەمدا پزیشکیی نەخۆشخانەکان بەجۆرێک لە جۆرەکان لەسەر جێگای نەخۆش خۆی نمایش کردووە، ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی نەخۆشی کردووە و لە ڕێگەی دۆزینەوەی نەخۆشی و چارەسەری نوێ وشارەزایی پزیشکییەوە گەشەی کردووە؛ بەڵام ژێرخانی پزیشکی لە کۆمەڵگەدا، ژینگەی ئاوی سازگار، چارەسەری خاشاک، کوتان بە ڤاکسینەکان و سەلامەتی پیشەیی بووە، سیستەمی خۆراک و پەیوەندی نەریت بە فاکتەرە ژینگەییەکانەوە ڕۆڵی گەورەی تێدا بینیوە. پزیشکیی تاقیگەش ڕەنگە بەرچڤەی زمانحاڵی وێنەی ئەو دەرمانانە بێت کە ئێمە بەکاریان دێنین.




**دەزگای ڕۆشنبیریی جەمال عیرفان**
**لەسەر ئەرکی (د. تەها ڕەسووڵ) چاپکراوە**

**2022**